عەرەب شامیلۆڤ
"عەرەب شەمۆ"

# دمدم

شوکور مستەفا
کردوویە بە کرمانجیی خواروو

عەرەب شامیلۆڤ

"عەرەب شەمۆ"

# قەڵای دمدم

داستان

شوکور مستەفا

کردوویە بەکرمانجیی خواروو

ناوی کتێب: قەڵای دمدم – ڕۆمان
نووسینی: عەرەب شامیلۆڤ
گۆڕینی بۆ کرمانجیی خواروو: شوکور مستەفا
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٩٥٩
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مەریەم موتەقییان
چاپی دووەم، هەولێر – ٢٠١٠
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ١٧٤ی ساڵی ٢٠١٠ی دراوەتێ

## پێڕست

# پێشەکی

بەدرێژایی مێژووی نەتەوەی کورد، هەر کارەساتێکی گرنگی سیاسی و مێژوویی، هەر ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی بەرچاو، هەر چیرۆکێکی تاڵ و شیرینی دڵداری و هەر شایی و شینێکی گەورە لە هەر مەڵبەندێکی کوردستان قەوماوە، خۆێژ و خۆشخوانە کوردە نەناسراو و نەخوێندەوارەکان لەسەر کێشی برگەی خۆمانە بەزمانێکی ساکار، بەڵام پوخت و پاراو و ڕەسەن و ڕەوان هۆندوویانەتەوە و ئاهەنگێکی تایبەتی خۆشیان بۆ داناوە و پێیان گوتووە بەیت[1].

شایەر و بەیتبێژەکان ئەو بەیتانەیان لە کۆڕی دیوەخانی مەزنان، لە لامێردانی گەورەپیاوان و لە گۆشەی مزگەوتی گوندان و لە چایخانە و کاروانسەرای شاران بۆ خەڵکی تینوو و تامەزرۆ گوتووە. بەم جۆرە هەم نەیانهێشتووە ڕووداو و کارەساتەکان لەبیر بچنەوە و هەم زمان و فەرهەنگ و ئەدەبی فۆلکۆری کوردییان ڕۆژ بەڕۆژ دەوڵەمەند و دەوڵەمەندتر کردووە.

ئەم بەیتانە سینگ بەسینگ و پشت بەپشت پارێزراون. دیارە بەپێی جێ و کات و وەستایی و ناوەستاییی شایەر کەم و زۆر گۆڕانیان بەسەردا هاتووە. زیاد و کەم کراون، وشەی تازە و نوێ و باویان هاتووەتە نێو و وشەی کۆن و سواویان لێ دەراوێژراوە. بەڵام ناوەڕۆکی مەبەست هەروەک خۆی ماوەتەوە.

لە سەردەمی ئێمەدا کە جیهان ئاڵوگۆڕێکی سەیر و بەپەلەی بەسەردا هاتووە، زانست ڕۆژ بەڕۆژ پتر بەسەر تەبیعەتدا زاڵ بووە، ئینسان شەپۆلی

---

١ بەبڕوای من ئەم وشەیە هیچ پێوەندیی بە(بیت)ی عەرەبییەوە نییە و ڕای مامۆستا فەتاحی قازی بەڕاست دەزانم کە دەڵێ: ڕەنگ بێ لە وشەی بەیاتەوە هاتبێ کە ناوی ئاوازێکە.

هەوای خستووەتە ژێر ڕکێفی خۆی و ئاتۆمی قەڵشاندووە و لەسەر مانگ دابەزیوە. هەرچەند وەزعی نالەباری کوردستان گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە و نەتەوەی کورد هەروا لە کاروانی شارستانەتی بەجێ ماوە و تەمومژی نەزانی و نەخوێندەواری لە ئاسمانی وڵاتەکەمان نەڕەویوە، بەڵام ئەگەر نووری کارەبا کوردەواری ڕووناک نەکردووەتەوە، ڕادیۆ و گرام و ڕیکۆردەر گەیشتوونە کوێرە دێیەکانی کوردستانیش و دەتوانین بڵێین تیشکی زانستی دەرەوە ناڕاستەوخۆ کوردستانیشی گرتووەتەوە. بەرنامەی ڕادیۆکان و ئیستیوانەی گرام و شریتی ڕیکۆردەرەکان خەڵکیان لە بەیت و باوی شایەرە هونەرمەندەکان بێ نیاز کردووە.

بۆیە مەترسیی ئەوە زۆرە شاکارە بەنرخەکانی ئەدەبی فۆلکلۆریمان وردە وردە لە بیر بچنەوە و لە بیرچوونەوەشیان زیانێکی زۆر گەورە لە زمان و فەرهەنگ و مێژووی نەتەوەکەمان دەدا. هەرچەندە زانایان و ڕووناکبیرانی کورد لە هەموو لاوە هەستیان بەو مەترسییە کردووە و هەرکەس بەپێی هێز و توانا و کات و دەرفەتی خۆی خەریکی کۆکردنەوەیانن، بەڵام بەداخەوە دەرۆست نایەن و پێشگرییان بۆ ناکرێ.

یەکێک لە کارەساتە هەرە گەورە و خوێناوییەکانی مێژووی نوێی کوردستان کە پاش دابەشکرانی ئەو وڵاتە لە نێوان عوسمانی و قزڵباشدا ڕووی داوە، گەمارۆدران و گیرانی قەڵای دمدم و شەهیدبوونی ئەمیرخانی برادۆست، خانی لەپ زێڕین و هاوپەیمانان و دۆستانی ئەو سەردارە مەزنەی کوردە.

ئەو کارەساتە ئەوەندە خوێناوی و بەسام بووە، شا عەباسی سەفەوی، شای خوێنرێژ و پیاوکوژی ئێران ئەوەندەی ڕق لە نەتەوەی کورد بووە، ئەوەندە زاڵمانە و زۆردارانە لەگەڵ ئەو نەتەوە بێ دەرەتانە جووڵاوەتەوە، ئەوەندەی خراپە کردووە، ئەوەندەی خەڵک کوشتووە و وڵات خاپوور کردووە و ژن و منداڵ بەدیل بردووە، ئەمیرخانیش وا پیاوانە ڕاپەڕیوە و ئازایانە وەدەست هاتووە و سەری بۆ شۆڕ نەکردووەتەوە و بەرگریی کردووە و ئەوەندە مەردانە شەهید کراوە، کە ڕابردنی زەمان نەیتوانیوە تۆزی فەرامۆشی لەسەر

ئەم کارەساتە دابێژێ و لە پێش چاوانی ون بکا.

شایەر و خۆشخوانەکان ئەو کارەساتەیان بەشێوەی جۆر بەجۆر کردووەتە بەیت. لک و پۆپیان لێ کردووەتەوە و شاخ و باڵیان لێ ناوە.

لە هەموویاندا دوو شت لە پێش چاو گیراوە: ئازایەتی و خۆڕاگریی ئەمیرخان و دڵڕەقی و بێ بەزەییی شا عەباس. لە نێو ئەو بەیتانەی من لەو بارەدا بیستوومن، هیچیان ناگەنە ئەو بەیتەی کە زانای گەورەی ئەڵمانی ئۆسکارمان لە سەرەتای ئەم چەرخەدا لە ڕەحمان بەکری بیستووە و لە ١٩٠٥دا چاپی کردووە و ئێستا لە دەستدایە. لە هەموو بەیتێکدا خەیاڵاتی شاعیرانە بەسەر واقیعیاتی مێژووییدا زاڵ دەبێ.

لەو بەیتەشدا ئەوە دەبیندرێ، بەڵام وا دیارە ئەو بەیتە زۆر لە پاش قەومانی کارەساتەکە نەگوترابێ. چونکە ناوی هێندێک کەس لە کاربەدەستانی قزڵباش و لە دۆستانی ئەمیرخان لەو بەیتەدا وەک خۆیان ماونەوە.

مێژوونووسەکان خۆمانە و بێگانەش لەسەر ئەو کارەساتەیان نووسیوە. سەرچاوەی هەموویان (عالەم ئارای عەبباسی) کتێبە بەنرخەکەی ئەسکەندەر بەگی تورکمانە. ئەسکەندەر بەگ هەرچەند نۆکەر و نمەک خوردەی شا عەباس و دوژمن و نەتەوەی ئەمیرخان بووە و داوای ڕەوای ئەو سەردارە مەزنەی کوردی بەلاساری و سەرپێچی و تەنانەت نمەک بەحەرامی و لە ڕێ دەرچوون داناوە و بەئاشکرایی جنێوی بەکوردان داوە و دەڵێ: «وەحشیترین تیرەی ئینسانن» و کوشتاری ئەو گەلەی بەغەزا زانیوە و گوتوویەتی «ئەرکی سەرشانی شای ئیسلام پەنایە ئاسەواریان لێ ببڕێ». بەڵام پیاو هەق بڵێ پیاوێکی زۆر خوێندەوار و زانا و مێژوونووسێکی یەکجار ورد و وریا بووە و ڕووداوەکانی مێژوویی سەردەمی شا عەبباسی زۆر بەسەرنجەوە تۆمار کردوون. جگە لەوە خۆی لە گەمارۆدانی قەڵای دمدمدا بەشدار بووە و ئاگای لە هەموو کەین و بەینێک بووە.

ڕاستە ئەویش وەک هەموو دەستوپێوەندی شایان ڕیاییباز و درۆزن بووە و زۆری تەشی لەبەر شا عەباسی ڕستووە و بە بەژن و باڵای ئەو شا بەدفەڕ و

خوێنڕێژەی هەڵگۆتووە و وای نیشان داوە کە تاوانی کوردان بووە دڵی ناسکی خاوەن شکۆیان شکاندووە و هەقی خۆیان بووە قەتلوعام بکرێن و بەو دەردە بچن، بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا کتێبەکەی زۆری زانیاریی تێدا هەیە و سەرچاوەیەکی بەکەڵکە بۆ ئەو کەسانەی بیانەوێ لەبارەی قەڵای دمدم و ساڵی موکری قڕانەکەدا شت بنووسن.

کارەساتی دمدم و موکریان کە یەکێک لە بەسامترین ڕووداوەکانی مێژووی کوردستانە، هەستی نەتەوایەتیی زانایانی کوردی جۆشاندووە.

خانیی نەمر شاعیری مەزنی کورد ئەو هەستە ئاگرینەی چل و چەند ساڵ پاش کارەساتەکە لە سەرەتای مەم و زیندا دەربڕیوە.

لەو ساڵانەی دواییدا نووسەری مەزن و زانای بەناوبانگی کورد عارەبی شامۆ چیرۆکێکی درێژی بەناوی قەڵای دمدم بەئوسلووبێکی نوێ و باوی ڕۆژ نووسیوە. نووسینی چیرۆکی مێژوویی لەمێژە لە ئەدەبیاتی گەلانی تردا جێی خۆی کردووەتەوە. بەڵام ئەوە یەکەم چیرۆکی درێژە کە من بەزمانی کوردی لەو بارەدا خوێندوومەتەوە.

بەداخەوە من نووسینەکەی ئەوم نەخوێندووەتەوە. چونکە سەرم لە خەتی ڕووسی دەرناچێ و کتێبەکەش بەخەتی ڕووسی چاپ کراوە.

بەڵام مامۆستا شکور مستەفا کە ئەم چیرۆکەی هێناوەتەوە سەر شێوەی کوردیی کرمانجی خواروو و خەتی پەسندکراوی کۆڕی زانیاری کورد، دەڵێ: «دەستم لە ناوەڕۆکی چیرۆکەکە نەداوە و هەر ڕواڵەتەکەم گۆڕیوە.»

مامۆستا عارەبی شامۆ بەخەیاڵ بەرزی هونەرمەندانەی خۆی چیرۆکێکی شیرین و پڕ کارەسات و هەست بزوێنی خوڵقاندووە و خزمەتێکی گەورەی بەئەدەبی نەتەوەکەی کردووە. سەرتاسەری ئەم چیرۆکە بەتامە پڕە لە هەستی پیرۆزی ئینسانی، نیشتمانپەروەری و گەل خۆشەویستی.

چیرۆکی قەڵای دمدم نموونەی ئەدەبێکی ڕیئالیستی ڕەخنەگرانەیە لە ئەدەبی کوردیدا کە ئەگەر بێ وێنە نەبێ کەم وێنەیە. لە لابەلای درێژەکانی ئەم چیرۆکەدا پەردە لەسەر واقیعی ژیانی کوردەواری هەڵدەداتەوە و ڕێوشوێنی

نەتەوایەتی نەتەوەیی کورد بەلایەنی باش و خراپدا نیشان دراوە و بۆ ئەو بێگانانەی کورد باش ناناسن زۆر بەکەڵکە.

پاڵەوانەکانی ئەم چیرۆکە هیچ کامیان بۆ کوردێک نەناسیاو نین. شەباب لاوێکی کوردی ئاسایی و ڕەزاسووکە کە هەموو ڕۆژێ لە ڕێباز و کووچە و کۆڵاناندا تووشی دەبین و قسەی لەگەڵ دەکەین. دلبەر کچە کوردێکی لەبار و نەشمیلانەیە کە لە هەموو گوند و شارۆکێکی کوردستاندا نموونەی زۆرە و هیچ وێ ناچێ خەیاڵی نووسەرێک خوڵقاندبێتی. زۆر هەمزە چاوەشمان دیون و دواندوون. زۆر وەستای ئەرمەنی و ئاسۆری ئامرازی پێویستیان بۆ دروست کردووین. زۆر ئەسکەندەری پیر چیرۆکی کۆنیان بۆ گێڕاوینەوە.

کەم لاوی کورد هەیە لە دڵداریدا شەبابێک نەبێ. کەم کیژی کورد هەیە بڕوای بە پڕوپووچ نەبووبێ و پەنای بۆ پڕ و پیرێژنان نەبردبێ و نوشتەی چەور و شیرین و دەم بەسی بەمەلا نەکردبێ و چل دانە و شەمۆلەی نەگربێتەوە. بنپشک و خوشکی بچووکی وەک نەنێمان زۆر دیون کە دیاری و ڕاسپاردەی کاکیان بۆ دەزگیرانەکەی بردووە.

بەڕاستی مامۆستا شارەزایی تەواوی لە واقیعی ژیانی نەتەوەکەی هەیە و زانیارییەکەی خۆی زانایانە و وەستایانەی لەلا بەلای دێرەکانی ئەم چیرۆکە شیرینەدا گێڕاوەتەوە.

هەوار و بانەمەڕ و ئاژەڵداری، هەرەوەز و دەستەوا و لەبەر شانە دانیشتن، خووری ڕستن، لێک کۆبوونەوەی کچان، تەون هەڵاوەسین و وێنەی مافوورەگرتنەوە، مازووچنین، ڕابواردن، داوەت و هەڵپەڕین، ژوان و دڵداری، جووت و گا و کشتوکاڵ و ئاشەوانی، نوێژ و تاعەت، سواری و تەقڵە و ڕمبازی، ڕاووشکار و نێچیرەوانی، نان بدەیی و میوانداری، ژن زۆر هێنان و کچ فرۆشی و شیربایی وەرگرتن، نیشتمانپەروەری و فیداکاری و گیانبازی، خەیانەت و بێگانەپەرستی و ڕووڕەشی، هەموویان بەزمانێکی شیرین و ساکار لە جێی خۆیاندا لەم چیرۆکەدا باس کراون و نرخی چیرۆکەکەیان زیاتر کردووە. مامۆستا نە لە نیشاندانی کردارە باشەکاندا زێدەڕەویی

کـردووه و له ڕاسـتی دوور بـووەتەوە، نه کـردەوه دزێو و ناشـیـرینەکـانی شاردوونەوه. مامۆستا له سەرتاسەری ئەو چیرۆکەدا تێ کۆشاوه ئاکاری پاک و کرداری چاک له نێو کۆمەڵی کوردەواریدا برەو پێ بدا. دەیەوێ لاوانی کورد ڕاست و پاک و نیشـتـیـمـانپـەروەر بن و دۆست و دوژمنی خـۆیان بناسن. دۆسـتـیـان خـۆش بوێ و کـۆمـەک و یارمـەتیی بدەن و باربووی لێ وەرگـرن و دوژمنیان ناخۆش بوێ و ڕقیان لێ بێ و لەسەریەوه نەچن و فریوی نەخۆن.

هەر بەوەنده ڕانەوەستاوه و ویستوویەتی ئۆسـووڵی شەڕی پارتیزانی فێری شۆڕشگێڕانی کورد بکا و تەنانـەت ئەوەندەی لەو بارەدا دڵسۆزی نیشان داوه که ناچار بووه جار جار له واقیع دووربێتـەوه. بۆ ئەوەی شـۆڕشگێڕانی کورد له شـەڕی شـەوێدا فێری خۆشـاردنەوه بکا، له شـەڕی شـەمزینانـدا ڕووداوێک دەخـولقـێنێ و هـەمـزه چاوەشی هـێـدی و هـێـمـن و دڵسـۆز کـه نموونەی فەرماندەیەکی هەره باش و لەسەرەخۆیـه وا تووڕە دەکا که ناچار بێ داگژێته سـەربازێک و لێی بدا، چونکه جگەرەی داگیرسـاندووه. بێگومـان مـامۆسـتـا لێرەدا هێند بەتەنگ فێرکردنەوه بووه زمان و مەکانی له بیرچووەتەوه. ڕاستە له زەمـانی شا عـەباسـدا پێی ئەورووپاییـیـەکان بۆ ئێران کراوەتەوه و تەنانەت ئەو پادشـایه برایانی «شـیـرلی»ی وەک ڕاوێژکـەری سـوپایی هێناونـه ئێران و باڵیـۆزی ناردووەته ئەورووپا، دوور نیـیـه تووتن کـه له ئـەمـەریکاوه هـاتووەته ئەورووپا گـەیبـێـتـه ئێـرانیش، بەڵام تۆ بڵـێی له کـوردسـتـاندا ئەو سـەردەمی قـەننەکـێش هەبووبن؟ گـریمان تووتنیش بـووبێ و قـەننەکـێش هـەبووبن، خـۆ ڕەنگ بێ مـامـۆسـتـاش وەک من له بیری بێ تا ئـەم دواییـیـانه کـورد بەبەرد و ئەستێ ئاگریان هەڵدەکرد و سەبیلـه و قەننەیان دەکێشا و جگەره هەر نەبوو. جگەرەکێشـان و ئاگر هەڵکردن بۆ پارتیزان مەترسی هەیه و مامـۆستای مەزن دەیەوێ ئەم ئەزموونه بەنرخەمان فێر بکا بۆیه تووشیی ئەو هەڵه بووه.

بەداخـەوه ئەم چیـرۆکـه بەنرخـه هێندێک هـەڵەی وای تێدا هەن که بەهیچ بارێک ناکرێ چاویان لێ بپۆشرێ.

چیرۆکی مێژوویی ئەسـڵێکی هەیه و هەمووی زادەی خـەیاڵی نووسەر نییه.

بەڵام نووسەر شاخ و باڵی لێ دەنێ و لک و پۆپی لێ دەکاتەوە. لە چیرۆکە سەرکەوتووەکاندا هەمیشە ناوی قارەمانە ناسراوەکانی و شوێنی گرنگی جغرافیایی دەپارێزن. ئەو کەسەی چیرۆکی مێژوویی دەنووسێ دەبێ شارەزایی تەواوی لە مێژوو و جغرافیادا هەبێ تا بەهەڵە نەچێ، بۆ بەڵگە ئیشارە بەچیرۆکی (شەڕ و ئاشتی) تۆڵستۆی دەکەین. بێگومان مامۆستا لە من باشتر ئەم چیرۆکە دەزانێ، چونکە بەزمانی ڕووسیی خوێندووەتەوە. ڕەنگ بێ چیرۆکی ئەوەندە قارەمان زۆر کەم بن. بەڵام چونکە تۆڵستۆی مەزن ئاگای لە مێژوو هەبووە و جغرافیای وڵاتەکەی باش زانیوە، ساڵی قەومانی شەڕ و ناوی قارەمانە دەرەجە یەکەکان و شوێنی شەڕگەکانی نەگۆڕیوە و پاراستوونی، خوێنەر قارەمانەکانی تریش بەقارەمانی خەیاڵی نازانێ و ڕووداوە بچووکەکانی نێو کارەساتەکە بەزادەی خەیاڵی نووسەر دانانێ.

جێی داخە مامۆستای خۆشەویستی ئێمە زۆر کەمی شارەزاییی لە مێژوو و جغرافیای کوردستان و ئێران هەبووە. سەرانسەری چیرۆکەکەی لەسەر خەیاڵی خۆی داڕشتووە، بۆیە هەڵەی زۆر زەق و بەرچاوی لە نووسینەکەیدا هەیە.

کەسێک بییەوێ لەسەر قەڵای دمدم بنووسێ ناچارە بزانێ پایتەختی شا عەباس ئیسفەهان بووە نەک تاران. شا عەباسێکی لە سەردەمی دەستەڵاتی ڕەش و زۆردارانەی خۆیدا زۆر شاری سووتاندن، زۆر قەڵای ڕووخاندن، زۆر وڵاتی خاپوورکردن. ئیسفەهانی وا ڕازاندەوە، وا ئاوەدان کردەوە، کە پێیان کوت (أصفهان نصف جهان). ئێستاش ئەو خانووبەرە و مزگەوت و باخانەی ئەو دروستی کردوون و بینای ناون جیهانگەڕان بۆ ئیسفەهان ڕادەکێشن.

مامۆستا پێش نووسینی چیرۆکەکەی مێژووی ئێرانی نەخوێندووەتەوە، تا بزانێ ئەو شا عەباسەی ئەو باسی دەکا چ دێوەزمەیەکی خوێنخۆر بووە؟ ئەگەر بەپەلە چاوێکی هەر بەعالەم ئارای عەباسیدا گێڕابا کە مێژوونووسی تایبەتی شاعەباس نووسیویەتی، دەیزانی ئەو زۆردارە پیاوکوژە نێرینەی لە مەڵبەندی موکریان، لە بەشێکی گەورەی نیشتمانەکەمان بڕیوە و مێیینە و

وردەی بەدیل بردووە.

پێم وایە ئەگەر مامۆستا دەیزانی ئەو شا عەباسە ئەوەندە زۆردار بووە کە نە تەنیا هەزاران کەسی کوشتووە و هەزاران وەجاخی کوژاندووەتەوە، بەڵکە خۆشی وەجاخ کوێر کردووە و لە سێ کوڕەکانی خۆی دووی چاوی دەرێناون و یەکی سەربڕیوە، تابلۆیەکی زۆر بەسامتر و ڕەشتر و ئینسانیتری لە شا عەباس دەکێشا.

مامۆستا نەک زۆر ئاگای لە مێژووی ئێران نەبووە، بەڵکە گوێی نەداوەتەوە مێژوو و جغرافیای وڵاتەکەی خۆشی. دەنا هیچ نەبێ دەبوو بزانێ سلێمانی زۆر پاش کارەساتی قەڵای دمدم دروست کراوە.

من بەش بەحاڵی خۆم ناوی عەشیرەتی بەرۆدارم نەبیستووە کە مامۆستا دەڵێ خانۆی لەپ زێڕین گەورەی وان بووە. بۆ ئەوەی بزانین ئەمیرخان کێ بووە و چۆن پێ گەییوە؟ ناچارین پەنا بەرین بۆ ئەو نووسراوەی دوژمن لەسەری نووسیوە. چونکە بۆ خۆمان سەرچاوەی کۆنترمان نین. خاوەنی عالەم ئارا دەنووسێ:

«پاش نەمانی شای بەهەشتی کە ڕۆمییەکان مرخیان لە ئازەربایجان خۆش کرد، عێل و عەشیرەتە کوردەکانی سەر بە ئەم دەوڵەتە بایان داوە و لەگەڵ ڕۆمییەکان کەوتن. شا محەمەد ناوێک لە میرزادەکانی برادۆست بەفەرمانی خوندکاری ڕۆم کرا بەمەزن و خاوەن دەستەڵاتی برادۆست.

ئەمیرخان سەری بۆ دانەنواند و ملی بۆ ڕانەکێشا، هەر دەمە لەگەڵ یەکێک لە ئەمیرە گەورەکانی کورد دەکەوت. ماوەیەک لە کن عومەربەگی حاکمی (سهران) ڕای بوارد. لە شەڕێکدا کە عومەربەگ لەگەڵ دوژمنەکانی کردی، ئەمیرخان دەستێکی لە ئانیشکەوە پەڕی، ناوبانگی بە ئەمیرخانی چۆلاق[٢] ڕۆیشت.

لەو ساڵەدا کە ئالای بەرزی پادشایی لە ئازەربایجان دەشەکاوە و شا بەو

---

٢ وشەیەکی تورکییە، یانی گۆج.

پێ و قەدەمە پیرۆزەوە بەرەو نەخچەوان و ئێرەوان دەیاژوا، ناوبراو هاتە بەر دەرکی بارەگای پادشایەتی و خۆی بە شاپەرست و خزمەتکار نیشان دا. خاوەن شکۆ ئاوڕی ڕەحمەتی لێ داوە، مەزنایەتی و دەسەڵاتداریی تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕی پێ بەخشی و نازناوی خانی دایە و سەری بەرزکردەوە.

مەڵبەندی ورمێ و شنۆی کە سەر بە ئازەربایجانە و لە سەردەمی شای بەهەشتیدا لە ژێر فەرمانی یەکێک لە گەورە گەورەکانی قزلْباشدا بوو پێ ئەسپارد. لەسەر فەرمانی شا، وەستا زێڕینگەرەکان دەستێکیان لە زێڕی سوور دروست کرد و بەگەواهیرات و مرواری بەنرخ ڕازاندەوە و لە باسکیان بەست. چونکە ئازا و مەرد بوو خاوەن شکۆ زۆری ڕوو دەدایە و گەلێکی چاکە لەگەڵ دەفەرموو، ئەویش دەستی خزمەتکاری لەسەر سینگ[3] دانا.

لە سایەی دڵسۆزی و چاوەدێریی خاوەن شکۆدا ڕۆژ بەڕۆژ بە پەیژەی مەزنایەتیدا چووە سەر و لە هەموو هاوشانانی خۆی تێ پەڕاند. چەند ناوچە و مەڵبەندی لە ئەمیرەکانی کوردی سەر بەڕۆم ئەستاندەوە و لە نێو ئەمیرەکانی کورددا بەپایەبەرزی و لەشکر زۆری ناوبانگی دەرکرد. زۆر لە خێڵەکان و لە ئەمیرزادەکان لە دەوری هالان و خزمەتی ئەویان ڕەچاو کرد. هێندە پێ نەچوو هەوا و فیز لەسەری دا و لەخۆ بایی بوو.

مێژوونووسێک کە ئەمیرخانی بەچاوی خۆی دیوە و سەرەڕای ئەو هەموو دوژمنایەتییە ئیعتیراف بەئازایەتی و مەردایەتیی دەکا و دەڵێ: «ئەمیرخان لە عەشیرەتی برادۆست بووە و لە شەڕدا دەستێکی پەڕیوە و شا عەباس دەستی زێڕی بۆ دروست کردووە». بەڵام مامۆستا بەعەشیرەتی بەرۆداری دەناسێنی و دەڵێ: «چونکە زۆری زێڕ بەخشیوە پێیان گوتووە خانۆی چەنگ زێڕین».

مامۆستا زۆر بەدرێژی و وردی باسی قەڵای دمدم دەکا، بەڵام بەو حاڵەوە بەپێویستم زانی ئەو کورتە باسەی ئەسکەندەر بەگ لەسەری نووسیوە لێرەدا بێنمەوە کە دەڵێ: «لە پێش ئیسلامدا لە زەمانی ساسانییەکان (اکاسرە)دا

---

٣ ئۆسکارمان، تحفەء مظفریە، بەغدا، ١٩٧٥، ل٢٥-٢٧.

هەر لەو شوێنەدا قەڵایەک هەبووە کە پێی گوتراوە دمدم و دەسدرێژیی ڕۆژگار خاپووری کردووە».

لە جێگەیەکی دیکە نەخشەی قەڵاکەمان ئاوا بۆ دەکێشێ:

«ئەو قەڵایە لەسەر دوندی کێوێکی یەکجار بەرز دروست کراوە کە یەکپارچە بەردێکی درێژووکە و تەسکە و وەک پشتی گای هەڵکەوتووە. لای شیمال و جنووبی دۆڵی زۆر قووڵن کە لە ژێرلا بۆ سەرێ دەبێ بەپەیژەی خەیاڵ بۆی بچی. لەبەر بەرزی پێویستی بە شووره نییە و شوورەیان بۆ نەکێشاوە. دوو لایەکەی دیکەی کە پانایی قەڵاکەن، لای ڕۆژهەڵاتی پاڵی وە پانتایی چیا داوە و شوورەیەکی زۆر تەواوی بۆ کێشراوە بورجی بڵندی هەن و دەرگایەکی هەیە. لای ڕۆژئاوای کە لە گۆڕایی نیزیکترە شوورەیەکی یەکجار قایمی هەیە و دەرگایەکی بەرەو جنووب دەکرێتەوە. لە دەروازە بۆ عەرزی ڕێگایەک بەنێو بەردیدا هەیە کە ئەوەندە تەنگە بەزەحمەت سوارێکی تێوە دەچێ. سەنگەر بردنەپێش لە لای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە نەبێ ناکرێ، لە لای ڕۆژهەڵات تیرهاوێژێکی بۆ دەرکی قەڵا بمێنێ، یەکپارچە بەردی سەخت و تەخت و ڕەقە. لە بنەوە بوودڕی بۆ لێ نادرێ. کە بەردەکە بڕاوە بورجێکی زۆر بەرز و قایمیان لێ دروست کردووە کە بۆ خۆی قەڵایچەیەکە. تا ئەو بورجە بەردەست نەکرێ سەنگەر بردنە بن قەڵا محاڵە. ئاوی قەڵا لە حەوزێکی گەورەڕا دابین دەکرێ کە بەباران پڕ دەبێ. بەڵام لە لای شیمال لە نێو گەلیدا نیزیکی قەڵا کانییەک هەیە. ئاوی زۆر کەمە، ئەمیرخان جۆگەی بۆ کێشاوە و ڕێی بۆ کردووەتەوە و دە حەوزەکەی کردووە. ئاوی ئەو کانییە لە ئێوارەوە تا بەرەبەیان حەوزەکەی پڕ دەکا. ئاوەکەی بەشی ڕۆژێکی قەڵانشینەکان دەکا. گومبەزێکیان لە ڕێکی عەرزی لەسەر حەوزەکە هەڵخستووە کە لە پێش چاوان ون بێ، پێی دەڵێن (سوولق). بۆ پاراستنی حەوزخانەکە بورجێکیان بەپاڵ قەڵاکەوە هەڵچنیوە. لە لای جنووبەوە سەهۆڵدانێکیان ساز کردووە کە لە زستاندا بەبەفر و سەهۆڵ داخندرێ. لە تەنیشت وی حەوزێک هەیە، تا ئەو بەفر و سەهۆڵەی لە گەرمای هاویندا دەتوێتەوە و دەبێتە ئاو بەفیڕۆ نەڕوا و

لەوێدا کۆبێتەوە و لە کاتی کەم ئاویدا بەکار بێ. ئەو سەهۆڵدانەش قەڵایچەیەکی لەسەر دروست کراوە و پاسەوان و تفەنگچیی لەسەر دانراوە. بەویش دەڵێن (بوزلق) یا (قارلق)، ڕێگای ویش وەک ڕێگای (سوولق) لە دەرەوەڕا ونە.

بەکورتی ئەم قەڵایە لە پێنج قەڵا پێک هاتووە. یەکیان ئەسڵی قەڵاکە، یەکیان قەڵای خوارێ، یەک (سوولق) و یەک (بوزلق) و ئەوی دیکەیان بورجی گەورەی دەرەوەی دەرگای ڕۆژهەڵات، کە لە پێشدا باسمان کرد. هەر پێنج ئەوەندە بەرز و قایمن کە پەیکی تیژڕەوی بیر و مێرووڵەی خەیاڵ ڕێیان تێ نابا و وێیان هەڵناگەڕێ».

پێم وایە ئەگەر مامۆستا هەر ئەوەندەی ئەسکەندەر بەگ وەک دوژمنێک لەسەر قەڵای دمدم نووسیویەتی دەخوێندەوە و جا واقیعیەتی مێژوویی بەو خەیاڵە بەرز و ناسکەی خۆی دەڕازاندەوە، چیرۆکە جوانەکەی دەگەیشتە ڕیزی شاکارەکانی بەرزی نووسەرە بەناوبانگەکانی جیهان.

لە عالەم ئارادا ناوی هەموو سەرکردەکانی قزڵباش و زۆر لە پاڵەوانانی کورد هاتوون. چەند خۆش بوو مامۆستا قارەمانی دەرەجە یەکی خەیاڵیی نەخوڵقاندبان و قارەمانە ئەسڵییەکانی ناو بردبان. جا کەیفی خۆی بوو بازرگانی عەرەبی ناو دەنا ئبن بەتووتە یا نا. چونکە دەتوانین تەئویلێک بۆ ئەوە بهێنینەوە کە ئەو بازرگانە بەناوی جیهانگەڕی بەناوبانگ کراوە و مەبەستی مامۆستا ئەو جیهانگەڕە نییە.

نامەوێ باسی وەی بکەم کە وا دیارە مامۆستا لە دواییی چیرۆکەکەیدا ماندوو بووە و پشووی وەک پێشوو درێژ و لەسەرەخۆ نییە و چارەنووسی بەشی زۆری پاڵەوانەکانی نادیارە. چونکە ئەو شێوەم لە زۆر لە داستانەکانی ڕووسی بە تایبەتی شارەکانی تۆلستۆی مەزندا دیوە و مامۆستاش کەم و زۆر لە ژێر تاوی ئەواندایە، بەڵام دەوێرم بڵێم باسی گەمارۆدانی قەڵای دمدم و قەڵاداری ئەمیرخان و خۆڕاگریی کوردان و بێ بەزەییی دوژمنی کورت بڕیوەتەوە. چونکە بەشی هەرە گرنگی کارەساتەکە کە سەرنجی خۆمانە و

بێگانەی ڕاکێشاوە و ناوی ئەمیرخانی لە مێژووی کوردستاندا بە نەمری هێشتووەتەوە ئەو بەشەیانە.

لە نێو کوردەواری باوە دەڵێن ژنی قەڵانشینەکان بە تایبەتی ژنەکانی ئەمیرخان لە قەڵاداریدا بەشدار بوون و لە بەیتەکەشدا ئیشارەی بۆ کراوە وەک دەڵێ:

کێ بوو لە خاتوون پەروەرێ،

گوتی: «کاک ئاڵی ئەتۆ ماوی ئەتۆش هەڵێ».

هەروەها مەشهوورە دەڵێن ژنەکانی ئەمیرخان و گەورە گەورەکانی پاش گیرانی قەڵا و کوژرانی پیاوەکان خۆیان لە چیا هەڵداشتووە تا نەبنە دیلی دەستی دوژمنی بێ شەرم. لە بەیتەکەدا گوتراوە:

کێ بوو؟ لە خاتوونی خانی؛

قبوڵ ناکەن کافرستانی؛

«خۆمان هەڵدەدێرین لە چل کەوانی»

مامۆستاش ویستوویەتی نەخشی ژنانی کورد لە خەباتی ڕزگاریخوازیدا بەرچاو نیشان بدا و جوانیشی نیشان داوە. ئەویش زۆر جوان باسی ئەوی کردووە کە ژنەکان خۆیان کوشتووە. بۆیە داخم ناچێ نەیزانیوە یەکێک لە ژنەکانی ئەمیرخان کە ئەسکەندەر بەگ نە تەنیا بێزی نایە ناوی ببا، بەڵکە قسەی سووکیشی پێ دەڵێ، شەش ساڵ پاش گیرانی قەڵا سەرلەنوێ قەڵا دەگرێتەوە. دڵنیام ئەگەر مامۆستا ئەوەی دەزانی چیرۆکەکەی دوو بەرگ دەبوو. چونکە ئازایەتی و فیداکاریی ئەو ژنە کوردە بەشەرەفە خۆی بەرگێک چیرۆک هەڵدەگرێ.

مامۆستا باسی عەشیرەتی شکاک دەکا کە ئێستا لە دەوروبەری قەڵای دمدم دەژین، بەڵام لەو سەردەمیدا هیچ ناویان نییە. کەچی باسی عەشیرەتی گەورە و بەناوبانگی جەلالی ناکا کە بەداخەوە لەو سەردەمیدا تەنیا عەشیرەتێکی کورد بوون یارمەتیی شا عەبباسیان داوە و بەشی زۆریان لە

نێو قزڵباشدا بوون و ژمارەیەکی کەمیان لە سەنگەری شەڕەفدا بەرگرییان کردووە.

مامۆستا بەئانقەست ویستوویەتی بڵێ شەڕی کوردان زیاتر بەتیر و شیر بووە. بەڵام لە ڕاستیدا ئەمیرخان تۆپ و تفەنگیشی بووە. لە باری چەک و قۆرخانەوە تەنگاو نەبووە، هەر بێ ئاوی و تینوایەتی شپرزەی کردووە. وای لێ کردووە لە قەڵا بێتە دەر و شەهید بکرێ.

لە پێشدا کوتم من لە خوێندنەوەی خەتی ڕووسیدا کۆڵم و چیرۆکەکەی مامۆستا عارەبی شامۆم نەخوێندووەتەوە. جا بۆیە ناتوانم لەسەر شێوەی نووسینی ئەو چ قسان بکەم. بەڵام ئەوەکەی مامۆستا شوکور مستەفام چەند جار خوێندووەتەوە و بەڕاستی چێژم لێ وەرگرتووە.

عەیبی کار لەوەیدایە ئێمە تا ئێستاش زمانێکی ستانداردمان نییە کە کەس نەتوانێ لێی لادا. هەر وا بەهاسانیش ناتوانین ئەم زمانە پێک بێنین و خۆمان لە پاشاگەردانی ڕزگار بکەین. ماوەیەکە هێندێک لە نووسەرە زاناکانمان بەکردەوە بۆ ئەو کارە بەنرخە تێ دەکۆشن.

دەوێرم بڵێم مامۆستا شوکور یەکێک لە ئاڵا هەڵگرانی ئەم خەباتە پیرۆزەیە و لە ڕیزی پێشەوەدایە. مامۆستا وەک پیاوێکی زانا و ڕاست دەستی لە تەعەسوبی ناوچەگەری هەڵگرتووە و لە نووسینەکانی خۆیدا هەوڵ دەدا لە هەموو شێوەیەکی زمانی کوردی کەڵک وەربگرێ و بەبڕوای من لەو کارە پڕ سوودەشدا سەرکەوتووە.

مامۆستا تێ دەکۆشێ کام وشە ڕەسەن و سووک و ڕەوانە کام کنایە لەسەر زاران خۆشە بەکاری بێنێ. لە بەکارهێنانی وشەی داتاشراوی ناڕەسەن و درێو و ناشیرین خۆ دەپارێزێ. زۆر شارەزای ڕێزمانی کوردییە و لە ژێر تەئسیری زمانی بێگانەدا نانووسێ.

مامۆستا خوێندەوار و ڕووناکبیرە، زۆر گەڕاوە و گەلێکی خوێندووەتەوە. زەحمەت و کوێرەوەریی کێشاوە و ئەزموونێکی تەواوی وەسەریەک ناوە. لە

سـایەی ئەو ئەزمـوونەدا گـەیوەتە ئەم قـەناعـەتە کـە هیچ شـێـوەیەکی زمـانی کـوردی بـا زۆریش دەوڵەمـــەند و پڕ وشـــە بێ بـەتەنێ نـاتوانێ ببێ بەزمـــانی ئەدەبیی نەتەوەکـەمان. جـا بۆیە ئەم ڕێبارەی گـرتووەتە پێش کە لە پێکهێنانی زمـانی سـتـانداردی کـوردیدا بەشداری بکا. سـەرەڕای ئـەوانە هـەرگـیـز وەک پیـاوێکی لە خـۆبایی لە نووسـینـەکانی خـۆی دڵنیـا نییـە و بەشـوورەییی نازانـێ ڕاوێژی بەدۆسـتـان و نیـزیکانی خـۆی بکا. ئەوەش ئاکـارێکی باشــە و پیـاو دەگـەیێنـێتـە ئامـانجی خـۆی. مـامـۆسـتـا شـوکـور لەمـێـژە بەنووسـەرێکی سـەرکـەوتوو ناسـراوە. بەڵام بە بڕوای من لە نـووسـینی ئەم چیـرۆکـەدا خـۆی گەیاندووەتە ترۆپکی هـەرە بەرزی ئەدەبی کوردی. لە پێشـدا کوتم ئەم چیـرۆکە لە چاو ناوەڕۆکــەوە لە ئەدەبی کـوردیدا ئەگــەر بێ وێنـە نەبێ کــەم وێنـەیە، ئێستاش لە خۆم ڕادەبینم بڵێم لە چاو ڕواڵەت و فۆرمیشەوە هەر وایە.

هێمن

١٩٧٥/٧/١٩



## پێشەکیی نووسەر

ئەو داستانە لە مێژووی ڕۆژانێک دەدوێ کە کوردستان لە حاڵێکی شڕ و بارێکی یەکجار ناهەموار و دژواردا بوو.

لە لایەکی پادشای ڕۆمی کە بە زۆری چەک ئەرمەنستان و سووریا و مۆزەپۆتامیا و میسر و بولغارستان و ئارناوتستانی داگیر کرد و پاشان بەو سوپا و چەک و جبەخانە گەورە و گرانەوە بەسەر کوردستانیدا دا و دەیویست خاکی کەونارای باو و باپیرانی کوردانیش وەکو خاکی ئەو نەتەوانە داگیر بکا و لە ژێر باندووری خۆی باوێ.

لە لایەکی دیکەوە شای ئێرانێ لەشکر و قۆشەنی لە شەڕی سەدان ساڵدا قاڵبووەوەی پەیتا پەیتا دەنارده سەر کوردستان داگیری بکا.

بەڵام نەتەوەی کورد بەوپەڕی مێرخاسی و گەڕناسییەوە بەرامبەر هەردووک دەوڵەتی گەورە و گرانی ئەو چەرخ و سەردەمە شەڕی دەکرد.

لە پاش گەلێک شەڕی گەورە و گران پادشای ڕۆم و شای ئێرانێ دیتیان بەجوێ جوێ هیچیان لەگەڵ ئەم خەڵکە قارەمانە پێ ناکرێ، ئەوەبوو کە لە ساڵی ١٦٣٩ز دا پەیمانێکیان بەست و کوردستانیان لە نێو خۆیاندا دابەش کرد، بەڵام ئەم سەرکوتکردن و بەشکردنەش بەکەڵکیان نەهات و هیچیان پێ نەکرا.

ئەم داستانە چیرۆکی شەڕی قەڵای دمدمی دەگێڕێتەوە و ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە کورد بەرامبەر بەداگیرکەرانی کوردستان چۆن شەڕیان دەکرد و خاکی باو و باپیرانیان چۆن دەپاراست، پێشەوای ئەم شەڕە، نە میر بوو، نە بەگ بوو، نە ئاغا بوو، کوردێک بوو نێوی خانۆ بوو، قەڵای دمدم ئەو بینای

نابوو. خەڵکی پێیان دەگوت خانۆی لەپ زێڕین. خەڵکی کوردستان گەلێک بەیت و باو و داستان و چیرۆک و بەسەرهات لە بارەی ئەو شەڕە گەورە و گرانە دەگێڕنەوە.

دەربارەی شەڕی قەڵای دمدم و مێرخاسیی کوردان گەلێک جیهانگەڕ و ڕۆژهەڵاتناسی ئەورووپایی شتیان نووسیوە.

ئێمە لەو داستانەدا تەنیا نەخشەی ئەم شەڕانە دەکێشین کە نەتەوەی کورد چەرخا و چەرخ بۆ ڕزگاریی وڵاتەکەی و نەتەوەکەی بەرپای کردووە و تا ئازاد نەبێ هەر شەڕ دەکا و ناوەستێ.

***



بەشی یەکەم

# بازاڕ

بەهار هەمیشە درەنگ دەگەیشتە ئێرە، بەڵام ئەمساڵ بەفر هەر لەسەر چیا گەردن کەشەکان سپی دەچووەوە. بەهارەکەی قەڵای دمدم تازە پێرۆکە بووبوو، بەفر، تەنیا ئەوانە مابوون کە زستانان با لە پەناو پەسێو و چاڵە قووڵەکانی دەکردن، ئەوانەش تا گەرمای هاوین دادەهات نەدەچوونەوە.

لەو ڕۆژانەدا خەڵکی قەڵا خەریکی شۆم و تۆکردنی بەهارە بوون، هەندێ هەر لە ئاخپێنەکانی دەوروبەری ماڵاندا دەغڵ و دانیان دەچاند. ئەو بەیانییە پەڵە هەورێک لە سەرووی چیاکانەوە پەیدابوو، ڕێژنە بارانێکی بەخوڕەم بەسەر قەڵای دمدمدا باری و تۆز و خۆڵی زەویی داپەستاوت و سەرلەنوێ خۆشی کرد و بووەوە بەساماڵ. هەتاوە خۆشەکەی بەهارێ پەنجەی لە عەرزی گیرکرد. ئەم بارانە بۆن و بەرامەی هەوای، پاک و خاوێن کردەوە. ئێمە لە کوردەواریدا بەم جۆرە بارانە دەڵێین: «گورگە زێ»...

ئاوی ڕووباری گەلی کە بەبن قەڵادا تێ دەپەڕی لەتاو ئەم گەرما بەتینەی بەهارێ شێلو دەبوو و پڕ بەگەلی کەفی دەکرد و لە سەرڕا تیژ دەهاتە خوارێ، هەر گاشەبەردێکی دەکەوتە پێشی ڕای دەماڵی و بەخوڕ بەرەوخواری دەبرد. ئیدی قەت نەتدەگوت ئەمە ئەو ئاوە خۆش و خاوێنەی هاوینە کە لە کانییە دوورەدەستەکانەوە هەڵدەقوڵێ و بەبن قەڵادا تێ دەپەڕێ و دەبێتە ڕووبارێکی گەورەی پڕ لە ماسیی ڕەنگاوڕەنگ و بەهاژە هاژ دەڕوا.

لەم ڕۆژانەدا دار و درەختەکانی کووچە و کۆڵانی قەڵا لەبەر هەتاوی گەرمی بەتینی بەهار فراژوو بووبوون و گەڵای سەوزیان لەبەر کردبوو، سێبەریان بۆ مرۆ خۆش دەکرد، دارقەیسی لە جێژنی گوڵاندا بوون. هەندێکیان بەریان گۆپکەی کردبوو. لە نیوەڕوانێ بەدواوە، ئاو هێندە هەڵدەستا دەگەیشتە ئاشەکەی گەلی. (عەڤدی)ی خاوەن ئاش هەموو ڕۆژێ بەرەبەیانی زوو لە خەو هەڵدەستا لەگەڵ مەحمموود مەڕەکانیی ئاشەوانی دەچوونە گەلی، شەو ترسیان نەبوو، سارد بوو، بەفر نەدەتوایەوە، بەڵام ڕۆژانە گاشەبەردی زلیان دەدا پاڵ ئاشی، نەوەک شەپۆلی ئاو بیڕووخێنێ. خەڵکی قەڵا زۆر بەتەنگی ئەم ئاشەوە بوون. هەقیشیان بوو؛ چونکە لەم ئاشە پتر هیچ ئاشێکی دیکەی نێزیک نەبوو. جگە لەمەش، لەوەتی مەحمموود مەڕەکانی بووبووە ئاشەوان بەرداشی چاکتر بیراز دەکرد و ئاردێکی ورد و باشتری بۆ خەڵک دەهاڕی، ڕۆژێکیان بەفەرمانی خانۆ گەلێ زەلام بەکۆمەکی عەڤدییەوە هاتن و ئاشەکەیان قایم و چەسپتر کرد.

بەو هەوا خۆشە، لەوان ڕۆژاندا هەر لە سبیانێوە تا ئێوارێ قەڵا پڕ بوو لە خەڵک، هاتوچۆکەران سەرگەرمی سەودا و مامەڵە بوون، دووکانداران بانگیان دەکرد: «وەرن برا وەرن، وەرن کاکە وەرن، ماڵی چاک و هەرزان بکڕن»...

بازاڕی قەڵا پڕ بوو لە خەڵک: لە دەشتەکی و کۆچەر، لە ئازربایجانی و لە خەڵکی وانێ، لە خەڵکی وڵاتی ئاسۆریان و لە خەڵکی زۆر ناوچەی دیکەش. هێندێک شمەکیان هێنابوو دەیانفرۆشت هێندێ هاتبوون شمەکیان دەکڕی و بۆ دەرێیان دەبرد. ئیدی بازاڕ جمەی دەهات. دیاربوو خەڵکی چیاکانی کوردستان لە سەرما و سۆڵەی زستانێ ڕزگاریان بووبوو، هەموو دڵخۆش و ئاسوودە بوون. کڕیاران دەستیان لە نێو دەستی دووکانداران دەنا و پاش هەندێ دەست ڕاتەکاندن نرخیان لە ماڵی فرۆتەنی دەنا، بەڵام دووکانداران لەو نرخەی گوتبوویان نەدەهاتنە خوارێ و پوولێکیان لێ دانەدەشکاند...

بازاڕی قەڵا قاوەخانەی خۆش خۆشی تێدا بوون. لەو ڕۆژە خۆشانەدا تەختیان لە ژێر سێبەری دار و درەختان دادەنا و قاوەیان بۆ خەڵک دەگێڕا،

ڕدێن سپی و پیرەمێردان دەهاتنە قاوەخانەکان و بەدەم قاوە فڕکردنەوە سەربهوردی ڕۆژگارانی ڕابردوویان دەگێڕاوە. پیرەمێردێکیان تێدابوو، کەمێ پشت کۆم، کوێرە برینێکی بەسەر برۆی چەپەوە بوو. هەر کە دەهاتە دوو، جار جار چاوی دەقوچاندن و هەڵی دێنان، کوێرە برینەکەی سەر برۆشی دادەخرا و دەکراوە. نیوەی گوێی چەپیشی نەمابوو! برینەکە نیشانەی ئەوە بوو کە ئەم پیرە کۆنەساڵە بەرانبەر بەداگیرکەرانی خاکی کوردان زۆری ڕۆژگاری چەتوون و نالەبار دیون، ناوی ئەسکەندەر بوو، بەڵام پێیان دەگوت ئیسکۆ. پیرە، فینجانێک قاوەی فڕکرد، ئەوجا چۆکی دادا، گوتی:

ئەم داستانەی بۆو دەگێڕمەوە لەمێژە ڕووی داوە، ئەو دەمی هێشتا ساویلکە بووم، بەڵام لاوێکی کەتەی بەخۆوە بووم. بەری سمێڵم، وەک دەڵێن تازە خەتی دابوو. ساڵێکم لە نێو عەشیرەتی خالدییاندا بەخولامی ماڵە مراد بەگی بردبووە سەر، مراد بەگی ئاغام لەگەڵ عەشیرەتی مللادا دوژمن بوون. چەند ساڵ بوو بەسەر و گوێلاکی یەکیاندا دەدا و هەمیشە شەڕمان بوو: پیاومان لێک دەکوشتن، یەکدیمان تالان و بڕۆ دەکرد. والیی (دیار بەکرێ)ش قەتی درێغی لە کۆمەککردن و یارمەتیدانی بەگی عەشیرەتی مللا نەدەکرد. دەیانگوت گۆیا چەکیشیان دەداتێ.

جا والی چ دەربەست بوو بەتەنگی چییەوە دەهات، ئەو دەیگوت: «خودای دەکرد کورد ئاسەواری یەکیان دەبڕییەوە، خێری ئێمە لەوەدایە.!» بەڵام عەشیرەتی مللا هیچ کاتێ دەرۆستمان نەدەهاتن و هەر ئێمە ئەوانمان دەبەزاند. جارێکیان بڵاو بووەوە کە پادشای تورک، چەند هەزار کەسێکی بە سەرکاریی شوکری پاشای ناردووە، کوردستانێ داگیرکا. ئەم خەبەرە گورجێ لە نێو کوردان بڵاو بووەوە، تەنانەت ئێمەش بیستمان. عەشیرەتەکانی سەر ڕێگای شوکری پادشای هەموو خۆیان کۆک و تەیار کردبوو کە ڕێگا لە دوژمنی داگیرکەر بگرن، بەڵام شوکری پاشا کاتێ گەیشتە گوندەکانی سەر ڕێگای، هەموویانی بەر تۆپان دا و بەجارێ وێران و خاپووری کردن. ڕاستە بەینمان لەگەڵ عەشیرەتی مللادا خۆش نەبوو، بەڵام هەرکە بیستیان تورک

بەسەر کوردانـدا دەدەن، ئەوانیش خۆیان کۆکردەوە و لە داگیرکەران ڕاپەڕین و دەستیان دا چەکێ.

بەگی وان پەیکی خۆی ناردە کن مراد بەگی مە، گوتی:

– ئیتر ڕۆژی خیرەتە، با بەس والی دیار بەکرێ بەیەکماندا دا؛ پێویستە دەستی یەک بگرین و فرِان باوێینە دوژمن. هەواڵێکی دیکە بڵاوبووەوە کە گۆیا شوکری پاشا گوندە کوردنشینە شەڕنەکەر و بێلایەنەکانی سەر ڕێگاش بەر تۆپان دەدا و ژن و منداڵ و پیر و پەککەوتەش دەکوژێ و هەرچی کیژی جوان و ژنی لاویشە بەدیلیان دەگرێ. ڕۆژێکیان بەگی ئێمە و بەگی عەشیرەتی مللا تووشی یەک هاتن، هەرتکیان بەپێی ڕێوڕەسمی باب و باپیران بەڵێنیان بەیەک دا بەگژ شوکری پاشادا بچن، نەهێڵن پێ باوێتە نیشتمانی ئێمە. بەرەی هەردوو عەشیرەتەکەش گەورە و بچووک بەڵێنەکەیان پەسند کرد.

عەشیرەتی مللا لە دیاربەکرەوە نێزیک بوون، هەرچی ئێمە بووین تەواوێ دوور بووین. هەرکە پەیکی عەشیرەتی مللا پەیامی هێنا کە شوکری پاشا گەیشتووەتە سەر سنووری، ئیدی گورجێ بە هاواریانەوە چووین، بەڵام مراد بەگ خۆی لەگەڵماندا نەهات، زۆرۆ بەگی برا بچوکیی لە جیاتی خۆی هەنارد. بوێری و گەڕناسیی زۆرۆ بەگ لە نێو کورداندا لەمێژبوو ناوبانگی دەرکردبوو، وەبیرم دێ، زۆرۆ بەگ جار جار بەلاوی وەکو مەمانانی دەگوت: «شەڕکەر وێڕای بوێری و مێرخاسی دەبێ لە شەڕدا فێڵ و دەهۆ و تەڵەکەش بزانێ، دەنا پیاو تەنیا بەکەڵەمێردی ناتوانێ دوژمنی خۆی ژێرخا».

من خۆم لەم شەڕەدا بووم، زۆرۆ بەگ لە پێشان چەند هێرشێکی توند و کتوپڕی بردنە سەر، ئەوجا بەفێڵ کشاوە، کە گۆیا شکاوە و هەڵدێ. شوکری پاشاش بە لەشکری گەورە و گرانییەوە وەدوومان کەوت، بەڵام کە گەیشتە چیاکانی مە، ئێمە لە لایەکەوە و عەشیرەتی مللا لە لایەکی دیکەوە دامان پلۆستن، تا قرِمان کردن، داخی چەند ساڵەی دڵی خۆمانمان پێ ڕشتن، جا هەر لەو کاتەوە ئەمنیش کەوتمە نێو کۆمەڵی سوارەی تورکەوە و لەگەڵیان بەشەر هاتم، دووم لێ کوشتن، بەڵام یەکێ شیرێکی داوەشاند، سەرم

بپەڕێنێ، منیش مەتاڵەکەم دایە بەری، شیر لە مەتاڵ ترازا، لە گوێم کەوت و پەڕاندی. منیش نەمکردە نامەردی گورج هاتمە دەست و شیرەکەم لە دڵیدا نوقم کرد، کوشتم و هەڵاتم. ئەو زەمانە زەمانی کەڵەمێردان بوو، نەک گاڵتە، ئەو جۆرە کەڵەمێردانە کوان ئێستا؟ ئیدی شوکری پاشاش بەرەودوا هەڵات، ڕۆیشت، ببڕای ببڕای نەگەڕاوە.

لەو ڕۆژە خۆشەدا خورشیدی بازاڕباشی سواری ئەسپەکەی بووبوو و چەند یاساوڵێکی وەدووی خۆی دابوو، بازاڕ و کووچە و کۆڵانی نێو قەڵای بەسەر دەکردەوە. دووکانداران کە دیتیان، گوتیان: «دەک بە خێر نەیێت، ئاخۆ دیسان چ بڵێ؟» بازاڕ باشی فەرمانی بە هەموو دووکاندار و خاوەن خان و شوێنانی دیکە دا، گوتی:

ئەمن دوو ڕۆژ لەمەوپێش پێم نەگوتن: «ئیتر بەهارە و گەرمە، دەبێ جۆگەی پێش دووکان و خانەکانتان پاک کەنەوە، یانێ چی هەر وەکو خۆیەتی؟ سبەینێ دەگەڕێمەوە خوام لەو خوایە پاک نەکرابنەوە. سا سوێند بەچی یەکی سزایەکی گرانتان بدەم. پاشان نەڵێن لە خۆڕایی سزای داین. بازاڕباشی ئەم فەرمانەی بەدەنگێکی وا بەرز گوت خەڵکی گوزەرەکانی دیکەش گوێیان لێ بێ. ئەنجا بەرەو کارگەکان ڕۆیی. ئەم کارگانە بەرەو لای شوورەی قەڵاوە لە سەرووی بازاڕی بینانرابوون. ئەمانەش تەنیا جێگای کارگە نەبوون، بەڵکو وەستاژن و منداڵانیشیان تێدا دەژیان. هەریەک لەپێش کارگەی خۆیدا زنجێکی دروست کردبوو، لەگەڵ ماڵ و منداڵەکەی تێدا دەژیا. ئەم کارگانە وا دروست کرابوون، ئەگەر پیاو بۆ بازاڕ هاتبا دەبوو بە بەردەمیاندا تێ پەڕیبا. چونکە لە کارگەکان بەولاوە ئیدی شوورەبوو پیاو نەیدەتوانی لە شوێنێکی دیکەوە ڕەت بێ. کارگەکان دوو ڕیزی ئەمبەر و ئەوبەر بوون و شەقامێکیان لە بەیندا بوو. لە بەر دەرگای هەموو کارگەیەکدا سەکۆیەکی تەختەدار هەبوو، هەر بەرهەمێک لەو کارگانەدا دروست دەکران، یا دەخرانە سەر ئەم سەکوانە یا بەداردا دەکران. جا چ لەو کارگانەدا دروست نەدەکرا؟ کارگە هەبوو، پاوەنی ئەسپ، ناڵی ئەسپ، ئی گوێدرێژ و ئێستر و گای تێدا دروست دەکرا،

کارگە هەبوو دەفر و ئامانی مس، سەتڵی گەورە، مەنجەڵ، تەشتی هەویر، کەوچک، سینی، لەنگەری، مسینە و لوولێنە و شتی دیکەیان تێدا دروست دەکران و دوایە بەقەڵایی سپی دەکرانەوە و لەبەر هەتاو دادەنران، چریسکە چریسک دەچریسکانەوە. کارگەی دی هەبوون چەکیان تێدا ساز دەکردن: لە خەنجەر، لە شیر، لە مەتاڵی پۆڵا، لە سەرەنێزەی سێ پاڵوو، لە زرێ، لە سەرکۆم و کڵاوخوود و شتی دیکە. کارگەی واش هەبوون زینی نەخشراوی باڵکداری چاک و نەخشین و جوانی وای تێدا دروست دەکران ئەگەر سوار بۆ ڕێگای دووریش بچووبا و مانگێکیش لەسەر ئەسپەکەی دانەبەزیبا وەڕەز نەدەبوو، هەروەها ئاوزەنگی، لغاوی ئەسپ، ڕەشمەی پەرەنگدار و چاک، کۆپانی گوێدرێژ، ئی هێستر و جل و جیازی و شیریشی تێدا دروست دەکران.

هەموو بەیانییەک تاریک و ڕوون، پێش ئەوەی شار لە خرپەی خەوی بەرەبەیان وەخەبەر بێت، دووکەڵی کارگەکان بڵند دەبووەوە و شاگردان پاش ئەوەی دەمەکانیان بەکوورەکانەوە دەچەسپاند و بەئاگری خەڵووز گەرمیان دەکردن، دەبوا ماوەیەکی زۆر بیاندەماندایە، تا پارچە ئاسنەکان باش جۆش بخۆن و نەرم ببنەوە و بتوانرێ وەبەر چەکوش بدرێن و شمەکی فرۆتەنییان لێ دروست بکرێت.

لەبەرئەوە هەموو کارگەکان لەپێش بازاڕ و دووکان و خانەکاندا دەکرانەوە و لە سبیانێ زووەوە ئیدی کار بێ وچان بەگەرمی دەستی پێ دەکرد.

لە کارگە بچووکەکاندا هەر دوو سێ کارگەر کاریان دەکرد، بەڵام کارگەی واش هەبوون، جگە لە وەستای خۆی، هەشت، نۆ، دە کارگەر و شاگرد کاریان تێدا دەکردن. پیاو کە دەینۆڕییە ڕەنگی کارگەرەکان دەموچاویان لە تەنی و هێسان ڕەش دەچووەوە، چونکە هەمیشە لەبەر ئاگر و دووکەڵی و تەنیدا بوون...

کەسانێک کە دەهاتنە نێو ئەم کارگانە و هێشتا لە کار ڕانەهاتبوون، لەبەر تەق و هۆڕی چەکوش و ئاورینگ و پریشکی ئاگر؛ کە بە چوارنکالاندا پەرت و

بڵاو دەبووەوە، وەڕەز دەبوون...

ئەم کارگانە بەزۆری ئی کوردی سلێمانی[1] و دیاربەکر و شام و جێگەکانی دیکە بوون، بەڵام کارگەری عەرەب و ئەرمەنیشیان لەگەڵ بوون.

کاتێ خورشیدی بازاڕباشی گەڕاوە، دیتی لە نێو بازاڕ، هێشتا خوڵەمێشێکی زۆر لەبەردەم کارگەکاندا کە لە زستانێڕا هەر مابوون، کەڵەکە بوو. تووڕە بوو، دەستی بەقیژە- قیژێ کرد، گوتی:

-ئەمن چەند جارتان پێ بڵێم، گوزەر و بەردەمی کارگەکانتان پاک بکەنەوە؟ تاکەی لێتان بێدەنگ بم...

بازاڕباشی هەڵی کوتایە سەر یەکیان و بەر قامچییانی دا و لە یاساوڵانی ڕاخوڕی: «بیگرن، بۆ دیوەخانێی بێنن»...

ڕاستە شاری قەڵای دمدم وەکو شارە کەوناراکانی سەردەمانی پێشوو هێندە گەورە و فرەوان نەبوو، بەڵام ئەمیش ببوو بە شارێکی زۆر چاک و چت خەیاڵ کردبا تێدا وەچەنگ دەکەوت. سەرەڕای هەندێ کە لە هەموو ناوچەکانی دەوروبەرییەوە کڕیار و فرۆشیار ڕوویان تێ دەکرد، هەروەها لە وڵاتە دووردەستەکانیشڕا بازرگانی بۆ دەهاتن و کوتاڵی خۆیان دەکڕی و دەگەڕانەوە. لە شاردا گەلێ گوزەر و شاڕێ هەبوون، جگە لە دوو بازاڕ مەیدانێکی ئاژەڵیشی تێدابوو. لە مەیدانێدا پەز و وڵسات و ئەسپ و ماینی کەحێلەی کوردەواری دەفرۆشران. خەڵک لە هەندەرانڕا دەهاتن ئەسپی کەحێلەی کوردییان دەکڕی. کڕیاران کە لە بابەت و جۆر و ڕەسەنی ئەسپی کوردی دەدوان، دەیانگوت:

– ئەسپی کەحێلەی کوردی گوێیان کورت و مقەستییە، سمیان خشت و خڕە، سنگیان دەرپەڕیو و پانە، سەریان بچووکە، ئەستۆیان قەفە، باریک و زوورارن، ورگن و تەپ نین، پێت وایە کەم ئالیکن. بەڵام دەتوانن چەند ڕۆژ بەرگە بگرن. ڕێگای چەگلاوی و بەردەڵان و ڕەقەن، چیا و هەڵدێر، گەلی و

[1] سلێمانی ئەودەم نەبوو. تۆ بڵێی هۆزی سلێمانیی مەبەست نەبێ؟

کەندالْ، بۆ ئەسپی کەحێلەی کوردی وەکو یەکن، هیچ جۆرە گیانلەبەرێکی پێرۆ لەبەر بازیان ڕزگاری نابێ، هەتا کارمامزیش. فرە وشیار و زرنگن، ترووک و سرکن، سواری خۆیان دەپارێزن... هەر بۆیەش خەڵک لە هەموو چوار نکالی دنیاوە دێن و بەهەر نرخێک بێ دەیانکڕن...

لە شار گەلێ دووکانی جۆراوجۆر هەبوون، لە دووکانی عەتار و وردەفرۆشان، متوموورووو و زەنگیانە و دوگمە و کوژەکە و دەرزی و دەزوو، کشتەک و قەیتانی ڕەنگاوڕەنگ و قۆچکە و مێنەکە و کڵاو و دەستەسرِ و تووڵ و شاڵی ئاوریشم و کرمەک و تەوقی گەردن و گەلێ شتی دیکە هەبوون. دووکانی کاڵا و قوماش فرۆشان هەبوون. جا کاڵا و قوماشی چ وڵاتێک لەم شارە نەبوو؟ بگرە لە شاڵی کشمیرت، لە ئاوریشمی هندستانت، لە قەنەوزی ئەفغانستان و لە چۆغەی ئێرانت، لە قەدیفەی بەسرەت و لە چیتی فەرەنگت، ئەمانە گشت هەبوون. ڕیزێ لە کارگەکان ڕەنگرێژ بوون، بەن و ڕێسمانی فەرش و قاڵیچە و مافوور و ڕایەخ و بەڕە و گازر خورج و تێرِ و بووزەڵە و چارۆکەی کوڵی ژنان و زۆر شتی دیکەیان ڕەنگ دەکرد. جا چی دیکە نەبوو؟ دووکانی ئازووقە و دانەوێڵە فرۆتنیش هەبوو: لەو دووکانەدا گەنم و جۆ، گارس، گەنمەشامی، نۆک، نیسک و دانەوێڵەی دیکە دەفرۆشران... لە شار گەلێ چێشتخانەی خۆش هەبوون: لە چێشتخانان لە سبحەینێرا تا ئێوارێ لەسەر ئاگری ڕەژی ئەوە هەر چێشتی جۆر جۆر بوو و لێ دەنران. پیاو کە بەپێش دەمی وان چێشتخانانداتێ دەپەڕی بەبۆن و بەرامەی خۆش مەست دەبوو و ئەگەر برسیشی نەبایە ئیشتیای دەچوونیێ: قاورمە، یاپراخ، قلیانی سەرسێڵ، تاسکەبابی، شیش کەباب، ڕشتە و ساوار، گۆشت و برنج، ناوساجی، شلکێنە، کەشکەک، پەڵووڵە و چێشتی دیکە ئەوانە هەموو هەبوون. چێشتخانان هەمیشە پڕبوون لە بازرگانان، دووکانداران، سەرەک عێل و خاوەن خان و کاروانچی و قەتارچییان کە بۆ ماڵ فرۆشتن هاتبوونە قەڵایێ. هی واش هەبوون خۆیان نەدەچوونە چێشتخانان، ئەوانە دەوڵەمەندی گەورەی شار بوون و خاوەن عەمباری پڕ شمەکی تایبەتی بوون و ماڵیان بەتۆمەری

دەكرِی و بەتۆمەریش دەیانفرۆتەوە.

خاوەن چێشتخانان تاشت و فراوین و شیویان بە سەركاراندا بۆ دەناردنە جێی خۆیان و جاروباریش خواردنیان بەتایبەتی بۆ ڕادەسپاردن و بەو جۆرە خواردنەیان دەگوت: «خواردنی ڕاسپاردە و دڵخواز». جگە لەوانە چێشتخانەی دەست كورتانیش هەبوون: سەروپێی بزن و مەڕ و جوانەگا، وەكو دەڵێن وردە پزوور و پرزۆڵە و قاورمەی ڕێوی و سی و جگەر و پلاوی هەرزن و سیراو و زۆر شتی دیكەیان تێدا دروست دەكردن. ئەوان چێشتخانان هەمیشە لە خەڵكی هەژار و لات ژاوەیان دەهات، هەندێكیان خێر و خۆشیی شاری قەلایان بیستبوو، لە هەندەرانڕا هاتبوون، ئی واشیان تێدابوون لە ترسی خنكاندن و زوڵم و زۆری  شای ئێران و پادشای ڕۆمی بەهەزار كولەمەرگی گەیشتبوونە وێ و ڕزگار ببوون. پیاوی زانا و خوێندەوار و وشیار و تێگەیشتووشیان دەنێودا هەبوون.

لە سای دەسەلاتی خانۆ كەس نەیدەتوانی- لە هەر تیرەیەك با- زۆر لە كەسێكی دیكە بكا...

پیاوی وا هەبوون دەچوونە لێڕەوار و جەنگەڵستانان داریان دەبڕی و بەكۆڵ دەیانگوێزتەوە بازاڕێ و دەیانفرۆشتن، یا هەر لە لێڕەواراندا دەیانسووتاند و دەیانكردە ڕەژی و دەیانگوێزتەوە شاری و بە كارگەكانیان دەفرۆشت، بەچێشتخانە و مالانیان دەفرۆشت. هەندێكیشیان ببوونە ئاوكێش و بە كوندە ئاویان بەمالاندا بەپارە دەبەشییەوە، هەندێكیشیان لە نێو بازاڕ حەمباڵییان دەكرد و بەدڵێكی شاد و ڕەحەتەوە نانیان بۆ خۆیان پەیدا دەكرد. زۆر چاكیش ڕێزیان لە یاسا و ڕێوڕەسمی شاری قەلای دمدم دەنا و هەستیان بەهەر كەسێكی غەیان و ناپاك كردبا دەسبەجێ خەبەریان بەدیوەخانی خانۆ دەدا و دەیانگرت.

چێشتخانەكان هەمیشە پڕ لە هەژار و دەرۆزەكەر و دەروێش بوون. نانەواخانەیەكی زۆر لە شار هەبوون، تیریی سەر ساج، لەواشەی تەندوور، بۆكۆن، كولێرەتەفتوون، كولیچە و گاڵگاڵیی كادە، حەڵوا، زلوبیا و زۆر شتی

دیکەی جۆراوجۆریان تێدا دروست دەکران. ناو بەناو شاگردی کارگەکان بەپەلە دەهاتنە نانەواخانەکان، لەواشەیەکی گەرم و گوڕیان بەیەک دوو قورۆش دەکڕی، هێند بەلەزەت هەڵیان دەلرفاند هەر دەتگوت نایجوون، ئەوجا، پاشان بەدەم لەواشە هەڵلرفاندنەوە دەگەڕانەوە کارگەکان...

خورشید لە گوزەری کارگەکانڕا بەرەو ماڵی مووسا هات، ماڵی مووسا چێشتخانەیەکی دوو نهۆمیی گەورە و هەراوی بەرانبەر بوو. ئی کوردێکی خەڵکی جزیر و بۆتانی بوو، ناوی بەدر بوو، کە خورشیدی بەسواری لە پێش دەرگەی چێشتخانەکەی دیت وەستاوە، دەستەخۆ وەدەرکەوت و ئیکلامی بۆ کێشا، گوتی:

– فەرموو، قوربان، هەر ئێستا لە قلیانی برژاندنێی سەرساج بوویمەوە گۆشتەکە گۆشتی کاوڕی یەک ساڵەیە، ئەگەرچی دەشزانم کاروبارت هێندە زۆرە ناپەرژێیە سەر هیچی دیکە و ناتوانی لێرە گیر بی. بازاڕباشی سەرەڕای ئەوەی کە کۆمەڵێک ژیلەمۆ و خاکە و سەرە بزووتک و خوێن و خوڕ و گۆتاوەرۆی مێش تێ وڕووکاوی لەبەر چێشتخانەکەیدا دیت، بەڵام متەقی نەکرد، لە ئەسپێ پەیا بوو و یاساوڵان ئەسپیان بەدارێکەوە بەستەوە، چوونە ژوورێ دانیشتن. پاش ئەوەی تێروپڕیان قلیانی سەرسێڵ خوارد و سەر و جامیان شەربەتی شیرین بەسەردا خواردەوە، دیسان سواربوونەوە و بەبێ: «بەزیاد بێ، خوا نەیبڕێ و ماڵئاوایی کردن» تێیان تەقاند و ڕۆیشتن.

خورشیدی بازاڕباشی پاش ئەوەی کە لەم سەر تا ئەو سەری نێو شار گەڕا، هەتا بەر دەرگای ئەشکەوتێک، کە تۆپیان تێدا دروست دەکرد، وەستا. خانۆ وەستایەکی پسپۆڕ و شارەزای فەلەی لە (وان)ێڕا هێنابوو، ناوی خاچۆ بوو، لەو ئەشکەوتەدا تۆپی بۆ دروست دەکرد. ئەشکەوتەکە قەدەغەکرابوو، بێ ئیزن خواستن، خورشید نەبێ، ئیدی کەسی دی ڕێ نەدەدرا بچێتێ. بازاڕباشی کە گەیشتە بەردەرگای ئەشکەوت دابەزی و ئەسپەکەی لەگەڵ خوڵامەکانیدا لە بەردەرگا بەجێ هێشت و بەتەنیا چوو بۆ ئەشکەوتێ. چەند پاسەوان و کێشکچییەک کە بەردەوام لە پێش دەرگای ئەشکەوتەکە کێشکیان

دەگرت، دەیانزانی کە ڕێگا تەنیا بۆ خورشید بەرەڵڵایە، ئیزنیان دا. خاچۆ هەر لە دوورەوە کە چاوی بەخورشید کەوت، بەرەوپیری هات، گوتی:

– وەی بەسەرچاوان هاتی، کاکە خورشید، ئەمرێ... خزمەتێ... فەرموو بڵێ...

– زاڵم ئەمر دەکات خاچۆ گیان، من ئەمر بەسەر تۆدا ناکەم، بەڵام دوێنێ خانۆ ڕای سپاردم کە بێمە کن جەنابت لێت بپرسم چەندت ئاسن پێویستە بۆ کار تا بنێرین بۆت بکڕین؟.

خاچۆ پیاوێکی زۆر ئاقڵ و بلیمەت بوو، کاروباری خۆی بەژیری و ڕێکوپێکی جێبەجێ دەکرد، سری خۆی لەکن هەموو کەسێ نەدەدرکاند. هەندێ ڕاما ئەوجا گوتی:

– «من بۆ خۆم کارێکی گرنگم بە خانۆیە، لە پاشان خۆم بە تایبەتی دەچمە خزمەتی و عەرزی دەکەم، کە چەندم ئاسن پێویستە...»

خورشیدی بازاڕباشی سوار بووەوە و بەرەو دەرگای موسڵ ڕۆیشت، جارێ نەگەیبووە بەردەرگای دەنگی زەنگوڵەی کاروانی بازرگانانی بەرگوێ کەوت، هەناسەی لەبەر خۆی بڕی، کە گوێی ڕاهێشت دەنگی زەنگوڵەی وشتران بوو، ئیدی لە خۆشییان هەر هێندە نەبوو گەشکە نەیگرێ، چونکە خانۆ، هەرچەندە خەرج و باج و گومرگ ئەستاندنی لە بازرگانانی بیانی قەدەغە کردبوو، نەیدەهێشت کەس لە سنووری یا لە نێزیکی وڵاتی ئەو کاری بەسەر بازرگانانەوە بێ و هەمیشە بەسەربەستی سەودا و مامەڵەی کڕین و فرۆتنی خۆیان دەکرد، بەڵام خورشید دیاری و بەرتیلی خۆی هەر وەردەگرت! بۆیە کاروان لە هەموو لایەکەوە ڕووی دە قەڵای دمدمێ دەکرد و بازرگانان بەکاوەخۆ چیان ویستبا دەیانفرۆشت و چیشیان پێویستبا دەیانکڕی، ئیدی لەبەر هەندێ، بازاڕ هەمیشە پڕی کوتاڵ و شمەکی فرۆتەنی بوو و چت گوتبا دەس دەکەوت. بگرە لە شارەکانی هیندستانێڕا، لە ئەفغانستانەوە، لە شامێڕا، لە حەڵەبێڕا، لە ئەستەمبوڵ و ڕۆمێ و ئێرانێڕا ڕوویان تێ دەکرد،

خورشیدی بازاڕباشی بەدزیی خانۆوە بێ دەسکەوت نەدەبوو، هەر بۆیەش بوو، دڵی بەدەنگی زەنگوڵان خۆش دەبوو. بازاڕباشی بەرەو دەرگا وەسەڵەف کەوت.

کاتێ دەگەڵ خوڵامان لە شوورەی قەڵا ڕەت بوو، ڕوانیی کاروانە وشترێک بە دە قەتار وشترەوە وەستاوە و گەورەی کاروانیش لەگەڵ سەرۆکی دەرگەوانان قسە دەکا. گەورەی کاروان سواری وشترێکی گەردن ڕەش بووبوو، ڕدێنێکی درێژی بەردابووەوە، وربەیەکی سپیی لەبەردابوو، چەفتەیەکی سپیی بەرین و عەگالێکی ڕەشی بەسەرەوە بوو، چەفتەکەی هێند هەراو بوو شۆڕ بووبووەوە و نیشتبووە سەر شانی. قەندەیەکی درێژی سەرزلی بەدەستەوە بوو، قەندەی دەکێشا.

خوڵام و دووئاژۆی وشترەکانی هەموو بەچەکەوە لە دەوری وەستابوون، وا پێ دەچوو بازرگانباشی زمانی کوردیی نەدەزانی، وەرگێڕی هەبوو، چیی ویستبا بە وەرگێڕی دەگوت، ئەویش بۆ سەرۆک دەرگەوانی وەردەگێڕا سەر زمانی کوردی. خورشید لە بازرگانباشی چووە پێشێ، سڵاوی کرد، گوتی:

– مەرحەبا

بازرگانباشی سڵاوی ئەستاندەوە. خورشید عارەبیی چاک نەدەزانی، بەڵام چەند ساڵ بوو، بازاڕباشی بوو، هەندێ سەری لێ دەردەچوو، بازرگانباشی پێی وابوو ئەوەی سڵاوی لێ کرد عارەبی دەزانێ، بۆیە ڕووی لە وەرگێڕ کرد و دەستی بەقسان کرد، وەرگێڕیش گورجێ وەری گێڕا سەر زمانی کوردی، گوتی:

– بازرگانباشی دەڵێ ئەمە کاروانی شامێیە، ئەمن ناوم (ئبن بەتووتە)یە[2] لەمێژە ناوبانگی قەڵای دمدمم لە بازرگانان بیستووە.

بۆیان گێڕاومەوە کە خانۆی لەپ زێڕین پیاوێکی ماقووڵ و بە بەزە و بازرگان پەروەرە. ئەوە یەکەم سەفەرمە بۆ ئێرە. بزانم ماڵ لێرە بە برەوە،

---

٢ ئبن بەتووتە: پێم وایە نابێ ئبن بەتووتەی جیهانگەڕی مەبەست بێ!

ئیدی کاروانم هەمیشە بەڕێوە دەبێ.

خورشید بەزەردەخەنەوە، گوتی:

– بە بازرگانباشی بڵێ بەخێربێی، بەسەرچاوان. فەرموو چی ماڵی بازرگانیت هەن لە بازاڕی قەڵایەی باوێ، بزانە چەند زوو دەفرۆشرێن. بازاڕی قەڵا هەمیشە لە خەڵکان ژاوەی دێ، لێرە نەک هەر کورد بەڵکە ئاسۆری و فەلە، ئازربایجانیشی لێن. هەر وردە و موردەیەکی لە هەندەرانڕا بێ جێبەجێ دەفرۆشرێن و چی نامێنێتەوە...

خورشید هەند بە لەبزێکی شیرین و خۆش لەگەڵ بازرگانباشی دەدوا کابرا واقی وڕمابوو، لە خورشید ڕامابوو، لە دڵی خۆیدا دەیگوت هەبێ و نەبێ ئەمە خانۆی لەپ زێڕینە، دیسان ڕووی کردە وەرگێڕ، بە عارەبی تێ هەڵچووەوە، وەرگێڕ بۆی وەرگێڕا سەر زمانی کوردی، گوتی:

– بازرگانباشی دەڵێ: «ئەمن زۆر خۆشحاڵم کە بۆ یەکەم جار لە بەردەرگای ئەو قەڵا گەورە ناودارەدا بەخزمەت میر خانۆی لەپ زێڕین دەگەم»...

خورشید گوتی:

«بە بازرگانباشی بڵێ، ببوورێ، من خانۆی لەپ زێڕین نیم، ئەمن بازاڕباشیم، بەڵام وەکو ئەو فەرمووی، بەڵێ ڕاستە، خانۆی لەپ زێڕین زۆر میوان پەروەرە، بە تایبەتی لەگەڵ کەسانێک کە بەدڵی پاکەوە دێنە شارەکەمان».

بازرگانباشی کەمێ ڕەنگی گۆڕا و لەو قسانەی کردبووی مەیلە و شەرمەزار بوو.

خورشید فەرمانی بە گەورەی دەرگەوانان دا، کە بازرگانباشی ببەنە بازاڕ، بەڵەدێکی لەگەڵ بخەن و بیبەنە خانی مووسا دایمەزرێنن. ئەوجا خۆشی دای قلاشت، ڕۆیی. خانی مووسا تازە بینا نرابوو، خانێکی گەورە و هەراو و خۆش بوو. لە هەموو لایەکەوە چاوە چاوە بوو، ئەم چاوانەش

دەرگەیان بەسەر بازاڕدا دەکراوە. کە بازاڕ دادەنرا بازرگانان پێویستیان بەوە نەبوو شمەک لە خانەوە وەگوێزنە نێو بازاڕی، بەڵکو هەر لە دیوی بازاڕێڕا دەرگای ئەم چاوەخانانەیان بەسەر بازاڕدا دەکردەوە و ئیدی هەر خۆی دەبوو بە بازاڕ...

کاروان هێشتا نەگەیشتبووە خانێ، مووسا هەر کە دەنگی زەنگوڵەی بەرگوێ کەوت دەسبەجێ وەدەرکەوت، چوو بەپیریانەوە. ئەو بەڵەدەی خورشید لەگەڵ بازرگانباشیی خستبوو خێرا خۆی گەیاندە مووسا، ڕای گەیاندێ، گوتی:

– "هاپۆ مووسا، خورشید ئەم کاروانەی بۆ کن جەنابت ناردووە، دەبێ لە خانەکەی خۆتدا شوێنێکی چاکی بۆ دابین کەی."

مووسا گوتی:

– «وەی بەسەرچاوان، چا داخوازێکی لە خورشیدەوە بێ کوو جێبەجێی ناکەم». مووسا عەرەبیی جوان دەزانی، لەگەڵ بازرگانباشیدا بەعارەبی ئاخاوت. بازرگانباشی لەسەرەخۆ سێ و چوار باسقەندەی لە ملی وشترەکەی دا، گوتی:

– یخخخ، یخخخ، یخخخ...

وشترەکە لە پێشان چۆکی دادا، ئەوجا هەردوو لاقی نوشتاندەوە و یخی خوارد. بازرگانباشی دابەزی و سڵاو و چاک و چۆنییان لێک کرد. مووسا وەپێش بازرگانباشی کەوت، بردی چاوەخانێکی لە چاوەخانان نیشان دا، بازرگانباشی کە چاوی بە چاوەخانێ کەوت، وا هەراو و خۆش و بە تەختەبەند و ڕەفت و ڕێکوپێکە، گوتی:

«وەڵڵا خانی وا مەگەر هەر لە بەغدایێ هەبێ. بگرە زۆر چاتریشە... بنۆڕێ، بنۆڕێ، هەتا وەجاغ و ئاشپەزخانەشی تێدایە»... بازرگانباشی وەدەرکەوت، فەرمانی بەخولامان دا بار و بەستە هەموو ڕاگوێزنە نێو خانێ. خولامان لە پێشدا وشتریان هێنا حەوشێ، یخیان دان، بوو بەبۆڕە بۆڕی وشتر. ئەوجا

باریان کردەوە و شمەکیان گواستەوە نێو خان.

دەمــەونیـوڕوانـێ بوو، خـورشــیـد بەرەو مـاڵـێ چوو، بەڵام بەقــەسـتـی لەو کـووچەوە ڕۆیی کـە مـاڵی مـەخسـوودی لێ بوو. کـە نێـزیک بووەوە، دلبـەر لە بەردەرگــای مــاڵی خــۆیان خــەریک بوو لەبەر هەتـاوێ ڕایەخ و فــەرشـی هەڵدەخـست و تۆز و خـۆڵی زسـتـانێی لێ دەتەکـاندن. جێـژنی سـەری سـاڵێ نێـزیک بووبووەوە. دلبـەر هەند بەشـەوق خـەریک بوو، چ ئاگـای لە خـورشـیـد نەبوو، شووێکی بەدەستەوە بوو، قالیچە و مافوورانی پێ دەتەکاندن. خورشید کە چاوی بەدلبەری شۆخ و بەدەو کەوت ئاگری لە جەرگی بەربوو. دەستی برد قەدەرێ سمێڵە باریکە تەنکەکەی بادا و کۆڵۆسێی لەسەری کردەوە و یەک دوو بۆڵژنی لێوەهات... ها مانا دلبەر گوێت لێ بێ، بە خولامانی گوت:

– ئەرێ ئەوە بۆچی وەکو وشتر سـوار بەسەر پشـتی ئەسپەکانتانەوە لۆقـە لۆقــتــانە! دەڵێی نە لە تیــرەی بەرۆدارن و نـە لە جــەنگاوەرانی خــانـۆی لەپ زێڕینن! کورە خێراکەن.

خورشید هێشتـا باوی مابوو، زۆری ژن هێنابوو، لەگەڵ ئەوەش سێ ژنیشـی هەبوون کـەچی دڵی چووبووە دلبـەری چاو و برۆ ڕەشـیش، زۆر جـار خـەڵکی ناردبووە مـاڵە مەخسوودی خوازبێنیی بۆ بکەن، پەیتا پەیتـا دیاری و نیشـانی بەنرخ و نایابی بۆ دەنارد، هەرچی لە بازرگـانانی وەچەنگ دەکـەوت لە پێشـدا بۆ ویی دەنارد. بـەڵام چەندی دەکرد دڵی دلبـەری پێ نەدەکرڕدرا و نـەیدەتوانی باویشـی وەتەمـاحێ خا. هـەرچی بۆ دەنـارد بەسـەر خـوازبێنیکەراندا دەدرانەوە و بەناهومێدی دەگەڕانەوە، باوی دەیگوت:

– کـابرا سێ ژنی هەن، دلبـەر نادەمـە سـەر سێ هەوێیـان با بچێ کـچێکی دی بەپارە و بەرتیلان پەیدا کا.

بەڕاسـتی جـا دلبـەر کـچـێکی زۆر جـوان بوو، بەژنێکی ناسکۆڵەی تـەنکی سـۆسکەییی هەبوو. دەمـوچاوی وەکـو مـانگی چاردەی، خـڕ و خـشـت بوو. خـاڵێکی، نزیکی خـوبـابی، بەڕوومـەتی چەپەوە بوو. هـەرچی چاوی بەگـەردنی

سپیی بەفرینی، بەکۆڵمەی ئاڵی وەک سێوەلاسوورەی کەوتبا شێت و شەیدای دەبوو، نەک خورشید بگرە هەزاری وەک ئەوی وێڵی کێو و بیابانان دەکرد.

زۆر لاوی شۆخ و شەنگی قەڵا، گەلێ کوڕە ماقووڵی عەشیرەتی بەرۆداری[3] بەهەویا بوون و خوازبێنییان دەکرد، بەڵام دلبەر دڵی نەدەچووە کەسیان و شووی پێ نەدەکردن.

جگە لە جوانی و شۆخ و شەنگی، بەگفتوگۆ، هێند دەم و دووی شیرین بوو دەتگوت لەبەرەی ئینسان نییە، هەر دەتگوت کۆترە و دەگمێ. چاوی بە کل نەدەڕشت، نەشارەزا سەیری کردبا و لێی وردباوە سەت سوێندی دەخوارد چاوی ڕشتووە! بیست و چوار کەزیی درێژی بەسەر پشتدا شۆڕ دەبوونەوە. بۆ جوانی چەند پوولەکە ماسییەکی بەقەیتانی سوور بەکەزییەوە بەستبوو، بۆ وەی لە چاوەزار دووربێ، چەند نووشتەیەکیان لە کن مەلا بۆ لەبەر قورئانێ نووسیبووەوە و ئەوانەشیان هەر بەکەزییەوە بەستبوو. کەمەربەندێکی زێوی زێڕکفتی دە کەمەر بەستبوو. تاسێکی زنجیرداری زێوی لەسەر بوو، بەرچەنەی، تۆقەی گەردنی، مت و مۆری و زەنگیانە و مەرجانی سنگیان داپۆشیبوو، لووتەوانەیەکی زنجیرداری لە چەپرا، بەکەپۆوە بوو، زنجیرەکەی بەبەر سینگیدا شۆڕ دەبووەوە. بازنەکانیشی هەر زنجیردار بوون. جووتێ پێڵاوی وانێی لە پێدا بوون.

دلبەر کە چاوی بە خورشید کەوت. بەڕێوڕەسمی باو و باپیران ڕووی لێ وەرگێڕا و پشتی تێ کرد. بەڵام خورشید بەقەستی لێی نێزیک بووەوە، گوتی:

– گیانە شیرینەکەم، ڕووشم لێ وەرگێڕی، ئەتۆ هەر نێچیری خۆم و کابانی ماڵە منی.

دلبەر ئەم قسانەی خورشیدی زۆر پێ ناخۆش بوو، ناچار پەردەی شەرمێی هەڵداوە و مەردانە بەرپەرچی داوە، گوتی:

– تۆ بە ناڕەوا گومان دەبەی و بەو ڕەنگە بیر دەکەیەوە. من نێچیری تۆ

---

٣ بەرۆدار: برادۆست. ئەو نێوە نەبیستراوە.

نیم، ئەتۆ سێ نێچیرت وا لە ماڵێن، چاوەنۆڕتن، بگەڕێیەوە کنیان.

– چما پارووێکی زیاتر بۆ پیاو گوناهە، ئەدی قورئان مافی وەی بەمەمانان نەداوە؟

– دەڵێم برۆ بەڕێی خۆتدا، من نێچیری دەم و لەوسی شتی وەکو تۆ نیم.

– ساوەڵڵا، بەپارە بێ، یا بەزۆر هەر دەتهێنم.

–ڕەنگە تۆ پێت وابێ، هەر لەبەر وەی بازاڕباشیت دەتوانی بە هەموو جۆرێ کچی خەڵکی بەزۆر داگیر بکەی. تۆ خۆت زۆر چاک دەزانی من چوار برام هەن، وەک ڕێوی کەوڵت دەکەن، کابرا نابێ تۆزێ ئاقڵت بێ.

دلبەر لەم قسانە بۆوە و چووە ژوورێ.

بەڵام با ئەوەش بڵێین کە دلبەر لەمێژبوو دڵی چووبوە شەبابی کوڕی عەدی، چەند جاران لە دەشت و دەرێ لە کاتی حەسانەوەی ژێر سێبەری دار و درەختان بەڵێنیان بەیەک دابوو و سوێندیان بۆ یەک خواردبوو کە بۆ یەک بن. کوڕ و کاڵانی قەڵاش هەموو دەیانزانی، دایک و باوی دلبەریش پێیان زانیبوو و دەڕێی ئەو دڵدارییەی واندا نەدەوەستان، چونکە لە لایەکی هەردووک هاوتیرەی یەک بوون و لە لایەکی دیکەوە مەخسوودی باوکی دلبەر و عەدیی باوی شەباب برای شیریی یەک بوون. وەختێ دایکی مەخسوود دەمرێ دایکی عەدی بەشیری خۆی مەخسوود بەخێو دەکا. ئەم دووانە هەر لە منداڵیڕا یەکدییان خۆش دەویست، کەسێ قسەیەکی کاڵی بەیەکیان گوتبا ئەوی دیکەیان لەسەری هەڵی دەدایە و نەیدێشت بێ پشتیوانی بەخۆیەوە ببینێ. جگە لەوەش هەردووک لە پێناوی پاراستنی قەڵا لە شەڕێدا قاڵ بووبوون و برایەتیی خوێنیشیان چەسپی بوو. مەخسوود و عەدی زۆر جاران قسەیان لە بارەی ئەو کوڕ و کیژەوە کردبوو، هەردووکیان بڕیاریان دابوو مەسەلەکە ببڕنەوە، هەر مابووە سەر هەندێ کە پایزێ لە شاییەکەی برای دلبەری بوونەوە خوازبێنیکەر بنێرێتە ماڵە مەخسوودی.

***



بەشی دووەم

# مزگەوت بیناکردن

قەڵای دمدم مزگەوتێکیشی لێ بینا نرابوو، بەڵام چ مزگەوت، شتی وا جوان مەگەر لە شاری ئەستەمبووڵێ بینا نرابێ. کە لە نژیارکردنی مزگەوتێ بوونەوە و منارە بڵندەکەی تەواو بوو، خانۆ وەسەر منارە کەوت، نەک هەر شاری قەڵا، هەرچی بەست و گەلی و چیا و بەندەنی دەوروبەرانیش بوون هەمووی لێوە دیار بوون. خانۆ کە هاتە خوارێ بەوەستای گوت:

– وەستا نادر، لە بەرانبەر ئەو هونەرە ڕەنگینەتدا، شیاوی ئەوەی چنگێ زێڕ بەتۆش پێشکەش بکەم. بەڵام دەمەوێ چوار قوللەی بڵندی وەک منارەکەشم لەسەر هەر چوار گۆشەی مزگەوتێ بۆ دروست بکەی. خۆت دەزانی شا عەباس شیعەیە و حەز لەمەی سونی ناکا، بێ وچان لەشکرمان دەنێرێتە سەر. دەمەوێ شەو و ڕۆژ چوار کێشکچی دەو قوللانە دابن لە کێهە لاوە دوژمن وەدەرکەوت گورجێ ئاگادارمان بکەن.

وەستا نادر گوتی:

– قوربان منیش سوننیم، ئەمر دەکەی، بەسەرچاو، دەبێ قوللەی وات بۆ دروست بکەم لە شاری بەغدایێ وێنەی نەبێ و هەر چار نکالی قەڵای لێڕا دیاربێ.

ئیدی پایز بوو، قولینگ و ڕیشۆڵە و پەڕەسێلکە و تەرەوڵی دیکە بەرەو گەرمێنێ دەفڕین. بەڵام هەرچەند پایز بوو، هەوا هێشتا خۆش بوو. بەیانییەک

ئاسـمـان سـامـاڵ و شین بوو. هەتاو، لە شـاری قـەڵا نەبێ کـە ڕۆژی درەنگ دەکەوتێ، لـە هەمـوو زەویوزار و وارگـان هـەڵاتبـوو. ئەو بەیانـییـە خـەڵکی قـەڵا لەبەر گرم و هۆڕی چیا زوو وەخـەبەر هاتبـوون. کە بناغـەی قـەڵایان لێ دا لە زۆر شوێنان ئاسەواری کۆنیان دیتەوە. گەرەبێت، وەستای قەڵا گوتبووی: «وێ دەچێ ئـەو خــاکــە زۆر لـەمــێــژتر ئـاوەدان بووبـێ، بەڵام ڕەنگە بوومـــەلەرزە خاپووری کردبێ».

بەرەبەیانێکی مـەلا ڕەشـیـد وەسـەر منارە کـەوت، بەدەنـگ و ئاوازێکی بەرز بانگی دا. مـەلا ڕەشـیـد کە بانـگی دەدا دەنگی لەو چیـا و کـەندالّ و بـەندەنانە وای دەنگ دەداوە دەتگوت هـەزار دەنگە نەک دەنگێ.

خـەڵکی بانگ و سـەڵایان لە دووڕا دەبیـست. گوندەکانی دەوروبەری قـەڵا هەر کە بانگیان بەرگوێ دەکەوت دەستیان بەنوێژان دەکرد...

خـانۆ چەند خـولامی لەدوو بوون بەرەو مـزگـەوت دەهات. هـەرکـە نێـزیک بووەوە خـەڵکەکە دریان دا و هـەمـوو لـە لایەکـەوە وەسـتـان، تا لە پێشـان خـانۆ بچتە ژوورێ.

عـەشـیـرەتی بەرۆدار خـانۆیان لە کن پیـاوێکی کـەڵـەمـێردی ئازا و ڕاست و بەبەزەیی بوو، خۆشـیـان دەویست. خـانۆ چووە حـەوشـی مزگـەوتێ. لە پێشـان چووە سـەر کارێز کـە بۆ نێـو حـەوشـی مـزگـەوتـیان لێ دابوو. چاوە و حـەوزێکی زۆریان لەو کـارێزە بۆ دەسـنوێژ هەڵگرتن سـاز کـردبوو. لە سـەرڕا بـەخـوڕە خوڕ بەرەوخوار دەهات.

جێنوێژی خانۆ جیاواز و تایبەتی بوو.

مـزگـەوتەکـە دوو سـاڵ دەبوو بینا نرابـوو، بەڵام هێـشـتـا هـەر بێ مـەلا بوو، پێـشـنوێژی نەبـوو، زۆر جـاران ئاخـوند دەهـاتنە کن خـانـۆ کـە بە بەرنـوێژیان قـەبووڵ کا، بەڵام ڕازی نەدەبوو. جـارێکی ئـاخـوندێک لە کەربەلاوە هات نێوی مەمەد عەلی بوو، چڕوچاوێکی سـەیری هەبوو. ڕەهێڵە و تەرزەی بەهارێ چۆن زەوی نەرم دەکـوتێ و قـوڵکە قـوڵکـەی دەکـا ئاوڵـەش ئاوای لە چڕوچـاوی ئەم

کابرایە کردبوو. ڕدێنی بڕ بڕ و تیسکێ لێرە و تیسکێ لەوێ بوو. ئاخوند ڕدێنیان لە خەنەی دەگرن، بەڵام ڕدێنی ئەم کابرایە زۆر سەمەرە بوو، هەرچی دەیبینی لەبەر خۆیەوە دەیگوت: «بیسمیللا، ئەوە چییە؟» و ڕووی لێ وەردەگێڕا و دەیدایە پرمەی پێکەنینێ، ئاخوند لە خانۆ نێزیک بووەوە، بێ سەلام و بێ کەلام، دەستی بەفلّتە فلّتان کرد، گوتی:

– ئەمن شا عەباس ناردوومی. هاتووم ببم بە ئاخوندی مزگەوتەکەتان.

خانۆ تیژ لە ئاخوندی نۆڕی، گوتی:

– ئێرە وڵاتی کوردانە، شای ئێران چ کاری بەسەر ئەو وڵاتەوەیە و ئاخوندی لە بۆچی بۆ دەنێرێ! چما نازانێ ئێمە سونین و مەلای کوردمان دەوێ نەک ئاخوندی عەجەمان. برۆ بە لای کاری خۆتەوە...

ئیدی بوو بەپرمە پرمی پێکەنین، ئاخوند کە زانیی خانۆ تووڕە بوو متەقی نەکرد، بەئاسپایی خورجینەکەی هەڵگرت و بەبۆڵە بۆڵ لێی دا ڕۆیی.

بەڵام ئەو مەلایەی کە زۆر نەبوو لەسەر منارە بانگی دەدا و بەرنوێژیی دەکرد، کورد بوو، لە عەشیرەتی موکری بوو. لاوێکی سوورفل بوو. کە نوێژ تەواو بوو جەماعەت ئیدی بەرەبەرە لە مزگەوتێ وەدەرکەوتن. لەپڕ دوو سوار بەپڕتاو گەیینە بەر دەرگای مزگەوتێ، سڵاویان کرد و پرسییان:

– ئەرێ خانۆی لەپ زێڕین لێرەیە؟

جەماعەت گوتیان:

– بەڵێ لێرەیە، وێستا لە مزگەوتی وەدەردەکەوێ.

ئەسپیان دەکەفدا شەڵاڵ بوون. وادیاربوو ئەم سوارانە لە شوێنێکی دوورڕا زۆر بەپەلە هاتبوون و پەیکی خێر نەبوون؛ چونکە ئەو لەز و بەهەڵەداوان هاتنە لە وزە و توانا بەدەربوو؛ وێ نەدەچوو، بۆ شەرعکردنێ هاتبن. لاوەکەی پێشەوەیان کۆڵۆسێکی لوای لەسەر بوو، جامانەیەکی شیلانیی تێوە پێچابوو، ڕیشووە درێژەکانی بەسەر شانیدا شۆڕبووبوونەوە. کە داخەوت و سەری دێنا و دەبرد، ڕیشوو و گوڵنگان دەهاتن و دەچوون و هێندەی دیکە شۆخ و

شەنگیی بە سەر و سیمای دەبەخشی. ڕمبێکی گەو گەوی بەدەستی ڕاستەوە بوو، قـوتکەیەکی بەسـەرەوە بوو، دەتگوت نیـشـانەی تایبـەتیـیـە و لەبۆ جـوێکردنەوەی پایە و مـەقـامی جـەنگاوەران داندراوە؛ چونکە سـەرە ڕمـبی لاوەکـەی دی ئەو قـوتکەیەی پێـوە نەبوو. لاوە قـایشی ڕمـبی لە زەنگوێی دەرهێنا، برێ قاچی ماندووی بحەسێتەوە. شیرێکی کەوانی بەقەدیدا کردبوو، کێلانەکەی لە بازنە زێوی گیرابوو، دەسـتووشـی هـەر زێو بوو، بەڵام زێڕکفت کـرابوو، لەبەر هەتاوێ شـەوقی دەداوە و چریسکە چریسکی بوو. مـەتاڵێکی خـشت و خـڕی دەسکردی شـامـێی بەشـانـی چەپەوە بوو، قـڵـفـەکـەی بەداوە قـەیتـانی ڕەنگاوڕەنگ نەخـشـێنرابوو و وێ دەچـوو لاوێک بەدەست و پەنجـەی خۆی ئەو داوانەی بەدڵوداو هۆندبێتەوە. زرێیەکی داودیی لەسـەر پەسـتـەکێڕا لەبەردا بوو، لە سینگیڕا تا ژێر ناوکی و هێندێ بەرەخوارتریش، ناوشـانیشی تا خوار پشـتـێنەی، بگرە برێ بەرەخـوارتریشی لە زەبری دوژمن دەپاراست، زرێی سـەرشـانی هێند درێژ بوون، باسکیـشی دادەپۆشین و زەبریان وێ نەدەکـەوتێ، دەمـانچـەیەکی بەبەر پشـتـێنەوە بوو، تاتکی بەدەرەوە بوو. ئەسـپـەکـەی بۆرە بوو. کێ دەیزانی چەند ڕۆژە بەڕێوەیە! وێڕای ئەوەش هـەر نەدەسـرەوت و سـمکۆڵی دەکـرد و هەرهێندە نـەبوو جـڵـەوێی نـەپسێنێ و بەو دیوی حەوشی مزگەوتیدا قەڵەمباز نەدا.

جەمـاعەت لە مزگەوت وەدەرکـەوتن و بەپەژارەوە لە لاوە و ئەسپەبۆر ڕامان. سـوارەکـەی دیکەیان بـەڕمب و شیـر و مـەتاڵ و قـەمـەوە بـوو، بەڵام لە چەک و ڕیحـالی هەرزان باییێرا وێ دەچوو کوڕە هەژار بێ و پاکاری ئەو ماقووڵە بێ کە لە خزمەتیدایە.

خـانۆ لـە نوێژ بووبووەوە، لەگـەڵ چەند کەسـێکدا داخـاوت؛ خـەبەریان دایە: دوو پەیکی نامـۆ لە بەردەرگەی مـزگەوت لێی دەپرسن، خـانۆ لەسەرەخـۆ بەرەو دەرگەی مزگەوت هات، پیرەمێردێک دەستی درێژکرد بەپەیکی گوت:

– ئەو پیاوە کـەڵەگەتەی دەبینی، ئەوە خانۆی لەپ زێڕینە. ڕوانییـان پیاوێکی کەڵەگەتی بە شان و باهۆ چەند خولام و پاکارێکی دەخزمەتێدان، وێوە دێ.

کەوڵێکی قاوەییی لەبەردابوو و عەبایەکی سپیی لەسەرەوە بەخۆی دادابوو. پشتێنێکی کرمانیی لە پشت بەستبوو. خەنجەرێکی دەبەر خۆی چەقاندبوو، دەستووی خەنجەر لە ماهی دروست کرابوو و بەبەر پشتییەوە دەدرەوشاوە. هەرکە هەنگاوی هەڵدیناوە، دەتگوت شوێنی پێی دەژێر پێیدا دەتوێتەوە. سمێڵێکی درێژ لوولی سووری هەبوو. چاوی خڕ، بڕۆی ڕێک کشابوون، داغمەیەکی بەڕوومەتی چەپەوە بوو، شوێن برینێک بوو ڕۆژانی دژوار و چەتوونی ڕابردووی وەبیر دێناوە.

خانۆ لێیان نیزیک بووەوە، گوتی:

– لاوۆ بەخێربێن. خێرە، چ قەوماوە؟ لە کیهە عەشیرەتن؟ هەرتک لە ئەسپی دابەزین، خێراندارییان ئەستاندەوە و ئیکلامیان کێشا. لاوە چەک و ڕیحال پەرداخەکەیان گوتی:

– خێری چی قوربان! ئەمە لە عەشیرەتی شکاکین. ئەوە چەند حەوتووە، سەربازی شا عەباسمان تێ ورووکاون خەرج و باج کۆ دەکەنەوە. بەڵام ئەوە نە خەرج و باجە و نە هیچ، بەڵکە تاڵان و بڕۆیە، هەرچییان بەردەس دەکەوێ دەیبەن: دەخڵ و دان بێ، بەروبوومی دیکە بێ، هەتا پێخەف و نوێنی ماڵێش دەبەن. ئەوی سرتەشی لێوە بێ، بڵێ هەژارم، چم نییە، سەربازان وای وەبەر کوتک و قامچیان دەدەن ئیدی جارێکی دی بەخۆیدا نەیەتەوە، ژنان ڕیسوا دەکەن، منداڵان دەکوژن، پیر و کەنەفتان ئازار دەدەن. دەمڕاست و ڕدێن سپیی عەشیرەت مەیان ناردە خزمەتتان فریامان کەون و بەهاوارمانەوە بێن.

خانۆ کە ئەو قسانەی بیست دۆش داما، دەیزانی بەو دەستوبردە چیی پێ ناکرێ و ناتوانێ بەهاواریانڕا بگا؛ چونکە دەبوو وەستا نادر ئەوێ ڕۆژێ قوڵلان دروست بکا، بێ لەوەش، خاچۆ سێ مانگ پتر بوو، چووبووە شاری وانێ، ئاسن و کەرەستەی تۆپان بکڕێ و هێشتا نەگەڕابووەوە و خانۆ چاوەنۆڕی بوو. ئا، شتێکی دیکەشی وەبیر هاتەوە: عەشیرەتی شکاک تا ئەو دەمی دەستیان لە لەشکری ئێرانی نەکردبووەوە و لەگەڵیان بەشەڕ نەهاتبوون. خانۆ گوتی:

– ئێوه لەسەرێکەوه هەقتانە؛ کاتێکی شا عەباس لەشکری لێ کردن، وه جواب نەهاتن؛ خەریکی گاوگەردوونکردن بوون، بەڵام کە لەشکری لەمەش کرد ئەوێ ڕۆژێش هەر هیچتان نەکرد. فەرموون جارێ بابڕۆین بۆ دیوەخانێ.

خانۆ بەچەک و سیلاح و دیمەن و دەمودووی ماقووڵانەی سوارەکەدا، بۆی ڕوون بووەوه کە ئەوه یەک لە سەروەرانە: کوڕی بەگی عەشیرەتی شکاکە. ئیدی لەسەرەخۆ بەرەو دیوەخانێ هاتن.

خانۆ گوتی:

– سوڵتانی ڕۆمێ و شای ئێرانێ هەر خەریکی کورد وێکدادانن و مەش خۆ بەخۆ فڕان داوێینە یەک و یەکدی قڕ دەکەین. دە ئاکامدا ئەوان سواری قەڵاندۆشمان دەبن و تاڵانمان دەکەن، ئێمە خۆ بەخۆ خراپین کەسی برای.

– بەڵێ، قوربان.

هەرکە گەیینە دیوەخانێ خانۆ ناردی بەشوێن کوڕی گەورەیدا، گوتی:

– سەیفەدین، لاوۆ، عەشیرەتی شکاک لە تەنگانەدان، ئێمە هاوخوێنی یەکین و چ فەرق و سوو دەبەینی یەک ناکەین، هەر ئێستا سەت سواری لاو لەگەڵ خۆت بخە و بە دەنگیانەوه بچن.

پەیک ئیکلامی کرد، گوتی.

– قوربان، زۆرت سوپاس دەکەین، خوا لە خزمەتتاندا شەرمەزارمان نەکا.

هەر ئەوێ ڕۆژێ پێنج سەت سوارچاکی لاوی عەشیرەتی بەرۆدار لە قەڵای دمدمێڕا وەڕێ کەوتن.



بەشی سێیەم

# هەمزە چاوەش

هێشتا ڕۆژێکی بۆ جێژنی سەری ساڵێ مابوو. کورد بەم جێژنە دەڵێن: نەورۆز. خەڵکی قەلای دمدم خەریک بوون خۆیان ئامادە دەکرد، تەدارەکی ئەم ڕۆژە خۆشەویستەیان دەگرت، بەشادمانییەوە بیبەنە سەر: مەڕیان سەر دەبڕی، بریانی و قلیانی و کەشکەک و کفتە و زۆر خواردنی دیکەیان دروست دەکرد. میوەیان پەیدا دەکرد، خەریکی کولیچە سازکردن بوون، نیشانەیەکیان: ئەنگوستیلەیەک، مورووەک، پارچە زێوێک با – دەخستە نێو کولیچەیەکەوە ئەوجا سبحەینێی جێژنێ کە کولیچەیان بەسەر خاوخێزاندا دادەبەشییەوە، ئەو کەسی نیشانەکەی وەبەر کەوتبا مانای وابوو سەری بەدەوڵەتە و سامانی ماڵ لە سایەی سەری وییە.

شەوێکی پێش جێژنی سەری ساڵ دەبوا ورد و درشت خۆیان لە ڕووباران شووشتبا، یا چووبانا حەمامێ، تا بەپاک و خاوێنی نەورۆزێ بکەن، بەنیازی وەی هەمووو ساڵێ کۆک و پۆشتەبن بەرگی تازەیان لەبەر دەکرد. لەوان ڕۆژاندا کەس نەیدەزانی ئەو هەموو خەڵکە لە کوێڕا دەهاتن! بازاڕ و کووچان پڕ دەبوون لە فاڵچی و مەلا و دەروێش و زۆریان کار دەبوو و وەبرەو دەکەوتن؛ چونکە زۆر لاو هەبوون فاڵیان بۆ دەگرتنەوە بزانن ستێری بەختیان لەگەڵ ستێری بەختی ئەویندارانیاندا جووتن یان نا؟ هەندێکی دیکە دەهاتنە کن مەلا نوشتەیان لەبەر قورئان بۆ بنووسنەوە، یاریان وەفادار بن و پتریان حەز

لێ بکەن و بۆیان کــەوی بن. مــەلا بە فــێڵ و دەهۆ بەگــوێیــاندا دەچرپـاندن و دەیانگوت:

– دەبێ ئەو نوشتـانـە لە ژێر ڕێسـمـەی مـاڵی باوکی کچـەی دە چاڵی خـەن، ئیدی خۆیان ڕامـتان دەبن و ڕەدووتان دەکەون. بەڵام دەبێ ئەو کارە بەنـهێنی جێبەجێ بکەن و کەس پێ نەزانێ!

لاوەکان دەیانگوت:

– سـا وەڵڵا دەبێ هـەر ئەو شـەو بیـبـەین لـە ژێر ڕێسـمـەی مـاڵی بابیـان لە چاڵێی خەین و نەشـهێڵین زەیندەوەر پێ بزانێ.

کەسێک وەجاخکوێر و ئەستێور با، یان هـەر نێرینەی نەبوایە، یان نەخۆش با ئەوێ ڕۆژێ دەچوونە کن شێخ و باپیران فاڵیان بۆ دەگرتنەوە. دەچوونە کن مەلا نوشتەی بۆ دەکردن، منداڵیان بێ، نەخۆشییان چابێتەوە.

لەگەڵ نـێزیکبـوونەوەی ئەوێ ڕۆژێ شـاری قـەڵا وەگەشـە دەکـەوت، لە بازاڕ و دووکانان، لە خان و مەیدانی ئاژەڵ و وڵساتان زۆر شمەک، گەلێ ماڵ و ئاژەڵ و وڵسـات دەفرۆشـران، گەورە و چووک، هـەژار و دەوڵـەمـەند، هـەم کـاروباریان جێبـەجێ دەکرد، هـەم خۆیان بـۆ جێژن سـاز دەکرد، لە کووچە و کۆڵانان، لە گوزەر و بازاڕ، لە بەردەرگـان، لە سـەربانان، لەسـەر گوفـەک و سـەرانگوێلکان ئاگریان دەکردەوە کوڕوکاڵ شایی و زەماوەندیان دەگێڕا و دەبوو بە گۆوەند و هەڵلا، ئەم جێژنـە هـەر لە شاران نەدەکرا، لە گوند و گەرمـەسـێرانیش دەکرا، تەنانەت شـوانـی کـەژ و کـێوانیـشـی تێدا بەشـدار دەبوون. کێـشکچـیـی سـەر قوللانیـان تێ گەیاندبوون کـە لەو ڕۆژە پیرۆزەدا پێویستە زۆر ئاگاداربن، نەبا دوژمن لە ناکاو هێرش بێنێ، چونکە زۆر جاران شـای ئێران هـەموو جۆرە هێز و دەسـەڵات و دەهۆ و تەڵەکەبـازییەکی دەخـسـتنەکار، قـەڵای دمدم داگیـربکا و خـەڵکەکەش دەبن باندووری خـۆی باوێ و کـارێکی وا بکا ڕێگا بۆ کـوردسـتـان بکاتەوە. بـەڵام هـەمـوو جـارێ کوردان فـڕیان داویشـتـە لـەشکری وی و ئەوەی دەشـماوە بەسـەرشـۆڕی دەگەڕاوە بۆ ئێران.

عـادەت بوو: هـەمـوو سـاڵێک لـە ڕۆژی جـێـژندا لە بیـست و یەکی ئادارێدا مـەجلیـسی عـەشـیـرەتی بـەرۆدار لە دیوەخـانی خـانۆ کـۆدەبووەوە و لەوێندەرێ جـێـژنی دەکـرد. ئـەوێ ڕۆژێ دەوڵەمـەند و دارا و دووکـاندار، بازرگـان و پیـاوماقـووڵانی شـاری قـەڵا دەهاتنە دیوەخـانـێ، بۆ خـزمـەت خـانۆ و جـێـژنە پیرۆزەیان لێ دەکرد و هـەرکەسە جێژنانە و دیاریی خۆی پێشکەش دەکرد.

ئەوێ ڕۆژێ فـارس کـە پیـاوێکی بەناوبانـگ بوو و خـاوەن چەند هـەزار سـەر مەڕ گاڕان و ڕەوە بوو سەد سەر مەڕی پێشکەش کرد، گوتی:

– «ئەمن ئـەو سـەد سـەر مـەڕە بۆیە دەدەمـە خـانۆی، چونکە لە زۆرداریی شای ئێرانێمان دەپارێزێ».

هـەر ئـەوێ ڕۆژێ مـووسـای خـاوەن خـانیش دە لـیـرەی زێڕی پێشکەش کرد، گوتی:

– «ئەو دە لیـرەیە بۆیە پێـشکەش دەکـەم، چونکە لە سـایەی سـەری خـانۆی لەپ زێڕینەوە بەختەوەری و برایانە دەژین».

ئەوێ ڕۆژێ نەک هەر خـەڵکی شـار، خـەڵکی قـەزا و ناحیـە و گوندەکانیش جـێـژنانە و دیاریـی خـۆیـان هێنابوو، هـەرکـەسـێ دەهات لە خـزمـەتی خـانۆدا دەماوە و لەوێ ڕای دەبوارد.

خواردەمـەنی: پڵاو قلیانی سەر سێڵ، کەباب و میوە لەسەر سفرە و خوان دانرابوو، شـەربـەت دەگـێـڕدرا، قـاوە دەخـوراوە، لە سـاز و سـەنتـوور دەدرا، گۆرانیبێژ و خۆشخـوانان بەیت و بالـۆرە و داسـتـانی مێـرخـاسی و ڕووداوی ڕۆژگـاری ڕابردوویان دەگێڕاوە، هـەندێک بەیتی فـەقێ تەیرانیـان دەخـوێندەوە، هـەندێک داستانی مەم و زینیان دەگێڕاوە.

سەرۆک دیوەخان وەژوورکەوت، گوتییە خانۆی:

– قـوربان کێشکچی کـابرایەکی نامـۆیان گرتووە، وا هـێناویانە، هـەرچی لێ دەپرسـین متەقێ ناکا، دەڵێ: لە خزمەت خانۆدا نەبێ لە کن کەس قسە ناکەم».

خانۆ پرسیی:

- چ تیرەیە؟

سەرۆک دیوەخان گوتی:

- قوربان، کوردە.

خانۆ گوتی:

- لێی گەڕێن با بێ.

کاتێ کابرای نامۆ وەژوور کەوت دەم و کەپۆی پڕ بوو لە دووکەڵی قەندەی. کەمێکی وەستا، ئەوجا گوتی:

- سەلامون عەلەیکوم، جێژنتان پیرۆز بێ، هەموو ساڵێ بەشادی ببەنە سەر.

خانۆ سەلامی ئەستاندەوە:

- عەلەیکومە سەلام، بەخێرێی.

جێگەی نیشان دا، گوتی:

- فەرموو ڕۆنیشە.

نانیان بۆ دانا، کابرا زۆر بەتامەزرۆیی نانی دەخوارد، وا دیار بوو چەند ڕۆژ بوو نانی نەخواردبوو، خانۆ گوتی:

- «کاکە کورد گوتەنی: "لە پێشان نان خواردن، پاشان پرسیارکردن و هەواڵ پرسین". دە قسان بکە دەی، ئەتو کێی؟ لە کیهە عەشیرەتی؟ چت لێ قەوماوە، وا بەو ڕۆژە پیرۆزە لە ماڵە خۆت وەدەرکەوتووی و ڕووت لێرەکانە کردووە، بڵێ، شەرمێ مەکە، ئێمە چمان لێ هەڵستێ دریغیت لێ ناکەین. هەرکەسێ پەنای وەبەر عەشیرەتی بەرۆداری هێنابێ بێ کۆمەک نەگەڕاوەتە دواوە».

کابرای نامۆ پاش ئەوەی جامێ شەربەتی لەسەر خوان هەڵگرت، فڕی کرد، گوتی:

- «من ناوم هەمزە چاوەشە، خەڵکی وڵاتی دیاربەکرم، لە عاشیرەتی

خالدیم. چەند ساڵە، خزمەتی پادشای ڕۆمی دەکەم. ئەوە دە ساڵی ڕەبەقە چاوەشی سەربازانم، زۆرم کوڕە جحێڵان مەشق داون، گەلێکم فیداکاری بۆ دەوڵەتی ڕۆمی کردووە. پادشای ڕۆمی هەمیشە بەگژ میللەتانی دیکەیدا دەکردین و قۆشەنمان بۆ شەڕ بەڕێوە بوو. سەرکردە و مەلایان دەیانگوت: ئەو میللەتانە موسوڵمان نین، کافر و دین دوژمنن؛ دەبێ پیر و لاو و ژن و منداڵ و ورد و درشتیان قڕکەین، ئەگەر ماڵ و کلووریشیان تالان و بڕۆ کەین گوناه نییە و لێمان حەلاڵە.

ئەمنیش وەکو سەربازێکی ڕاستەقینە هەموو فەرمانێکم بەگوێ دەکردن. مەلا و سەرکردان دەیانگوتینێ:

موسڵمان هەموو برای یەکن...

ئێمەش بڕوامان بەقسەیان دەکردن، بەڵام کاتێکی لەشکری ڕۆم بەسەر وڵاتی خۆشمیدا دا و دەستیان بەکوشتن و بڕین و منداڵ سەربڕین و تالان و بڕۆ کرد، ئامۆژگاریی باو و باپیرانم وەبیر هاتنەوە: "سوڵتانی ڕۆم و پاشاکانیان هەموو دوژمنی گەلی کوردن"، ئیدی ئۆقرەم نەگرت و نەمتوانی لە نێویاندا بمێنمەوە. لە شاری ئەستەمبووڵێرا، لە نێو یەنی چەرییانەوە هەڵاتم. لەمێژبوو ناوبانگی خانۆی لەپ زێڕینم بیستبوو کە پیاوێکی هەڵکەوتوو و جێباوەڕی کوردانە و خاکی باو و باپیران لە شای ئێران و پادشای ڕۆم دەپارێزێ. بۆیە شەش مانگە ئەو هەموو چیاو بەفر و گەلی و هەڵدێر و هەزار بەهەزارانەم بڕیوە و هاتوومە کنت، خزمەتی نیشتمان بکەم و تۆڵەی ژن و منداڵی کورد و پیر و کەنەفتان بکەمەوە.

قوربان من زۆرم سەربازی سوارە بۆ پادشای ڕۆم مەشق داون، ئێستاکەش وا هاتوومە خزمەتی ئەو جەنابەی کە بەدڵێکی خاوێن و پاکەوە سەربازی کورد مەشق بدەم.»

خانۆ گوتی:

– «کوڕی خۆم، شیری دایکت پێ حەلاڵ بێ، بام تۆش لەسەر هەر شەش

کوڕەکانمەوە کوڕی حەوتەمم بی. دەستی بۆ مەجلیسەکە درێژکرد، گوتی: ئەوانە هەموویان برای تۆن.

بەڵام ئەو مەجلیسە شایەت بێ، ئەگەر نیازت پاکە ئەوا هەموو براتین، نەخێر ئەگەر غایەنی و نیهادت پیسە، ئەوە بزانە کە قەت بەرخوردار نابی و خێر لە خۆت نابینی. دە بڕۆ، کوڕی خۆم خوا بەنیازی خۆتت لەگەڵ بکا، دە بڕۆ ئەو بەرگانەت لەبەر داکەنە، با بیستووتێن بەرگێکی دیکەت وێ دەن، با بۆن و بەرامەی پادشای ڕۆممان دە نێودا نەبێ».

خانۆ بە کوڕی گەورەی فەرموو:

– «کوڕم، هەمزە چاوەش بەرنە پۆشاکخانەی دەستێ بەرگی نوێی لەبەرکەن». عەبدولعەزیز کوڕی نێونجی خانۆ و هەمزە چاوەش لە دیوەخانێ وەدەرکەوتن لە ڕێگا بارۆ، کە یەکێک بوو لە سەرۆکەکانی عەشیرەتی تاکوڕی[1].

و لەمێژبوو خۆی گەیاندبووە خانۆ، گوتی:

– ئەو پیاوە خوا بۆی ڕەخساندووین. بەڕاستی زۆرمان بەکاردێ.

جەوزۆ گوتی:

– دە وەڵڵا ئەمن دەیبەم، سەربازانم لە بۆ مەشق دا.

هەمزە چاوەش، چەند ڕۆژ لاوانی مەشق دا. ئەو خەبەرە زوو لە نێو ناوچەکانی عەشیرەتی بەرۆدار بڵاوبووەوە: یەک دەیگوت خانۆ چاوەشی لە ئەستەمبووڵێڕا هێناوە، سەربازان مەشق دەدا، یەک دەیگوت ئەوە کوردە و لە قۆشەنی ڕۆمییان هەڵاتووە، خزمەتی خانۆی دەکا.

هەموو ڕۆژێ لاو دەهاتنە کن جەوزۆ دەیانپرسی:

– هاپۆ جەوزۆ کەنگێ مەش بۆ مەشقێ کۆ دەکەیەوە، زۆرمان حەز لە مەشقێیە.

---

١ تاکور: تەرگەوەڕ.

جەوزۆ وەڵامی دەدانەوە:

– پەلە مەکەن، هەر بەو زووانە خۆم پێتان دەڵێم، با جارێ سوارە فێربن. پاشان نۆرەی پیادە دێ.

چەند مانگێک بەسەر جێژنی نەورۆزدا تێ پەڕیبوو، هەمزە چاوەش لقی جوێ جوێی لەو لاوانەی کە تازە لە ناوچە و گوندەکانڕا هاتبوون پێک هێنابوو و بێ وچان مەشقی دەدان.

ڕۆژێکی هاوینێ بوو. گەنم زەرد بووبوو، ئیدی درەوی هاتبوو. بەیانییەکی زوو هەمزە چاوەش وەدەرکەوت، گوێی لە قاسپە قاسپی کەو بوو بەیاڵ و بەندەنانەوە، لە زۆنگ و مێرگاندا دەنگی پۆڕ دەهات، وێ دەچوو تازە جووچکیان هەڵێنابێ، بۆیە بەکەیف بوون. هەمزە چاوەش ئەوێ ڕۆژێ هەرچی لاوی مەشقدراوی بوون هەمووی بردنە بەستی پشت قەڵا و دەستی بەشەرح دادانێ کرد:

– «پێویستە هەموو بزانن، کە سەربازی سوارە لە شەڕێدا ڕیزی هەرە پێشێ دەگرێ، سوار دەبێ زۆر چاک بزانێ ئەسپەکەی لە ئاستەنگدا چۆن هەڵسووڕێنێ، دەنا ئەگەر ناشی بوو سوار نییە و بەکەڵک نایە و زوو دەپێکرێ.

هەمزە چاوەش ئاژوای. سەڵەفێک بەتاو دوورکەوتەوە، پاشان دیسان بەتاو گەڕاوە. ئەو سوار چاکە لەگەڵ تاودانی ئەسپ هێند چالاکانە و بەدەستوبرد شیرەکەی بەڕاستە و چەپەیدا ڕادەوەشاند پیاو سەری لێ سوڕ دەما. سەڵەفێکی دیکەش تاوی دا، ئەوجا هەر بەسەر ئەسپەکەوە زینی لێ کردەوە و دیسان زینی کردەوە، گوتی:

– ئەمجا نۆرەی ئێوەیە، کوڕینە دەمەوێ ئەزموونتان کەم بزانم کێهەتان گورجێ ڕادەپەڕن. دە پێشدا دەبێ خێرا زین لە ئەسپان وەکەن، دیسان زینیان کەنەوە، هەنگێ سواربن، دیسان دابەزن، کێهەتان چا مەشق درابێ ئەو بەدەستوبردتر مەشق بەجێ دێنێ، دە حازر بن دەی.

هەرکە چاوەش فەرمانی دا، لاوان زینیان لە ئەسپان وەکرد، دیسان زینیان کردنەوە و سواربوون و گورج و گۆلانە پیادە بوون، ئیدی هێند بەدەستوبرد ئەزموونەکەیان دەکرد، هەمزە چاوەش لە خۆشییان پێی عەرزی نەدەگرت و لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

– ئەلحەمدولیللا، ئێوە کوردن، تورک نین. تورک نەدەوێران توخونی ئەسپان کەون، ئەوانە نازانن چۆن زین دەکرێن. بەڵێ مەشقی وان تەرزە کەسانمان دەدا! نیوەی عەمرمان بەخۆڕایی بەبا چوو.

ئەوجا بەدەنگێکی بڵند گوتی:

– «ئیدی ئێوە چا فێری شەڕە شیر و مەتاڵ و ڕمبان بوون، بەهەویام دوژمن ببەزێنن و دەرۆستتان نەیەن.»

لە پاشان لاوەکانیان کرد بە دوو لقەوە: یەکیان فێری شەڕە شیر و مەتاڵ و نێزەی دەبوون و ئەوی دیکەیان فێری ڕمبازێن و تیرهاوێشتن دەبوون، هەزار لاو، بگرە پتریش، فێری چەند مەشق و فەندی چاک بووبوون. هەمزە چاوەش هەموو ڕۆژێ دەیبردنە چۆڵ و مەشقی دەدان، جار جار تاوەکو ئێوارێ بۆ نان خواردنێی نەدەگەڕانەوە، دەیگوت:

– «با فێری برسێتیش ببن، با لە ڕۆژی ئاستەنگ و سەختدا بتوانن بەرگەی برسێتی بگرن».

هەمزە چاوەش بەفەرمانی خانۆ چەند سەربازێکی لێزانی هەڵبژاردبوو ناردبوونییە گوندە دوورەدەستەکان لاوی ئەو ناوچانەش مەشق دەن.

خانۆ هەموو ساڵێ دەمەو پایزان دەچووە ڕاوێ، دەیگوت:

– «نێچیری هاوینان بێ کەڵکە، بێچوویان هێشتا ساوان، ڕاوکردنیان گوناهە، بەلام پایزان کاری بزنەکێوی و بێچووی کەڵەکێوی هەراش دەبن، گۆشتیان خۆش دەبێ، هەنگێ ڕاو خۆشە.»

ڕاستە پایز بوو، بەلام ڕۆژگار خۆش بوو، هەتاو دنیای گەرم دادێنا. سبیانێکی زوو خانۆ لەگەڵ چەند سوارێکدا چوونە ڕاوێ، ئەوێ ڕۆژێ تاوەکو

گـەرمـای نیـوەڕۆیێ خـەریکی ڕاویێ بـوون، پاشـان هـاتنە سـەر کـانیـیـەکی حەسـانەوە. کـۆچۆ پیـاوێکی پیـری دنیـادیتـە بوو، پسـپـۆڕی ڕاویێ بوو، لە ژێر سێبەری درەختێکی زەلامـدا نێـچـیرێکی کـەوڵ کـرد، هەندێ نـەرمە گۆشتی لێ کردەوە، لەگەڵ گژوگیای بێن خۆشدا دەپێسـتێی نا. چاڵێکی قووڵی هەڵکەند و لە نێوی دانا. ئەوجـا سەری داپۆشی. کووره ئاگرێکی خۆشی لەسـەر کردەوە. پاشان هەندێ گۆشتی دیکەی هێنا کردی بە کەباب، گوتی:

– فـەرمـوون، جـاریێ بەرکـولێکی بکەن تا قلـیـانیـیـە شـوانانەکـە پێ دەگـا. نێـچـیـری ئەوڕۆش وەکـو ئـی ڕۆژانی دی نایابن. سێ بەرانـە کـێـوی و دوو کەڵەکێویی گەورەیان ڕاو کردبوو، زۆری پێ نەچوو قلیانی پێ گەیی، دەسـتیان بەقلیانی خواردن کرد، پاش دوو سێ پارووان، خانۆ گوتی:

– لەوەتـی هـەم خـواردنم لـە خـواردنـی دەشت و دەران بەتـام و خـۆشـتـر، بەتایبەتی قلیانییە شوانانە، نەخواردووە.

هـەموو گوتیان: «ئەشـەدووبیللا وایە».

پاش نانـخـواردنێ هـەڵسـتـان نێـچـیـرەکـانیـان لـە هێـسـتـران بارکـرد و بەخولامـاندا بۆ ماڵێیان ناردنەوە.

لە ڕێگا قسـەیان دەکرد: کـام تولە چاک بۆنی نێـچـیر دەکـا، کـام تاژی زوو پێشـەوەبڕی دەدا تا نێچیروان دەیگاتێ، کێهە تاژی چاپکانە ڕەدووی نێچیری ناکەوێ و پێشەبڕی نادا. کۆچۆ گوتی:

– «ئەمن لە مـنداڵیـرا تا ئەوڕۆ نێـچـیـروانـی دەکـەم، نێـچـیـروان با زۆرزان و پسپۆڕیش بێ، بەلام بێ تولە ڕاوی چاکی پێ ناکرێ. چونکە تولە بێنی تیژە و چاکتر شوێنی نێچیر هەڵدەگرێ.

یەکیان هـەڵی دایە، گوتی:

– هـاپۆ کۆچۆ، مـەڵێ لەبەر هـەندێ وەدووی تولەکە کەوتی، چووی ئەو نێرییە پیرەت بۆ ڕاوکردین، خۆ گۆشتەکەی هێند پیرە لە خواردنێ نایە.

هـاپۆ بەو قـسـانە ڕەنگی تێک چوو و مـەیلەو شـەرمـەزار بوو، خـانۆ دەیزانی

کۆچۆ دڵی ناسکە و بەچی کەیفی ساز دەبێ، گورجێ دڵی داوە، گوتی:

– نەخێر، ئەم نێچیرە لە هەموو نێچیرەکانی دیکە چاکترە، شاخەکانی بەدیواری دیوەخانێدا دادەکوتین، هەرکەسێ بیبینێ سەرسام بێ. خۆ کۆچۆ بۆ گۆشتەکەی ڕاوی نەکردووە؟ بەڕاستی ئەمن قەت شاخی وام نەدیوە.

نازانم چۆنی هیشک کەینەوە؟

کۆچۆ ئەو قسانەی زۆر بەدڵ بوو، گوتی:

– من بۆ خۆم بانگی یەک لە بەگزادان دەکەم، بۆمان چا کا، ئەمە کاری وانە. ئیدی بەدەم سوحبەت و ئاخاوتنەوە خۆشیان نەیانزانی چۆن گەیینە نێزێکی قەڵای، لە پڕ غەڵبە غەڵبێک پەیدا بوو، پاشان خانۆ گوێی لە پێکەنین و هەڵلایێ بوو، خەڵکەکە دەیانگوت: «ئافەرین، ئافەرین».

خانۆ پرسی:

– «ئەو دەنگە چییە؟»

خولامان گوتیان:

– «ئەوە دەنگی سەربازانە، لە پشت ئەو تۆپۆڵکەی، هەمزە چاوەش مەشقیان دەدا».

خانۆ بەرەو وێ دای کێشا، کە لەگەڵی وەسەرکەوتن واقیان وڕما، تەماشایان کرد خەڵکێکی زۆر لە قەلا و گوندەکانی دەوروبەریڕا هاتبوون دەیاننۆڕییە ئەزموونی مەشقێ. لاوان ساڵێک پتر بوو مەشقیان دەکرد. ئەزموونەکە هێند خۆش بوو نەیزانی کەنگێ خانۆ گەیوەتە ئەوێ. لە نێو سەیرکەراندا زۆر مێرخاسی وا هەبوون کە لەگەڵ خانۆدا گۆی گەڕناسییان بردبووەوە و لە نێو سوپای ئێران و ڕۆمیدا نێوبانگی ئازایەتییان ڕۆییبوو.

هەرکە خانۆیان دیت ئیکلامیان بۆ کێشا، ئەویش بۆی ساندنەوە، گوتی:

– «چۆنیان دەبینن، بەکاری شەڕ دێن؟»

پیرەکان دەستیان بەپێکەنین کرد، یەکیان گوتی:

– «خراپ نین بۆ سەر شا عەباسیان بنێرین. بەڵام ئێمە هاتووین سەیری مەشق بکەین».

خانۆ پرسی:

– «چاکە، ئەدی مەشقیان چۆنە؟»

– چ کەموکورتیی نییە، بنۆڕە چ نەبەردییەک دەنوێنن، بەڕاستی هەمزە چاوەش ئەفسەرێکی بلیمەتە.

هەندێ سەرباز سوارە بوون، هەندێ ڕمبیان پێ بوو، هەندێکی دیکە لە دوور ڕاوەستابوون، پیادەی کەوانداران بوون. مەیدانی مەشق ئەزموونکردن لێڕەوار بوو، بەگرێ و کۆسپ بوو، هەندێ جێی تووش و ڕەقەن بوو، وا دیاربوو هەمزە چاوەش بەقەستی ئەو جێگای بۆ ئەزموون دەستنیشان کردبوو؛ دەیگوت دەبێ سەرباز شارەزای شەڕی هەموو جێگایان بێ. هەمزە چاوەش بۆ خۆی لە دوورەوە وەستابوو، بەدەنگێکی نێرانە بانگی ڕاهێشت:

– «ئامادەبن!»

سەربازان تێکڕا ڕیزبوون، ئینجا گوتی:

– «هێرش بۆ سەر دوژمن!»

سەرباز هێرشیان برد و تێک بەربوون، دەتگوت شەڕی ڕاستەقانییە.

هەمزە چاوەش بانگی کرد:

– «یوسف، ڕۆستەم، ڕمب وا ناگیرێ، ڕمبەکانتان چاک لە کەلەکەتان بچەسپێنن. ئەوە چییە، دەڵێی گاڕامتان بەدەستەوە گرتووە و گا لێ دەخوڕ. چما ئێوە گاوانن! ئەوە شەڕە شەڕ».

سەیرکەر هەموو دایانە قاقای پێکەنین.

لەو ئەزموونەدا زیرەک و وریای وا هەبوون زۆر چالاکانە فێری هێرش و پەلاماردان بووبوون و پیاو سەری لێیان سوڕ دەما.

هەندێ ملی هەندێکیان دە کەمەند خست و گرتنیان، ئەوانیش گورجێ

هاتنەدەست و قەمەیان لە کەمەندان نا و هەڵیان بڕی، ملی خۆیان ڕزگار کرد.

خانۆ ئەو ئەزموونەی زۆر بەدڵ بوو.

هەمزە چاوەش دیسان بەدەنگێکی نێرانە بانگی ڕاهێشت:

– «بەسە، بکشێنەوە، حەسانەوە».

لە پاشان تیپی پیادەی سەربازان بەتیر و کەوانەوە هاتنە مەیدانی ئەزموونێ، هەریەکە لە ڕاستی خۆیەوە تیری لە کەوانی خست و درەختی نێو لێڕیان تیرباران کرد. ئەوەش مەشقێکی زۆر خۆش بوو.

ئینجا پاش ئەزموونی چەند مەشقێکی دیکە، هەمزە چاوەش ئەوانیشی وەستاند، گوتی:

– «من لە ئەزموونی ئەوڕۆتان زۆر ڕازیم. بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێم کە: هەندێکتان هێشتا بەدڵم نین و چەک جوان هەڵناگرن و باشی بەکار ناهێنن. ئەوانە لە شەڕێدا ئابروویان دەچێ و دوژمن زوو زەفەریان پێ دەبا. شەڕکەر دەبێ زۆر وریا بێ، دەبێ بزانێ چۆن ڕمب دەگرێ و بەکاری دێنێ».

هەمزە چاوەش پێی لە ئاوزەنگی نا و تێی تەقاند، کە بەتاو گەڕاوە ڕمبەکەی لە بن هەنگڵی توند کردبوو و خۆی بەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە وا چەسپاندبوو دەتگوت هیچ بەسەر ئەسپەکەوە نییە. ڕمبەکەی ڕەپ و ڕاست گرتبوو؛ کە نیزیک دەبووەوە، دەتگوت تیتکی کوێلەیە و هێندەی دیکە خۆشەویستتر دەبوو و دەچووە دڵەوە.

پاشان لەپێش دەمی لاوەکان ئەسپەکەی وەک مێخی چەقاند.

سەعاتێک پتر بوو خانۆ سەیری سەربازانی دەکرد. بەڕاستی ئەو مەشقانەی هەمزە چاوەشی زۆر لا پەسند بوو. ڕووی لە خەڵکەکەی دەوروبەری کرد، گوتی:

– بڕیارم دا هەر لاوێ پیادەیە ئەسپێکی لە ڕەوەی خۆم بدەمێ، با هەموو ببنە سوارە. ئافەرین بۆ هەمزە چاوەش، بەڕاستی مامۆستایەکی لێزانە.

پاشان فەرمانی بەمیرئاخوڕی دا، گوتی:

– عەدی، ئەورۆ بەرەوکەوانان بڵێ با ڕەوەی بێنێتەوە نیزیکی شار و لاوان بێن، هەرکەسە ئەسپی خۆی هەڵبژێرێ.

هەمزە چاوەش درەنگ زانی خانۆ لە نێو خەڵکەکەدایە، هێواش هێواش بۆ کن لاوەکان دێ. خانۆ نیزیکی تیپی کەوانداران بووەوە، بەپێکەنینەوە گوتی:

– ئەوە بۆ پیادەن؟

کوڕێکی ڕوو لەبەر هەتاو هەڵقرچاوی قژ سووربۆوی چاو خڕ و شین بەدەنگێکی گڕ گوتی:

– «گەورەم، تۆ بابی هۆزی، ئەگەر ئەسپمان بوایە هەڵبەت بەپێ نەدەڕۆیشتن و سوارە دەبووین. بەڵام ئەسپمان نییە، یەکیان خۆمم لە هێسترێک زیاترم نییە، ئیدی سواری چبم.»

خانۆ گوتی:

– «هەرکەسێ ئەسپی نییە، با بێتە کن عەدی میر ئاخوڕی، بچتە نێو ڕەوەی ئەسپێکی بۆ خۆی پەسند کا. بەڵام دەبێ سەر و کەمەند لەگەڵ خۆیدا ببا، دەنا ناتوانێ ئەسپ بگرێ؛ چونکە ئەو ئەسپانە هەمیشە بەرەڵلا بوون و بەیدەسن و بەئاسانی بۆتان ناگیرێن دەبێ ئێوە بۆ خۆتان ڕایان بێنن.»

لاوەکان بەقسەکانی خانۆ زۆر دڵخۆش بوون و وەکو گوڵی تازە پشکوتوو ڕەنگی ئاڵ لە ڕوویان زا و زەردەخەنە لەسەر لێویان وەچریسکە کەوت و لە خۆشییان ورتە لە دەمی شتاقیان نەهاتە دەر، تەنیا کوڕە سوورفلەکە نەبێ هاتە دوو، گوتی:

– «ئێمە هەموو خولامی تۆین، بەڵێن و بڕیار بێ ئێمەش وەکو باو و باپیران لە پێناوی کورد و کوردستاندا بجەنگێین.»

خانۆ گوتی:

– «بەرخوردارین.»

ئەوجا هەمزە چاوەش لە نیزیکەوە ئیکلامێکی سەربازی بۆ خانۆ کێشا. دەستی لە ڕاستی ناوچاوانی ڕاگرت و سینگی دەرپەڕاند و خۆی گیف کرد،

گوتی:

– ب«ەسەرچاوان هاتی قوربان،»

– «لاوی خۆم ماندوو نەبی،»

– «خودا پایەدارت کا قوربان، خولامی تۆم.»

– «ئەو مەشقانەی تۆ دەیدەیە لاوان بەڕاستی شتێکی زۆر چاکە و زۆرم پێ خۆشە. ئەگەر هەندێ لە هۆزە کوردەکان غایەنەتییان لە گەلەکەیان نەکردبا، نە شای ئێرانێ، نە پادشای ڕۆمێ، نەیاندەتوانی بێنە سەر کوردستان. بەڵام بەداخەوە خۆ بەخۆ غایەنین.»

خانۆ زووتر گەییە نێو سوارەکان، هەمزە چاوەش وەدووی کەوت، لە پشتەوە ئیشارەتی کرد کە هەموو ئیکلامێ بۆ سەرداری بکێشن. هەمزە چاوەش زوو فێری کردبوون چۆن ئیکلام بۆ سەرداران دەکێشرێ؛ چونکە زۆر جار جەوزۆ، سەرکردەی سەربازان دەهاتە ئەوێ و بەبۆنەی وییەوە فێری ئیکلام کێشان بووبوون.

خانۆ گوتی:

– «سەلامون عەلەیکوم.»

– «عەلەیکومە سەلام و بەسەر هەرتک چاوان هاتی قوربان.»

– «سەرباز هەموو بەئیکلامەوە وەستان.»

خانۆ وەکو هەڵۆ چاوی بەڕیزی لاوەکاندا خشاند و هەردوو کوڕە چکۆلەی خۆشی لە بەینی سوارەکاندا دیتن. ئەوجا گوتی:

– «ڕاسپاردەی باو و باپیرانە دەبێ ئەو نیشتمانەی بپارێزین. شا عەباس و پادشای ڕۆم هەمیشە هەوڵی ئەوەیانە کە لە بن باندووری خۆیانمان خەن، بەڵام تا ئێستا نەیانتوانیوە ولاتمان لێ داگیر بکەن، بڕوام وایە ئێستاش هەر ناتوانن. ئێوەش دەبێ ڕاسپاردەی باو و باپیران لە بیر نەکەن.»

کە لە مەشقان دەبوونەوە لاوان هەموو دەکەوتنە جلیت و تەڕات و ڕمبازی و بەدەم لاوژە و گۆرانییەوە، بەگاڵتەوگەپ و قسەی خۆش بەرەو شار

دەگەڕانەوە.

ئەمڕۆش وەکو جاران هەمزە چاوەش گوتییە لاوان:

– «سوارچاکینە، ئێوە جلیتبازیی خۆتان بکەن. پیادەینە، ئێوەش گۆرانی بڵێن و هەڵپەڕن و وەسەمایێ کەون.»

ئەو قسانە دڵی لاوانی هێندەی دیکە خۆش کرد. هەمزە چاوەش دەستی هەڵبڕی، ئیشارەتی کرد، دەهۆڵکوت و زوڕناژەن دەهۆڵان بکوتن و زووڕنایێ بژەنن. دەهۆڵکوت و زوڕناژەن لە ئیشارەت گەیشتن، دەهۆڵیان کوتا، زوڕنایان ژەند. دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا لاوانی هێنا جۆش و هەوەس. لە هەمووان سەیرتر ئەوە بوو کە ئەسپان مەقامی جلیتبازییان وەبەر گوێ کەوت دایانە حیلە حیل و سمکۆڵ. سەرکێشییان دەکرد، جڵەویان لە دەست سواری دەترازاند، مەڵێ، ئاڵهای ئاوازی جلیتبازییان دەکرد. بەڵام تەڕات و جلیتبازیی ئەوێ ڕۆژێ وەکو ئی جاران بێ مەقام و بەند نەبوون، بەپێی بەند و نۆرە و پێڕۆی تایبەتی بوون. دەستە سوارێ بەڕیز وەتەڕات دەکەوتن و لەسەر پشتی ئەسپان یاریی جوان و هونەری شۆڕە سوارانەیان پیشان دەدا، دەستەیەکی دیکە بە شیر و مەتاڵ و ڕمبان هەڵیان دەکوتا سەر یەکدی و تێک دەگیران، لە دووڕرا دەتگوت شەڕی ڕاستەقانییە. کەوانداران ئەوێ ڕۆژێ کەیفیان زۆر سازتر بوو، هێند بەتوندی چۆکیان دادەدا هەردیان دە ژێردا دەلەرزی. خانۆ موژدەی خەڵاتی ئەسپی دابوونێ.

ئێوارێ داهات، ڕۆژ لە پشت چیاکانرا لە ئاوابووندا بوو. هەمزە چاوەش فەرمانی دا:

– ئیدی بەسە، لەسەرەخۆ بەرەو قشڵەی بڕۆن.

خانۆ لەگەڵ پیاوەکانیدا لە دوورەوە وەستابوون تا لاوان لە سەما و ڕمبازییان بوونەوە. پاشان، تیپ تیپ بەڕیز و لەسەرەخۆ بەرەو قەڵای دمدم گەڕانەوە و بەو دیوی تەپۆڵکەیدا ئاوابوون. بەڵام خانۆ هێشتا هەر وەستابوو بیری دەکردەوە، بیری لە گەلی کورد دەکردەوە کە شای ئێران و پادشای ڕۆم

چییان بەسەر هێناوە و ژن و منداڵ و خاوخێزانیان بەچ دەردێ بردوون.

یەک لە هاوڕێیانی بەدەنگی بڵند گوتی:

– «بەڕاستی مەشقی چاکن.»

خانۆ وەکو لە خەوێکی شیرین وەخەبەربێ، گوتی:

– «ڕاست دەڵێی. فەرموون با ئێمەش بگەڕێینەوە ماڵێ.»

***



بەشی چوارەم

# بەزمی دەروێشان

ڕۆژێکی گەرمی هاوینێ بوو مانگی گەلاوێژ، کە ناوەند مانگی هاوینە، ئاخر و ئۆخری بوو. باخ و باخاتی گوندەکاتی داوێنی قەڵای دمدم فراژی بووبوون و میوەی هەمە تەرزەی وەکو سێو و هەرمێ و ئی دیکە دووکانی بازاڕی قەڵایان پڕ کردبوو. میوەفرۆش هەموو ڕۆژێ گوێدرێژ و هێستریان لە سەبەتە و قەرتاڵ و بەرچنە میوە بار دەکرد، بۆ نێو کۆچەر و ڕەوەندی سەر چیا و کوێستانە بەرزەکان دەبرد، یا دەیانفرۆشت، یا بە ڕوون و پەنیر و خورییان دەگۆڕینەوە. بەڕاستی سەردەمێکی خۆش بوو.

ڕۆژێکی دە دەروێشی نامۆ لە نێو بازاڕی قەڵای دمدم« پەیدابوون، یەکێکی زەبەللاحیان لەگەڵ بوو تازە داو مووی سپی کەوتبووە ڕدێنی، ئەوانی دیکە لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵ و سی ساڵدا بوون، زۆر بە شان و شەوکەت بوون، لە قامکی ناسک و سینگ و پێی گۆشتنت دەنۆڕین دەتگوت، ڕەنگە قەتیان خۆ بەهیچ کارێکەوە ماندوو نەکردبێ و هەمیشە تەمبەڵ و تەوەزەل بە دەسی بەتاڵی وەکو تەڕاحان سووڕابنەوە. لاوێکی زۆر شۆخیان لەگەڵ بوو، تەمەنی هەر حەڤدە، هەژدە ساڵێکی دەبوو.

خەڵکی قەلایێ سەریان لەو دەستە دەروێشە سوڕمابوو؛ چونکە قەتیان دەروێش لە نێودا هەڵنەکەوتبوو. ئەو دەروێشانە بەڕۆژ لە نێو بازاڕی لە مەیدانی ئاژەڵفرۆشان دەستیان بە زیکر و سەمایێ دەکرد. کە ئێوارێ

دادەهات لەو خانی لێی دەنوستن، خەڵکیان بەسەردا دادەباری و تەماشای سەما و بەزم و ڕەزمیان دەکردن، فەند و ئیجادی ئەو دەروێشانە شاری قەڵای خرۆشاندبوو، سەما و زیکرەکەیان هێند خۆش و بەجۆش بوو گەورە و بچووکی شاری وەجۆش هێنابوو و هەموو دەهاتنە تەماشایێ. هەرکە وەزیکر و سەمایێ دەکەوتن، دەبووە هەنگامەیەکی ئێجگار سەیر و سەمەرە. یەک شمشاڵی دەژەنی، یەکی دی لە دەفێی دەدا، ئەوانی دی وەکو سەربازی مەشقداری وەسەمایێ دەکەوتن. جارێکی بەچەپڵە لێدانێ دەستیان بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوە، جارێکی نەوییان دەکردەوە، ئیدی ئەم سەما سەیرە هێند بەجۆش بوو، نەبوو هەوەس و ئارەزووی پێ نەبزوێ و نەیەتە تەماشایێ.

پیری گەورەیان فەرمانی دا سەما بکەن، ئەڵقەیان بەست، وەکو خولخولۆکەی منداڵان دەستیان بەخولانەوە کرد.

مانگێ بوو ئەو دەروێشانە بەزمی سەیروسەمەرەیان نیشانی خەڵکی دەدا جار جار پیریان دەمی پڕ ئاگر دەکرد، خەڵکەکە هێندەی دیکە بەجارێ سەریان لەوە سوڕ دەما کە چۆن دەمی ناسووتێ. جارێکی ئێوارێ بوو، هاتوچۆ لە کووچە و کۆڵان و بازاڕ کەم بووبووەوە، ئەوێ ئێوارێ خورشیدی بازاڕباشی وەکو جاران لەگەڵ خوڵامان بەگوزەر و کووچاندا دەگەڕا نەبا خراپەیەک، نەپیاوییەک ڕوو بدا، ڕوانیی دەروێشەکان لە پێش دەمی کارگەی چەکسازیدا ڕاوەستاون و ئاوڕ لە دەوروبەری خۆیان دەدەنەوە، لێیان بە شک کەوت، لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەوانە بەو ئێوارە درەنگەی چ دەکەن لێرە؟ خۆ کەسیش لە کووچان نەماون، بڵێین بەزم و ڕەزمیان بۆ بگێڕن".

بەڵام لە پاشان تەماشای کرد دەروێشە لاوەکە لە کارگەی وەدەرکەوت، هەموو پێکەوە بەڕاکردن تێیان تەقاند و ڕۆیشتن. خورشید کەمێ خۆی دواخست ئینجا لە دوای وانەوە چووە ژوورێ بۆ نێو کارگە، تەماشای کرد سەروەستا لەوێ نییە و شاگردەکان بە تەنیان.

شاگرد خەریک بوون دەزگا و ئامێریان دەپێچاوە و خۆیان بۆ ماڵێ ئامادە دەکرد. کاتێکی خورشید هاتە ژوورێ یەکسەر هەموو لەبەری هەڵستان،

دەیانزانی خانۆ ئەمن و ئاسایشی نێو شاری بەخورشید سپاردووە، کەس ناتوانێ خراپە و ناپاکی بکا، دەیانزانی حەسەنی ئاوکێش لەسەر دزی دەستیان بڕیبوو و لە شەرمان دەستی لە گیرفانیدا دەشاردەوە. مەجلیسی خانۆ لەمێژبوو یاسای دەرکردبوو کەسێک دزی بکا دەستی ببڕن.

خورشید قەدەرێ تەماشای کردن، ئەوجا گوتی:

– «کوا سەروەستا لە کوێیە؟»

شاگردێکی کەڵەگەت گوتی:

– «وەستا لێرە نییە، چووەتە ماڵێ.»

– «ئەو دەروێشە بۆچی هاتبوو بۆ کنتان؟ چیی دەویست؟»

کوڕە کەڵەگەتەکە گوتی:

– «چی نەدەویست، هەر پرسیی: ئێوە چ جۆرە چەکێکی دروست دەکەن، چەند کەس لەو کارگەیە کار دەکا؟».

خورشید لە کارگە وەدەرکەوت، بەدەو بۆ ماڵێ گەڕاوە. ئەو نەیدەزانی ئەوانە ڕەنگە پیاوخراپ بن؛ بۆیە لە کن کەس دەنگی نەکرد. دەنگوباسی بەزم و ڕەزمی ئەم دەروێشانە لە هەموو گوندەکانی دەوروبەری قەڵا بڵاو بووبووەوە، خەڵکی ئەو گوندانە هەموو ڕۆژێ دەستە دەستە دەهاتنە شار و تەماشای بەزم و سەمەرەی دەروێشەکانیان دەکرد زۆر بەشەوقەوە دەیانڕوانییە حای و حوویان، بەڵام پاش ئەوەی کە پشوویان دەدا، کەشکۆڵیان لە مل دادەماڵی و لە خەڵکیان دەگرتەوە و دەپاڕانەوە:

– «ماڵ ماڵی خوایە، سەخی خۆشەویستی خوایە، هەرکەسێ زێڕێکی، دراوێکی لە کەشکۆڵی ئەو دەروێشانە باوێ خوا پڕ بەو کەشکۆڵانەی زێڕ دەداتێ. کەس نەبوو لەو خێرەی دوودڵ بێ و بڵێ نەء، هەموو بەدڵێکی پاکەوە دراویان لە کیسان دەردێنا و لە کەشکۆڵانیان داوێشت، خەڵکەکە زۆریان حەز لە سەما و زیکر و فیکری ئەو دەروێشانە بوو، هەرچییەکیان دەکرد پێیان خۆش بوو. زمانیان نەبێ کە کوردان حەزیان لێ نەدەکرد و زمانی داگیرکەر و

زۆرداران بوو، ئیدی کەیفیان بەهەموو بەزمێکیان دەهاتەوە.

جارێکی خانۆ و جەوزۆ لەگەڵ چەند پیاوێکی جێبڕوای خۆیاندا بۆ ئەشکەوتێ چوون. ئەوێ ڕۆژی دەبوو تۆپی تازە داڕێژراو ئەزمـــوون بکەن، وەختێ نیزیکی ئەشکەوتێ بوونەوە، خانۆ تەماشای کرد دەروێشەکان لەبەر دەرگەی قەڵاوە تێ دەپەڕن، لە پیاوەکانی پرسی:

– «ئەو دەروێشانە لە چ دەگەڕێن؟ ئێرە ئەم پەڕی شارە، خۆ خەڵکی لێ نین یاری و بەزمیان بۆ بگێڕن؟»

کەس وەڵامی نەداوە.

ئەوجا کە لە دەرگەی ئەشکەوتێ نیزیک بوونەوە سەیفەدینی کوڕی، کە گەورەی یاساوڵی ئەشکەوتێ بوو، بەپیرییەوە هات، پرسی:

– لاوۆ، ئەم دەروێشانە چییان دەکرد لێرە؟ خۆ نەچوونە نێو ئەشکەوتی؟ سەیفەدین بەئیکلامەوە، گوتی:

– «نا کاکۆ، هەر لەبەر دەرگە ڕاوەستابوون، یاساوڵەکان زۆریان گوێ نەدانێ، ئەمن تێم ڕاخوڕین: بۆچی دەریان ناکەن، ئەمانە کاریان چییە لێرە؟» یەکیان گوتی:

– «قوربان، بەئایینی ئیسلامەتی دەروێش بۆیان هەیە لە هەموو شوێنان سەربەست بگەڕێن، ئەگەر دەریانکەین گوناە نییە؟»

بەڵام ئەمن لێیان تووڕە بووم، دەرم کردن.

خانۆ بەو قسانە کەوتە مەراقێ، شکی بردنێ پیاوخراپ و جاسووس بن. گورجێ خوڵامێکی بەدوای خورشیدی بازاڕباشیدا هەنارد: هەر ئێستا بێ، هەرکە خانۆ وەژوورکەوت خاچۆ بەپیرییەوە هات، گوتی:

– «فەرموو قوربان، یاخوا بەخێربێی، بەسەرچاوان.»

– «چاوت خۆش بێ سەروەستا. ئافەرین بۆ دەستڕەنگینی و هونەرت. تۆ دەزانی کورد و فەلە دۆستی لەمێژینەی یەکن، ئەو قەڵایەش هەر فەلەیەک بۆی بینا نام.»

خاچۆ گوتی:

– «قوربان منیش ئەو وەستایەم بیستووە بابی لە گۆلی وانێ کەنیشتەیەکی بینا ناوە دەڵێی کوتومت قەڵایە. قۆشەنی پادشای ڕۆم چەند جاران بەقایەغێ هێرشیان هێنا سەر، چەند تۆپیان پێوە نا، بەڵام هیچیان پێ نەکرا.»

خانۆ دەستی خستە نێو دەستی خاچۆ، پێکەوە چوونە نێو ئەشکەوتێ، نۆڕی ئەو تۆپانەی تازە بۆ ئەزمــوونێ داڕێژرابوون لە تۆپەکانی جاران زۆر گەورەترن. لە خاچۆی پرسی:

– «ئامادەی ئەورۆ ئەو تۆپانە ئەزموون کەین؟»

ڕاستە خانۆ لە تۆپەکانی دەنۆڕی، بەڵام بیری هەر لە کن دەروێشەکان بوو. خاچۆ گوتی:

– «قوربان بۆچی ئەو ئەزموونە نەخەینە ڕۆژی هەینی.»

– «با ڕۆژی هەینی بێ، بە تایبەتی ئەو ڕۆژە خەڵکێکی زۆر دێنە شار.»

خانۆ لە کارگەی وەدەرکەوت. خورشید تازە گەییبووە بەردەرگە.

خانۆ خورشیدی برد بەو لاوە، گوتی:

–«لە بارەی ئەو دەروێشــانەوە قســەت لەگــەڵ دەکــەم، تۆ دەزانــی ئەمــانە پیــاوخــراپن. ئەمن کەمێ پێش ئێســتا هاتم دەروێشــەکانم لێرە دیتن، خــۆت دەزانی ئێرە کەمی هاتوچۆ بەسەرەوەیە، کاریان لێرە چییە؟ تۆ دەزانی ئەوە چەند جارە شا عەبباس جاسووسمان دەنێرێتە نێوێ بەسرمان بزانێ، خۆت دەزانی ئەمانە چ ماڵێکن.»

خورشید گوتی:

– جارێکی، حەوتوویەک دەبێ، ئێواریێ بوو، بازاڕ و دووکان پێوەدرابوون، من ئەم دەروێشانەم لە بەردەرگەی چەکسازیدا بینین، دەروێشە لاوەکەیان لە کــارگــەڕا دەهاتە دەرێ، هەرکــە ڕۆین، ڕاســتــیت دەوێ ئەمنیش گــومــانم لێ کردن، ئیدی دوا بـەدوایاندا چوومە ژووریێ بـۆ نێو کارگەی، بەڵام سـەروەستا لەوێ نەبـوو، لە شــاگــردەکــانم پرسی: ئەو دەروێشــە بۆچی هــاتبــووە کنتــان؟

شاگردەکان گوتیان:«هیچی نەدەویست، هەر لێی پرسین، ئێوە لێرە چ جۆرە چەکێکی دروست دەکەن؟ ئیدی لێی دا ڕۆیی.»

خانۆ پرسی:

– «چاکە، بۆ تا ئێستا خەبەرت نەداومێ؟»

ئەوجا فەرمانی دا:

– «بڕۆ، هەمووویان بگرە لە زیندانییان کە، بزانە کێ ناردوونی و بە چ نیازێکەوە هاتوونە ئێرە؟ دەبێ بەتەواوەتی بزانی بۆچی هاتوون؟ تۆ بۆ خۆت دەبینی بە چ فێڵ و تەڵەکەبازییەک هاتوونە نێومان و چۆن هەموومان فریو دەدەن، هەبێ، نەبێ، ئەمانە جاسووسی شا عەباسن دە خێرا بڕۆ تا بەلایەکدا نەچوون.»

خورشید پێی لە ئاوزینگی نا و سواربوو و لەگەڵ خولامەکانیدا بەغار بەرەو بازاڕ چوون، بەڵام دەروێشەکان دیار نەبوون. خێرا چوونە مەیدانی ئاژەڵان، لە وێندەرێش نەبوون. خورشید ترسی لێ نیشت و کەوتە بیرکردنەوە: "کەواتا هەڵاتوون". خورشید هەر بەر دەرگایەکی یاساولێکی لێ ڕاگرت خەبەری بە دەرگەوانان بدەن نەهێڵن لە قەڵای دەدەرکەون، گوتی: «هەرچی هات بیگرن».

ئەو خەبەرە وەکو بای بهارێ بەنێو شاردا بڵاو بووەوە خەڵکی بەیەک دەنگ هەمووو دەیانگوت: "بەقوربانە بیانگرن". هەندێ دەیگوت: «جادوو و ئەفسوونیان کردووە». هەندێ دەیگوت: «خەزێنەی خانۆیان بڕیوە و پارەیان دزیوە». ئیدی هەر کەسە لە خۆیەوە شتێکی دەگوت.

خورشید لە کۆڵانێکدا تووشی خەلیلی بەیتاڵی هات، گوتی:

– «خەلیل، ئەتوو ئەو دەروێشانەت نەدیون.»

– «بەڵێ قوربان، ها ئێستا لە کنیانەوە دێم.»

خورشید بەدەنگێکی لەرزۆک پرسی:

– «لە کوێن؟»

– «وان لە چێشتخانەکەی عەلی ئەکبەری ئازەربایجانی، کاوڕێکیان سەر بڕیوە خەریکن کەباب و قلیانی سەر سێڵی دەخۆن.»

خورشید کە بەوەی زانی، تەزووی شادی بەلەشیدا گەڕا و دای قەڵاشت، چووە بەردەرگەی چێشتخانەی عەلی ئەکبەری. کوڕێکی سوورکەلە بوو، بەینی لەگەڵ بازاڕیاشیدا زۆر خۆش بوو، سڵاوی کرد، عەلی ئەکبەری سڵاوی ساندەوە، گوتی:

– «یاخوا بەخێربێی، بەسەرچاوان، فەرموو گەورەم.»

دەروێشەکان ئاگایان لە چ نەبوو، تەنانەت سڵاوەکەی خورشیدیشیان نەستاندەوە، هەر مڵچی دەم و تیکەیان دەهات، هەریەکە بنچکێکی گۆشت کاوڕ بەدەستەوە بوو ئێسکیان دەکرۆسییەوە، عەلی ئەکبەر بەدڵێکی شاد و دەمێکی پڕ خەندەوە گوتی:

– «قوربان فەرموو بەرەژوور.»

خورشید بەدەنگێکی ڕەسمییانە و توند گوتییە عەلی ئەکبەری:

– «زۆر سوپاس عەلی ئەکبەر، کارێکی زۆر بەپەلەم هەیە.»

عەلی ئەکبەر لە دەم و دووی ئەم جارەی خورشید سەرسام بوو، خورشید قەت عەلی ئەکبەری بەم جۆرە نەدواندبوو. خورشید وەدەرکەوت، گوتییە خوڵامان:

کە دەروێشەکان دەگرن دەف و بلوێریان هەموو لێ بستێنن، زیندانیان دەکەین. کاتێکی خورشید خوڵامانی تێ دەگەیاند، خێڵێک لەوێرا تێ دەپەڕی. ئەو خولامانەی خورشید بۆ کن دەرگەوانانی ناردبوون گەڕانەوە. خورشید لەگەڵ چەند خوڵامێکدا گەڕاوە و هاتە چێشتخانەی، گوتی:

– «دەروێشینە، لە فراوینێ بوونەوە یان نا؟»

دەروێشەکان وەڵامیان نەداوە. ئیدی خەریک بوون لە چێشتخانە وەدەردەکەوتن، دەستوبرد هەموویان گرتن بردنیان لە زیندانێیان کردن.

چەند ڕۆژ بوو دەروێشەکان لە زیندانێدا بوون. هەرچەندیان لەگەڵ

دەکردن و دەکۆشان ڕاستییان نەدەدرکاند و ددانیان بەوەدا نەدەنا کە جاسووسن. خورشیدیش هەموو ئێوارەیەک دەهاتە خزمەت خانۆ و دەیگوت:

– «ئەمانە ڕاستی نالێن و پێ لە گوناهی خۆیان نانێن.»

خانۆ گوتی:

– «سبەینێ مەجلیسی ڕدێن سپییان دەگیرێ بیانهێننە دیوەخانێ.»

ڕۆژی چێشتەنگاوێکی قایم بوو لە دیوەخانێ کۆڕی ڕدێن سپییان بەسترا. ئەندامان و گەورە و دەمڕاستی تیرە و هۆزان هەموو هاتن. هەموو لەوەی دڵنیابوون کە ئەو دەروێشانە جاسووسی شای ئێرانن، بەڵام دەیانویست خۆیان پێ لە گوناهی خۆیان بنێن و بڵێن جاسووسین.

هەندێ پیرەمێرد هەبوون بڕوایان نەدەکرد، دەیانگوت: «دەروێش هەمیشە خەریکی خواپەرستین و ڕۆژێ پێنج جاران نوێژێ دەکەن، تۆ بڵێی شتی وا بێ خواییان لێ بوەشێتەوە.»

خانۆ هەستی بەوە کردبوو کە زۆر کەس هەن بڕوا ناکەن.

لە نکاوێ دەرگەی دیوەخانێ کراوە و دەروێشەکانیان لەبەر شیپانەوە ڕاگرت. دەستیان لە پشتەوە بەسترابوو. خانۆ ئەمری کرد:

– «دەستیان بکەنەوە.»

دەستیان کردنەوە.

خانۆ تێیان ڕاما، گوتی:

– «بەرەژوورتر وەرن، بۆ نێوەڕاستی دیوەخانێ.»

پیری دەروێشان لە پێشی ڕاوەستابوو. چەند ڕۆژ بوو، لە زیندانێدا بوون، ڕەنگیان پەڕیبوو، دەتگوت نەخۆشییەکی زۆر گرانیان گرتووە. هاتنە نێوەڕاستی دیوەخانێ ڕاوەستان.

خانۆ گوتی:

– «ئەوە مانگێ پترە ئێوە لەو شارەی مەدا خەریکی زیکر و سەماکردنێن و

بەزم و ڕەزمـان دەگێڕن و حـاڵتـان لێ دێ، دەبا ئەمـجـارەش حـاڵتـان لێ بێ و ڕاست و دروست پێـمـان بڵـێن: کێ ناردوونی؟ بە چ نیـازێکەوە هـاتوون؟ بڵـێن، بڵێن.»

دەروێشەکان متەقیان نەکرد، پیر نەبێ، گوتی:

– «قـوربان زیکر دەکـەین، بـەڵام دەف و بلوێرەکـانیـان لێ ئەسـتـانـدووین بفەرموون وێمان دەنەوە، هـەنگێ چەند کۆڕێکی زیکر دەبەستین، ناردیان دەف و بلوێریـان بۆ هێنانەوە. پیـر دەفی دا بەدەسـتی یەکـیـان و بلوێرەکـانیـشـی دا بەدەسـتی دووی دیکەیـان، ئەوجـا هـەندێ دۆش دامـا و پـاشـان دەم و لـچی جـووڵاندەوە دەتگوت شـتـێک بەدەروێشـەکـان دەڵێ. دەروێشـەکـان لێی قـیچ بووبوونەوە، سەیریان دەکرد. پیر لەنکاو هاواری کرد "حوو، حوو، حوو". ئیدی دەسـتـیـان بەدەف لێـدان و بلوێر ژەنینێ کـرد. دەروێشـەکـان کەوتنە سـەمـا و زیکر کردن.

پیـر لە پێش هەمـوویانەوە بـوو. سـەمـای ئەوڕۆیان لە ڕۆژانـی دیکەیان زۆر بەجـۆشـتـر و خـۆشـتـر بوو. خـانۆ سـەری لە پەنـا گـوێی یەک لەوانی، کـە بەتەنیشتییەوە ڕۆنیشتبوو، نا، گوتی:

– «ئەمـانە وا بەتەمان بەو سەمـا و فرت و فێڵـە خـۆیان لە دەستمان ڕزگار بکەن.»

پیـر کـەمێ لێـیـان دابڕا و دوورکەوتەوە، دەسـتی بەحـای و حـوو و پـڤـە پڤ کرد، دەتگوت کوورە دەدەمێنێ. ئەوانی دیکە دەستیان بـەردا و خۆیان بەملا و بەولادا بادەدا و هاواریان دەکرد:

– «حەی ئەڵڵا، حەی ئەڵڵا، حەی ئەڵڵا.»

پاشـان دایانە واقـە، واقێ. پیـر لە دوورەوە وەسـتـابوو، هـاواری لێ دەکـردن، بەدەنگێکی گـڕ و بەرز دەیگوت: "ئەهـا، ئەهـا، ئەهـا". سـەعـاتـێک بوو ئەمـانە بەدەوری خـۆیاندا دەخـولانەوە و پرچیان بەنەزم دەهاتن و دەچوون. ئەم شـتـە سـەیـرانە لە کـوردەواریدا بـاو نەبوو، خـەڵکی زۆر بەهـەوەسـەوە تەمـاشـایان

دەکردن.

ئەوجا خانۆ گوتی:

– «بەسە واقە واق و حای و حوو. ڕاست بڵێن لە کوێوە هاتوون؟ کێ ناردوونی؟ بۆ چییان ناردوون؟»

مەجلیسەکە هەموو کڕبوون. دەرگەی دیوەخانێ خرابووە سەرپشت. ژنان لەبەر دەرگە فسکە فسک و چرپە چرپیان بوو.

دەروێشەکان هیچیان دەنگیان نەکرد، پیر نەبێ، گوتی:

– «ئێمە دەروێشی خوا و پەیڕەوی محەمەد پێغەمبەرین، ڕێگامان دراوە لە وڵاتی موسوڵمانان‌دا لە هەموو شوێنێک سەربەست بین و بەهەموو لایەکدا بگەڕێین، کەشکۆڵ هەڵگرین و دەرۆزە بکەین، بەهەر جۆرێ بێ بەڕێوە بچین. بڕوا بکەن کەس نەیناردووین.

خورشید لێیان هاتە پێشێ، گوتی:

– «چاکە، ئەگەر ئێوە دەروێشی خوان و ڕاستگۆن، ئەی کارتان بەکارگەی چەکسازی چ بوو و بۆ لە شاگردەکانتان پرسی" لێرە چ جۆرە چەکێک دروست دەکەن؟". باشە ئەوەش هیچ، ئەدی بۆ چوونە بەر دەرگای ئەشکەوتێ، ویستتان دەژووری کەون؟ چما نازانن ئەو ئەشکەوتە دوورە شارە و قەدەغەیە و کەسی لێ نییە سەمایان بۆ بکەن. ڕاست بڵێن، ئێوە لە چ دەگەڕێن؟»

پاش ئەو پرسیارانە بوو بەچرپە چرپی خەڵکەکە. وێ دەچوو هێندەی نەمابوو شیران هەڵکێشن و هەر لەوێدا لەت و پەتیان بکەن.

ئەوان ڕدێن سپی کە دەپێشدا بەزەیان پێیاندا دەهاتەوە پاش ئەو پرسیارانە بەچاوی پڕ ڕق و کینەوە تێیان ڕامان، دەتگوت لە دوژمن دەنۆڕن.

هەندێ بەدەنگی بڵند هاواریان کرد:

– «چ پێویست بەپرسیاران ناکا، دەبێ هەر ئێستا هەڵیان واسن».

پیر کە زانی وا ئاشکرا دەبن بەفێڵ کردی بەحای و حوو دەستیان بە بلوێر لێدان و سەما کرد بەڵام ئەم جارە دەنگی پیری گەورە و بەند و مەقام وەکو ئی

جاران نەبوون. زولاڵ و خۆش نەبوون. دەتگوت ئێسک کاوڕ لە گەرووی پیر گیربووە، بەئاستەم دەنگی لێوە دەهات.

خانۆ گوتی:

– «ئیدی بەسە ئێمە ئەم تەڵەکەبازی و حاڵ لێهاتنەمان دیون. زۆر چاک دەزانین ئێوە جاسووسن و تا ئێستاش نەک هەر کەڵەک و ساختەی دەرویێشان، فڕوفێڵی چەند قەرەج و دەرۆزەکەر و دەهۆی چەند کۆلکە مەلاشمان ئاشکرا کردوون. ئەوی پێ لە گوناه و تاوانی خۆی نەنێ لە نێوی دەبەین. ئەوەی ڕاستی بدرکێنێ لێی خۆش دەبین. خانۆ فەرمانی دا سەرەک دیوەخان: برۆ مەلا قادری گاس کە بێتە ئێرەکانە، بەزمانی خۆی بیگێڕێتەوە چۆنی ڕاستی لە خۆی گوت و لێرە چۆن دەژی؟»

زۆری پێ نەچوو مەلا قادر هات. مەلا کابرایەکی لاوازی ڕەقەڵەی کەڵەگەت بوو. مێزەرەکەی هێند گەورە بوو دەموچاوی بەحاڵ دیار بوو. چاوێکی نەبوو. دەیانگێڕاوە:

– وەختی خۆی دڵدارێکی جوانی دەبێ نێوی بەیاز دەبێ، بەڕاستی نێوی وا مەگەر لە جوانی وەکو خۆی هاتبێ. بەیاز زۆر شۆخ و شەنگ بووە، لەو هەرێمەدا ژنی وا بەدەو و جوان و چەلەنگ نەبووە. مەلا خۆی و دڵدارەکەی هەموو جارێ بەدزییەوە لە ژوانێ یەکدی دەبینن، کەس پێ نازانێ مێردەکەی چۆن هەستیان پێ دەکا، چەند ڕۆژێک وەپارێزیان دەکەوێ و خۆیان لێ دەگرێ، تا ڕۆژێکی لە ماڵی خۆیدا مەلای دەگرێ. لە تۆڵەی ناموس و ئابڕوودا دەبا مەلای کوشتبا و ژنەشی سێ بەسێ تەلاق دابا. واز لە ژنەکەی ناهێنێ؛ چونکە لە ماڵی دنیایێ هیچی وای شک نەدەبرد شیربابییەکی دیکەی لێ هەڵستێ و ژنێکی دی بخوازێتەوە، مەلا ناکوژێ، دەچێ چاوێکی دەردێنێ بۆ ئەوەی ببێ بەپەندی زەمانە و جارێکی دی تەماح نەکاتە ژنی خەڵکی و ئیدی بەچاوی چەپی تا ماوە، ژنان نەبینێ.

مەلا قادر کە وەژوورکەوت سڵاوی کرد و ئیکلامێکی بۆ خانۆی کێشا خانۆ

گوتی:

– «مەلا قادر بۆیانی بگێڕەوە شا عەباس چۆنی بۆ نێو ئێمە ناردی بۆ جاسووسیێ و کە گرتمانی چۆن ڕاستیت لە خۆت گوت و چۆنت لێ خۆش بووین و ئێستاش چۆن دەژی؟ دە بیگێڕەوە دەی،»

مەلا قادر پێشان بەیەک چاوەکەی نۆڕییە دەوروبەری خۆی، ئەوجا سەیرێکی دەروێشەکانی کرد، گوتی:

– ڕۆژێکی وەزیری شا عەباسی بانگی کردم، پێی گوتم: «دەمەوێ بۆ نێو کوردەکانی قەڵای دمدمت بنێرم، ئەتوو مەلای، کەس نامۆیی لە مەلایان ناکا و شکیان لێ ناکەن. برۆ هەر سرێکیان هەیە پێ بزانە: چەند سەرباز، چەند پیادە، چەند سوارە، چەندیان چەک هەن، لە کوێیان تەقەت کردوون، لە کوێیان دێنن. دووبەرەکییان تێدایە یان نا؟ جا هەرکە گەڕایەوە بە زێڕان خەنیت دەکەم. ئەمنیش نەمدەتوانی قسەی وەزیر بشکێنم. ئەوەی ڕاستی بێ کە ناوی زێڕ و دراوی هێنا وەتەماح کەوتم. ئیدی ئەوە بوو لێرە هەستیان پێ کردم، گرتمیان، ئەمنیش ڕاستیم لە خۆم گوت، ئێستاش خوا خانۆی لەپ زێڕینی پایەدار کا، زۆر حاڵم خۆشە و خۆش دەژیم.»

ڕدێن سپییەک هەڵستا، گوتی:

– «کوڕینە ئەوی هاتبێ هێلانەی ئێمە بڕووخێنێ پرسیاری بۆچییە و چەند و چۆنی بۆ چییە؟ ئەوانەی کە غایەنەتی دەکەن دەبێ نەمێنن و لە کوشتن بەولاوە هیچی دیکە ڕەوا نییە. مەگەر هەر ئەم جۆرە کەسانە نین بوونە بنۆسی کلۆڵی و نەگبەتی کوردستانێ.»

مەجلیسەکە هەموو گوتیان:

– «ئەشەدوبیللا قسەکانی ڕاست و بەجێن، هەقە ئەمانە هەر ئێستاکە بەداردا کرێن.»

خانۆ ئەمری کردە جەوزۆ:

– «خێرا دەستیان ببەستن، لە زیندانیان کەن، بڵا سبەینێ جارکێش بەشار

و گوندانددا جاران بکێشن، خەڵکی لە مەیدانی کۆوەبن، ئەو دەروێشانە هەڵدەواسین، تا ببن بە پەند.»

لە نکاو دەستیان بەستن، جەوزۆ گوتی:

– «دە بیانبەن دەی.»

دەروێشە مێردمنداڵەکەیان دەستی بەگریانێ کرد، گوتی:

– «ئەمن لە زیندانێ ماوێن، مەرەخەسم کەن، ڕاستیتان پێ دەڵێم، دەستیان کردەوە، لە هاوڕێکانیان هەڵبڕی و ئەوانی دیکەیان بۆ زیندان بردن.»

دەروێش گوتی:

– ئەوە دوو ساڵە دایک و بابم لە تاو هەژاری بەو دەستە دەروێشەیان سپاردووم، پارووە نانێکمان وەچەنگ کەوێ. هەر پیرەکەیان کورد بوو بە منڕا بووین بە دوو کورد. نیزیکەی سێ سەد دەروێش دەبن، زۆریان عەجەمن، بەڵام ئەفغانی و ئازەربایجانیشیان تێدان. پیرەکانیان خاوەن ژن و منداڵن. بەهەر لایەکیدا بڕۆن، با دووریش کەونەوە مواجبی ساڵانەی خۆیان دەبێ بەجێ بێنن و هەریەکە ساڵی، چەند تمەنێک بەپیری گەورە بدا. بەهارێ جارێکی پیر بەدزییەوە پێی گوتم:

– دەبێ بچینە قەڵای دمدم.

بەڕاستی زۆرم پێ خۆش بوو، چونکە گەلێکم لەمەڕ قەڵای دمدم و شاری خانۆی لەپ زێڕین بیستبوو، پیر گوتی:

– بەڵام پێش چوونمان، دەبێ سەرێکی وەزیری بدەین و زیکر و سەمایەکی لە خزمەتدا بکەین.

دوو مانگ پتر بوو، خەریکی زیکر و سەماکردنێ بووین، مەشقمان دەکرد. کە چووینە خزمەتی وەزیری، ئێوارێکی درەنگ دەستمان بەزیکر کرد، پیر خۆی دەستی بەئاگر خواردن کرد. وەزیر فەند و سەمایێی پەسند کردین، گوتی:

– باشە بڕۆین. کاری مە ئەوەیە کە دەبێ هەموو سرێکی شاری قەڵای بۆ

وەدەست بێنین و ئاگاداری بکەین، بەڵێنی داوینێ زێڕ و دراوێکی زۆرمان بداتێ. چتان لێ وەشێرم وەڵڵا شا عەباس ناردووینی.»

خانۆ فەرمانی دا:

– «بیانخکێنن، بەلام خۆ لەو لاوەی مەگەیەنن.»

ئیدی ئەوێ ڕۆژێ جارکێش جارِیان کێشا:

– «خەڵکینە وەرن، گەلۆ وەرن، سبەینێ لە مەیدانێ، جاسووسەکانی شای ئێرانێ هەڵدەواسرێن. هۆو خەڵکینە هۆۆۆۆ.»

بۆ سبەینێ لە مەیدانێ نۆ دەروێشی زرتە و زەبەللاح بەداردا کرابوون. خەڵکی وڵاتی بەرۆدار لە هەموولارِا هاتبوونە سەیریان.

***



بەشی پێنجەم

# شایی

ڕۆژانی فێنک و خۆش لە تارانێ* ساڵی هەر دوو جارن. جارێکی لە بەهاریدا، لە مانگی ئادار و نیسانێ و چەند ڕۆژێکیش لە مانگی گوڵان. بەهارێ، هەموو دنیا بەگولیلک و دار و درەختی سەوز دەڕازێتەوە، دنیا زۆر فێنک و خۆش دەبێ. جاری دووەم لە پایزێدا، ئیدی گەرما ڕادەکشێ، گەڵا زەرد هەڵدەگەڕێن، کانی و سەرینچاوان لە کورتی دەدەن و دەبێتە ئاوزێمی، بەڵام دار و درەخت سەرلەنوێ گەڵا دەکەن، پیاو خواخوایەتی بەکووچە و کۆڵانی شاریدا بگەڕێ و بۆ باخ و باخچان بچتە سەیرانێ.

ڕۆژێکی لەو ڕۆژە فێنک و خۆشانەی پایزێ بوو، شا عەباس زلێخای کچی پادشای ئەفغانستانێی هێنا و شایی کرد. شاییەکە لە باخچەیەکدا دەگێڕدرا ئی کەونە شاکانی ئێرانێ بوو، خەڵکی شار تێکڕا وەجۆش کەتبوون و بەجارێ تێک چرژابوون، لە هەموو لاڕا دەستە دەستە میوان لە وەزیر و میر و موشیر، لە خانی قشلاخ و گەرمەسێر و ناوچە و هۆزان بانگ کرابوون، هەریەکە دیاریی بەنرخی خۆی هێنابوو. چەند بەگێکی کوردیش بانگ کرابوون، لەوانە بوون کە غەیانەتیان لە نیشتمانی باو و باپیران کردبوو. باخچە هێند پڕ بوو جێگای میوانێکی دیکەی لێ نەدەبووەوە، شا فەرمانی دا

* پاتەختی شا عەباس ئیسفەهان بووە، نەک تاران، چونکە ئەو دەمی تاران نەبووە، وەک لە پێشەکییەکەدا ڕوون کراوەتەوە.

گورجێ تەختێکیان لە بەردەرگای باخچەی بۆ دانان، کز و سەرشۆڕ ڕۆنیشتن. میوان و وەزیران کە چاویان بەم کوردانە کەوت، کڵاو قیت، مشکی لەسەر، شان بەعەبای سوورمەدارەوە، ڕمبی گەوگەویان بەدەستەوە، شیریان بەقەدەوە، هەموو دایانە قاقای پێکەنینێ، یەکیان گوتی:

– نازانم، شا عەباس ئەم ورچانەی چۆن بۆ شایی بانگ کردوون؟

مەحموود خان ئەو قسانەی پێ خۆش نەبوون، کابرا بەبنەماڵە و ڕەگەز کورد بوو، باوی زۆر لەمێژبوو موشیری شا عەباس بوو، دەڵێن موشیری وا ئاقڵ و ژیر لە خزمەت شاکانی ئێراندا نەبووە و نەدەبێتەوە. مەحموود خان باوی ئاسایی بووبوو بەڕاوێژکەری شا عەباسی. ئەو تەوس و قەشمەرییەی بۆ قووت نەچوو؛ چونکە زۆر جاران قەشمەرییان پێ کردبوو! ئەو قسانەی وەبیرهاتنەوە کە دایانەکەی بەمنداڵی پێی گوتبوون: «مەحموود خان، لە دەورت گەڕێم، دەڵێن غیرەتیان وەبەر سەگی نا غیرەتی بزووت و پێی خۆش نەبوو بەبێ غیرەتی نێوبەرن، غیرەت نیشانەی شان و شەوکەتی کەڵەمێردانە».

ئەوێ ئێوارێ نێو باخچە چراخان کرابوو، دەتگوت ڕۆژی نیوەڕۆیە. لە هەموو لا ڕا بەزم و ئاهەنگ و سەیران و ڕابواردن بوو، لە لایەکی فەندباز شتی سەیروسەمەرەیان نیشان دەدا. لە جێیەکی لاقرتیکەر شتێ ئەوتۆیان دەگوت پیاو لەبەر پێکەنینێ خۆی پێ ڕانەدەگیرا، لە لایەکی دی تەنافبازان بەسەر تەنافی باریکدا تەنافبازییان دەکرد و بەشتی سەیر خەڵکیان دڵخۆش دەکرد و وەپێکەنینیان دێنان، لە جێیەکی نێزیکەوە، لە پشت پەردەوە ژنە وەزیر و ژنە خان و ژنە بازرگان لەگەڵ فەیزە خانمی ژنی شا عەباس و زلێخای تازەبووکی سەیریان دەکرد. ژنان بەنۆرە ساز و سەنتووریان لێ دەدا و یەکە یەکە وەسەمایێ دەکەوتن و گۆرانی و لاوژەیان دەگوت. شا عەباس بۆ خۆی لە جێگەیەکی بەرز، کە بەسەر هەموو شوێنێکیدا دەڕوانی و هەموو لایەکی لێڕا دیار بوو، ڕۆنیشتبوو، زلێخای خرپن و شۆخیش دەستی دایە سازی و بەپەنجە ناسک و نەرمۆڵەکانی، مەگەر هەر لە خۆی بێ، دەستی

بەساز لێدان کرد و بەدەنگێکی وەکو دەنگی بلبلان ئەو گۆرانییەی گوت:

سوێسکەیەکی تازە باڵەفڕ بوو، تازە لە هێلانە وەدەرکەوتبوو،

لە پڕ واشەیەکی گەورە، پڕی دایە و بۆ هێلانەی خۆی برد.

بەڵام نەیتوانی تەواوی بکا، فرمێسک، بەسەر ڕوومەتە ئاڵەکانیرا جۆگەلەی بەست. بۆ شاردنەوەی فرمێسکەکانی سازەکەی بەڕووی خۆیەوە گرت و قوڕگی پڕ بوو لە گریان. ڕای کرد لە پشت پەردەیەکەوە خۆی شاردەوە.

فەیزە خانمی هەوێی دەمی نایە پەنا گوێی ژنە وەزیرێکی، گوتی:

– ئەم باوان وێرانە حەزی لە خاڵۆزایەکی خۆی کردبوو، بەڵام باوی بەنابەدڵی و زۆر و تۆبزی دایە شا عەباسی، هەر بۆ هەندێ لایەکی بلوجستانی بداتێ.

چەند ڕۆژ بوو شایی و بەزم هەر بەردەوام بوو. ڕۆژێکی دوو فیلیان هێنا، بەڵام چ فیل، میوانان هەموو بەجارێ واقیان وڕما. هەریەکە زەلامێکی بەسەر پشتەوە بوو، قورتمیان هێند درێژ بوو لە زەوی دەخشا و شەفرە کەوانییە سپییەکانیان لە ژێر لچیانەوە سپی دەچوونەوە، ئەوەندە بەسام بوو پیاو زەندەقی لێیان دەچوو.

دەیانگوت پادشای هندستانێ بەدیاری بۆ شا عەباسی ناردوون. یاری و فەندیان ئەوە بوو، بەقورتمیان جامە شەربەتیان بەپڕی هەڵدەگرت، بۆ ئاسمانێیان بەرز دەکردەوە، ئەوجا جوان و زەریف، بەوەستایانە لەسەر خوانێیان دادەناوە، دڵۆپێکی لێ نەدەڕژا. جار جاریش قورتمیان لە دەست دەقۆستنەوە. میوانێکی نابەڵەد پنچکێ گۆشتی دا بەیەکیان فیلە نەیکردە نامەردیێ هەتا توانی پنچکە گۆشتی بۆ کابرای میرانی ئاوێت، جلەکانی هەموو پەڵە کرد، هەندێ لە میوانان گوتیان:

خوا هەڵناگرێ، ئەو بەستەزمانە بۆ ئازار دەدەن، چما نازانن، فیل گۆشت ناخوا، هەر دان و میوە و سەوزە دەخوا.

پاشان فیلێکیان چوو لە پێش میوانە کوردەکان وەستا، قورتمی بۆ یەکیان

درێژکرد، بوو بە قاقای پێکەنینێ، خانێکی عەجەم بەتەوسەوە، گوتی:

– کوڕینە، تەماشاکەن، چۆن فیل ئامۆزای خۆی دەناسێتەوە. دەبینن چۆن چووە کن خزمانی خۆی. میوانەکان دیسان دایانە قاقای پێکەنینێ. بازرگانێک هەستا، گوتی:

– ئێوە بەو گیانلەبەرانە پێ دەکەنن، بەڵام دەبێ ئەوە بزانن کە هیچ گیانلەبەرێکی دیکە هێندەی فیل زیرەک و ژیر نییە، لە هیندستان هیچ دەعبایەک بۆ پاسەوانیی خاوەنی خۆی لە فیل دڵسۆزتر نییە.

ڕاستە شایی و ڕابواردن بوو، بەڵام عێلی بەرۆدار کە بەسەر دەمدەمەوە نیشتەجێ بوون قەت لە مێشکی شا عەباس نەدەهاتنە دەرێ و هەمیشە بیری لێ دەکردنەوە. ئەوان ڕێگای کوردستانیان لێ گرتبوو و نەیاندێشت بستێک لە کوردستان بێتە پێشێ. ئەویش بەهەویای ئەو جاسووسانە بوو کە لەمێژبوو بۆ قەڵای دمدمی ناردبوون. شا وەبیری هاتەوە دەبوو ئەو پایزە بەهەر ڕەنگێکی با دەروێشەکان گەڕابانەوە و هەموو سڕێکی ئەو کوردانەیان دە مستی نابا، بەڵام وا کاتی گەڕانەوەیان بەسەرچوو و هەر نەگەڕانەوە، بۆچی؟

شا عەباس لە جەنگەی بیرکردنەوەیدا بوو لەنکاو وەزیری دیوان وەژووری کەوت، دەمی لە پەنا گوێی نا شتێکی بەگوێیدا چرپاند. شا عەباس ڕەنگی پەڕی، وەدەرکەوت. میوانان هەستیان پێ کرد، هەندێ ویستیان هەستن، بڕۆن، بەڵام وەزیر گوتی:

میوانانی ئازیز، شا کەمێ سەغڵەتە، خۆتان دەزانن ئەوە چەند شەو و چەند ڕۆژە شایی و لۆغانە و بەزم و ڕەزمە، شا تەشریفی پشووێک دەدا، دیسان تەشریف دێنێتەوە. تکا دەکەم شایی چۆڵ مەکەن، فەرموون، فەرموون، هەرکەسە لە جێگەی خۆی ڕۆنیشێ و دەست بەڕابواردنێ بکەنەوە و لە سای سەری شا و فەیزە خانمی کەیفان بکەن. بەشکو خوا و حەزرەتی عەلی لەشی ساغ کەن و نێرێنەیەکی پێ خەڵات بکەن. خوا بەزەیی بەوەجاخ کوێرییێدا بێتەوە.

مەلا و سەیدان هەموو دەستیان بۆ ئاسمانێ بەرز کردەوە، لە خوای پاڕانەوە، ئەگەر خوا کوڕێکی بە پاشا ببەخشێ بەڵێنیان وابێ بچنە زیارەتی مەشهەد و کەربەلایێ.

شا عەباس هاتە خەڵوەتگایێ، ڕەقیبێکی دوژمنی خانۆی لەپ زێڕین خۆی گەیاندە شا و خزایە بن دەستییەوە، گوتی:

– خانۆ هەر دە دەروێشانی گرتوون، دەیەوێ لە داریان دا.

زۆری نەخایاند ئەم خەبەرە لە نێو مێوانانیشدا بڵاوبووەوە. شا عەباس لە دووی وەزیری سوپایێی نارد، وەزیر هات، شا پرسی.

– بیستووتە؟ دەڵێن ئەم خانۆ کوردە سەگبابە هەر دە دەروێشانی گرتوون گوایا لە داریان دەدا.

– بەڵێ، شا پایەداربێ، ئەمنیش دوێنێ لە ڕەقیبێکی خانۆم بیست، گوتی:

– لە پێشدا جارچی بەهەموو لایەکدا ناردوون جاڕیان ڕایەشتووە کە جاسووسەکانی شا عەباسیان گرتوون و یەکیان پێی لە گوناهی خۆی ناوە و ڕاست و پاک گوتوویە: ئەرێ وەڵڵاهی، ئێمە جاسووسین و شا عەباس ناردووینی. ئیدی هەر ئەوێ ڕۆژێ خانۆ سێ و دووی لێ نەکردوون و هەموویانی لە مەیدانێ لە دار داون.

– ئەدی تا ئێستا بۆ دەنگت نەدەکرد؟

– شا پایەداربێ، جا ئەمن چۆنم دڵ دێ خەبەری وا شووم و ناخۆش بەو ڕۆژە خۆشەویستە بەجەنابت ڕابگەیەنم. ئەوە بۆ من ئەوپەڕی هەرزەگۆیی و ناماقووڵییە.

شا عەباس زۆر تووڕە بوو، گوتی:

– هەر ئێستا دەبێ قۆشەنێ سازکەی و سلێمان خانی لەگەڵ بنێری، هێرش بباتە سەر قەلای دمدم بیڕووخێنێ و خانۆشم بۆ بەدیل بگرێ و بیهێنێ.

– شا پایەدار بێ، با ئەو کارە دواخەین تاوەکو بەهار دادێ. ئێستا وەختی

نییه، ئەو کەژ و کێوانە لەمێژە بەفر گرتوونی.

شا عەباس نێوچاوانی گرژ بوو، بەتوورەیییەوە گوتی:

– ئەم قسانە چییە؟ من ئەمر دەکەم، دەبێ هەر لە ئێستا سلێمان خان بەڕێ کەوێ.

وەزیری سوپا کە بینیی شا تووکی سەری ڕەپ بووە و چاوی وەختە بچێتە پشتی سەری، گوتی:

– بەڵێ قوربان، ئەمر دەفەرمووی، سبەینێ زوو قۆشەن ساز دەکەم، لەگەڵ سلێمان خانی بەرەو قەڵای دمدمی بەڕێ دەخەم.

ئەوجا شا عەباس گەڕاوە نێو میوانان، بەڵام هەر بیری دەکردەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی: «قسەکانی وەزیر بەجێن، ڕاستە، وەختی نییە. چاک وایە لە پێشان دە هەموو سەرێکیان بگەم، جارێ سلێمان خان با بەبیانووی میوانداریەوە بنێرم، تا بەچاوی خۆی هەموو ناوچەکە ببینێ و لە نیازی ئەو کوردانە بگا، ئەوجا هێرشیان بەرمەسەر.

پاشی دوو ڕۆژان سلێمان خان بەقۆشەنێکی پڕ چەکەوە دەبوو لە ئیسفەهانێوە بۆ قەڵای دمدم بەڕێ کەوتبا. خەبەریان بە شا دا لەشکر ئامادەیە. شا عەباس بانگی سلێمان خانی کرد بردیە خەڵوەتێ پێی گوت:

– سەربازی زۆر مەبە، تەنێ هەر سەد سوارێکی ببە.

دەمەوێ وەکو میوان، وەکو ڕێوی بچی. بزانە قەڵا کوێ کەوتووە؟ لە چ ناوچەیەکدایە، ڕێگاوبان چۆنە؟ زۆر بەوردی بزانە ئەم کابرا کوردە نیازی چییە و چیی لە دڵدایە؟ ئایا وەکو هەموو ڕەعیەتێک قبووڵ دەکا خەرج و باجان بدا، یان نا؟ لە پاشان بگەڕێوە، بەشکو بەهارێ شتێکی بە شتێک بکەین، قەت بووە و بیستراوە کوردێک لە شا یاخی بێ و بەرەبەرەکانێی بکا؟ دە بڕۆ، دەی ئۆغرت خێر و خوات لەگەڵ.

سلێمان خان ئەوێ ڕۆژێ بەڕێ نەکەوت، ئێوارێ بانگی بەکر بەگی کوردی کرد، گوتی:

– بەکر بەگ من سبەینێ بۆ قەڵای دمدم، بۆ میوانی خانۆی کورد دەچم، بەڵام ڕێگا ئاز و چەتوونە و شارەزاش نیم، دەبێ لەگەڵم بچێ ڕێ بەڕێیم بکەی.

– بەسەرچاو، قوربان من ئامادەم.

– ئێمە سبەینێ لەگەڵ بەرەبەیاندا بەڕێ دەکەوین.

– جەنابی سلێمان خان، بەشکو ئیزنم بدەی ئەمنیش بەرگی سەربازی ئێرانێ لەبەرکەم، نەکو بمناسنەوە.

– مەیلی خۆتە، چۆنت حەز لێیە با وابێ.

وەختێ سلێمان خان لە ئیسفەهانێرا بەڕێ کەوت هەور و هەڵا بوو. سلێمان خان سەری هەڵبڕی، سەیرێکی ئاسمانی کرد، گوتی:

–شوکور هەوا خۆشە، ئینشاڵڵا سەفەرەکەمان بەئۆغرە.

– خان خۆش بێ، ئینشاڵڵا سەفەری هەر بەئۆغر دەبێ، بەڵام ئێستا لە چیاکانی دمدم بەفر کرێوە دەکا.

عەشیرەتی بەرۆدار عەشیرەتێکی گەورە بوو. نەک هەر لەسەر چیاکانی دمدم، لە گوندی خۆش خۆشیش دەژیان. کشتوکاڵیان دەکرد. لە خوارێ گەرمژ و گەرمەسێران بوو. پەزیان بەزستانان تا بەهار خۆش دەبوو لەو گەرمژانە دەلەوەڕاند؛ چونکە ئەو گەرمژانە قەت بەفریان نەدەگرت. بەڵام چەند ڕۆژێک بوو، پێش هاتنی سلێمان خان هەندێ بەفری لێ باریبوو.

کاتێ گەیینە بن چیاکان سلێمان خان گوتی:

– بۆیە دەڵێن کورد پیاوی چیایێن. ئێمە هێشتا لە تارانێ بووین بەکر بەگ دەیزانی ئێرە بەفرە.

– بەڵێ قوربان، ئێمە لە هەڵسوکەوتی کەشوهەوا بەڵەدین، هەر لە منداڵیرا بەگۆڕانی کەشوهەوا دێن، ئەگەر کورد تەماشای خۆر، یان مانگ، یا ئاسمانێی کرد گورجێ دەزانێ ئەوێ ڕۆژێ سبەینێ کەش چۆن دەبێ و بە چ بارێکدا هەڵدەسووڕێ، ساماڵ و خۆش، یا باران و تەڕ و تووشی دەبێ.

– ئەی ئافەرین کوردینە بۆ خۆتان و زیرەکیتان، وەڵڵا باوە کەس وەکو ئێوەی لێ نازانێ. من باوکم خاوەن زەوی و زار و سامان بوو، وەبیرم دێ هێشتا لاو بووم، هەرچی ڕەنجبەرمان بوون، کوردێ نەبێ ئیدی هەموو عەجەم بوون؛ ئەو کوردە لەمێژبوو بەماڵ و خێزانەوە هاتبووە کنمان. زۆر زیرەک بوو، کەسێکی دیکەی وەکو خۆی نەبوو بزانێ کەش کەنگێ خۆش دەبێ، هەتاو کەی دەردەکەوێ کەینێ باران و تەڕ و تووشی دەبێ. باوم خوا لێی خۆش بێ، هەمیشە هەر پرسی بەو دەکرد و هەر ئەو بوو ڕاوێژکەری ڕاستەقینەی و زۆری خۆش دەویست.

– قوربان، ئەوە چۆن ئەو ماڵە کوردە بەتاقی تەنێ هاتبووە کنتان؟ دەڵێن هەر باڵندەیەک و نێو پۆلی خۆی. ئەمن بەش بەحاڵی خۆم کە پەنام هێنا بەر شاهەنشای بەخۆ و هۆزمەوە هاتم، بڕوا بفەرموو ئەگەر بەتەنیا ماڵە هاتبام ڕۆژێکم دەر نەدەبرد و دڵم دەتۆقی.

سلێمان خان بیری دەکردەوە، گوتی:

– کوردە پیاوێکی لە گوندی خۆیان کوشتبوو، بەلەنگازە، وێڕای خوێنبژێریش خاوەن خوێن قایل نابێ، کابرا لە هۆزێکی گەورە و دەسڕۆ دەبێ، لێی خۆش نابێ، دەکاتە سەر بەگی هۆزێ ئیللان و بیللان دەبێ ئەو دوژمنە لە هۆزێ وەدەرنرێ، بەگیش وەدەری دەنێ.

– دەڵێن کوردە عادەتی وایە ئەگەر یەکیان عەشیرەت بەدەرکرد ئیدی چ عەشیرەتێکی دیکە نایگرێتە خۆی. بەڵێ ئەو هەش بەسەرە بەو ڕەنگی خۆی گەیاندبووە ئێرە و بووبوو بە ڕەنجبەرمان.

– بەڵێ قوربان، تێ گەیشتم.

سلێمان خان گەیشتە داوێنی چیای دمدم، بەفر تا دەهات زیاتر دەبوو. لە گوندەکانڕا، خەبەریان دا بە خانۆ وا گەورەیەکی عەجەم بەسەد سوارەوە بۆ قەڵا دێ.

لێیان دەپرسین:

– کوێوه دهچن؟

– دهچینه میوانی خانۆی کوردان.

خانۆ دهستبهجێ تێگهیی که ئهمه شتێکی خۆش نییه. هەستا دوو سهد سواری لهگهڵ خۆ خست و بهپیریانهوه چوو. هێشتا ڕێگا ماوهیهکی مابوو، سلێمان خان بگاته جێ، خانۆ له گوندێکی تووشی سلێمان خانی هات. زۆریان ڕێز و حورمهت گرت. ئهو چهند ڕۆژهی که سلێمان خان لهوێ بوو، ههر با و بۆران و کرێوه بوو. دراوسێ نهیدهتوانی سهر بهماڵی دراوسێدا بکا. سلێمان خان بهجاری ورهی بهردا بوو. نهیدهزانی چۆن بهرهو تارانێ بگهڕێتهوه. گوتی:

– خانۆ ئێره جێی ژیان و گوزهران نییه، زهمهھهریرێکه بۆ خۆی، بهڕاستی سهرم لێ شێواوه، خۆشم نازانم چۆن بگهڕێمهوه تارانێ.

بهکر بهگ بهفارسی بهسلێمان خانی گوت:

– قوربان، دڵنیابه و هیچ نیگهران مهبه، خوا یار بێ، بهڕێگایهکتدا دهبهم زوو بگهینهوه.

خانۆ خۆشی فارسیی دهزانی، که ئهو قسانهی بیست سهرسام بوو. له دڵی خۆیدا گوتی:

– «ئهم سهربازه عهجهمانه چۆن وا شارهزای ئهو ڕێگایهن؟»

بهڵام خانۆ نهیدهزانی ئهو کابرایه کورده. که سلێمان خان له ژیان و گوزهرانی کوردهکانی قهڵای پرسی، خانۆ گوتی:

– شاهەنشا پایهدار بێ، ئێمه ههمانه و نیمانه ئهو لهته زهوییهمان ههیه، ئهوهشمان بهههزار کولهمهرگی و دهردی سهری پێکهوه ناوه. خوا خۆی ئاگاداره خراپهی کهسمان نهویستووه و ناشمانهوێ. شا بڕوبیانووی چمان لێ دهگرێ، گوایه کهمی زهوی ههیه.

پاش چهند ڕۆژێ با و بۆران و کرێوه کپ بوو، بوو به سامال و ههتاو کهوت. سلێمان خان ئیزنی مهرهخهس بوونێی له خانۆ خواست. پاش

ماڵاوایی و دوعاخوازی بەڕێ کەوت.

ماوەیەک ڕۆیشتن، بەکر بەگ لاڕێیەکی گرتەبەرێ. بەینێک بەبەر هەتاودا ڕۆیشتن. شوێنەکە بۆ حەسانەوەی خۆشیان و ئەسپەکانیشیان لەبار نەبوو. هەتاو بەفری تواندبووەوە، زۆری نەمابوو.

بەکر بەگ لەگەڵ چەند سەربازێکدا دوور بەدوور لە پێشەوە دەڕۆیشتن، سلێمان خان هێند دڵنیابوو بیری لە هیچ نەدەکردەوە. هەرکە گەیینە کانی بووک هەر وەخت لە خۆشییان شامەرگ بێ. هەرکە گەیشتنە سەر کانی بووکی تەماشایان کرد مەڕەکێوییەک ئاوێ دەخواتەوە. کە چاوی بەسەربازان کەوت سڵەمییەوە، قەڵەمبازی دا و ڕاست سەرەو هەوراز بۆ سەری چیا هەڵات. سەرباز کردییانە گاڵە و هەرا و هاڕاوە هاڕاوە، لە پڕ هاشەی هەرەسی بەفر هات، بەڵام چ هەرەسێک، دەتگوت بایە، هەرچی گاشەبەرد بوون هەمووی ڕاپێچا و لەسەرۆ گلۆری کردنەوە، ئیدی نە سوارەکان نە بەکر بەگ دەرفەتیان نەما هەڵێن، بەجارێ بەخۆیان و ئەسپەکانیانەوە هەموو نوقم بوون و شتاقیان بەدەرەوە نەمان و دەتگوت هەر کەسیشی لێ نەبووە. سێیان بەخۆ و ئەسپەوە لە نێو چوون و کەس نەیزانی چییان لێ بەسەر هات. سلێمان خان کە ئەو کارەساتەی بەچاوی خۆی دی، ناچار پاشەوپاش گەڕاوە دواوە. ئاوی کانی بووک گەرم بوو، هەڵمی لێ هەڵدەستا، بەفری دەوروبەری خۆی دەتواندەوە و هاوینانیش هێندە سار دەبوو خەیارت تێ هاویشتبا دەی قەڵشاند.

لە نێو خەڵکیدا وا باو بوو کە جارێکیان زستانێ بووکێک بەو ڕێگایەدا دێنن، کاتێکی دەگەنە سەر ئەو کانییە لادەدەن بحەسێنەوە. گۆرانیبێژ و خۆشخوان دەست بەگۆرانی گوتنێ دەکەن و ئەو بنارانە لەبەر دەنگیان دەلەرێتەوە، لەناکاو بەفر هەرەس دێنێ، ئەوەندەی چاو بقوچێنی و بیکەیەوە دادەخزێ و دەگاتە سەریان، پێنج سوار، بووکێ، دوو بەربووک، دەهۆڵکوتێ و زووڕناژەنێکی نوقمی نێو چاڵە بەفرێکی قووڵ دەکا و شتاقیان لێ ڕزگار نابێ. هەرچی ماڵە زاواشە، خۆیان کۆدەکەنەوە و مەڕ و گا سەردەبڕن، چیی

دیکە بەخەیاڵدا بێ حازر دەکرێ و چاوەڕێی بووکێ دەکەن.

بووکێ دەبوو ئەوێ ڕۆژێ بگەیبا ماڵە زاوای، ئەوانیش چاوەنۆڕ دەبن تا ئێواریێ، بەڵام بووک ئەوێ ڕۆژێ ناگاتە جێ؛ دەڵێن ڕەنگە ماڵی باوی بووکێ سوارەکانیان مەرەخەس نەکردبێ، ڕۆژی پاشێش هەر چاوەڕێ دەکەن، نەخێر بووک هەر ناگا. بۆ ڕۆژی دوایێ چەند سوارێک بەڕێ دەکەون، بۆ ماڵی باوی بووکێ، بزانن بۆ دواکەوتووە! کاتێکی دەگەنە نیزیکی کانی بووکی دەبینن لەسەرڕا بەفری گەلی هەرەسی هێناوە و بە جارێ کانییەکەی پڕ کردووەتەوە و تەخت بووە. کەس ناوێرێ نێزیکی کەوێ. سوارەکان ڕێگا نادۆزنەوە، ناچار دەگەڕێنەوە بەدواوە و سەرلەنوێ لە ڕێگایەکی دیکەوە دەچن بۆ ماڵی بووکێ. کە دەگەنە وێ پێیان دەڵێن هەر لەوێ ڕۆژێوە سوار نێردراون بووک بەڕێ خراوە، سوارەکان زۆر لە بووکێ دەگەڕێن، ئەملا بووک ئەولا بووک، لەم هۆز سۆراخ لەو خێڵ پرسیار، هەرچەند دەکەن نایبیننەوە و هەروا بەبێ سەرەودەرە و سەروسۆراخ دەمێنێتەوە، تا ئاخر و ئۆخری بەهارێ، کۆچەر و ڕەوەندان لە بۆ کوێستانێ دەچن، دێنە سەر کانییەکە، دەنۆڕن شتێکی ڕەش دیارە: لاشەی چەند زەلامێک و کەلاکی چەند ئەسپێک لەوێ کەوتووە. خەبەر دەدەنە کەسوکاریان، دێن، هەرکەسە مردووی خۆی دەناسێتەوە. مەلا دەڵێ: دەبێ هەر لە شوێنی خۆیانیان بنێژن، ئەوە چارەنووسە، دەبوو لەو شوێنەدا مردبان.

مەلا چۆن دەفەرمووێ وا دەکەن، هەر لەوێندەرێ گۆڕیان بۆ هەڵدەکەنن و دەیاننێژن. ئیدی لەنێو هەموو عێلەساتیدا بووبوو بە باو، کە زستانان بەو ڕێگایدا تێ دەپەڕین هەرکەسە دەمی خۆی دەگرت، قڕوقەپ ورتە لە دەمییەوە نەدەهات تا لە کانی بووکی ڕەت دەبوون؛ جا بۆیە ناویان نابوو کانی بووک.

هەر لەسەر ئەو کانییە بوو سەربازە عەجەمەکانیش بەر تووک و ڕکی سرشت کەوتن. شا عەباس پێی وابوو سلێمان خان ئێستا هەموو سڕ و پەنییەکی خانۆ و قەڵای دمدمی بۆ دێنێ و خوا و ئیمامی عەلی لە پشتی بێ بەهارێ لەشکری لێ دەکا و قەڵا بەسانایی دەگرێ و هەنگێ خانۆ و عێل و

عەشیرەتی هەموو دەبن باندووری خۆی دەنێ و خەرج و باج و سەرانەی زۆر و زەوەندیشیان لێ دەستێنێ و گەنجی شاهەنشای ئێرانیی پێ ئاوا دەکا.

ئاخر و ئۆخری مانگی ڕەشەمێیێ بوو، سرشت لە وڵاتی ئێرانێ وەزەبر و زەنگ و جەزرەوە نواندن کەوتبوو. جاروبار با هەڵی دەکردێ و باران دەباری. ئێوارەیەک کاتێکی سلێمان بەگ گەییەوە تارانێ، نەرمە بارانێک باری. نوێژی شێوان بوو، ئاخوندان لەسەر مناران بەدەنگی بەرز بانگیان دەدا. شا عەباس خۆی حازر کردبوو بچتە نوێژێ، بۆ مزگەوت.

وەزیری دیوان عەرزی کرد:

– شاهەنشا پایەدار بێ، سلێمان خان لە سەفەر گەڕاوەتەوە، دەیەوێ بێتە خزمەت.

شا عەباس هەرکە نێوی سلێمان خانی بیست وەخت بوو شامەرگ بێ، چوو لەسەر تەختی ڕۆنیشت، گوتی:

– با بێ.

سلێمان خان وەژوورکەوت، ڕا و ڕەسمی شاهانەی بەجێ هێنا. سێ جاران ئیکلامی کێشا و کڕنووشی برد. شا عەباس لە تەنیشت خۆی دانا. شا پرسی:

– دەوجا بۆم بگێڕەوە دەی، چت دی؟ قەڵا چۆنە؟ لە کیهە لاوە دەتوانین هێرشی بۆ بەرین؟

– شا پایەدار بێ، چما ئەو هێشتی بگەینە قەڵا! هێشتا دوو ڕۆژی مابوو بیگەینێ. ئەو بۆ خۆی بەپیرمانەوە هات. ئەمن دەمویست هەر چۆنێ بێ بگەمە قەڵا، بەڵام چەند ڕۆژ بوو هەر با و بۆران و کڕێوە بوو، لەبەر سەرما و سۆڵە کەس نەیدەوێرا سەر دەربێنێ. وەڵڵا باوە ئەو شوێنە هیچ جێگەی مرۆ و ژیان نییە. بەڕاستی ئەگەر بەکر بەگی خودا لێخۆشبوومان لەگەڵ نەبا شتاقمان لێ ڕزگار نەدەبوو.

شا عەباس پرسی:

– بەکر بەگی خوا لێخۆشبووی چی؟ سلێمان خان بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕاوە: کە چۆن بەفر لە نکاو هەرەسی هێنا و چەند سەربازێکی لەو گەلییە بەژێرەوە کرد، سلێمان خان گوتی: جا، بەس نەبوو خۆشم لە پێش سوارەکانەوە نەبووم، دەنا لەگەڵ بەکر بەگی دەبووم بەژێر بەفرەوە.

شا پرسی:

– ئێ باشە، خانۆی کورد چیی گوت، چیی نەگوت؟

– قوربان، دەیگوت: ئێمە هەمانە و نیمانە ئەو لەتە زەوییەمان هەیە، ئەوەشمان بەهەزار کولەمەرگی و دەردی سەری پێکەوەناوە. شا برِوبیانووی چمان لێ دەگرێ، چما کەمی زەوی هەیە؟

شا عەباس دۆش داما، سلێمان خان چاوەنۆڕ بوو داخوا شا چ بڵێ.

شا گوتی:

بەهارێ دەبێ لەشکرێکی گەورە و گرانی دەسەرکەم و قەڵاکەی بەسەردا نۆغرۆ و وێران کەم.

***



بەشی شەشەم

# سەربهوردی خانۆ

کاتێکی پەز دەزێن کورد دەڵێن ئیدی وا بەهارە، جا بەڕاستی هەر وایە؛ چونکە وەختێ پەز دەزێن، ئیدی دنیا تەواوێ گەرم دەبێ، هەوا خۆش دەبێ، ڕۆژگار دەداتە درێژییێ. هەموو ڕۆژێ هەتاوە، زەوی گەرم دادێ. گژوگیای ناسک له هەموو دەشت و دۆڵان سەر دەردێن. خەڵکی بەرۆدار بۆ چاودێریی بەرخەل و ساوا کەیبانوو و خێزانان دەنێرنە شەوێنێ.

ماڵی مەخسوودیش بڕیاریان دا دلبەری کچیان لەگەڵ کوڕە چکۆلەیاندا بنێرن، لەگەڵ بەرەبەیانی دلبەر سواری ئەسپێکی بوو. بارێ دەفر و ئامان و نوێنیان لە گایەکی نا، براکەیان سواری گای کرد. کاتێک بەڕێ کەوتن دایکی نەسحەتی کرد، گوتی:

– کچم، ئێستا جەنگەی خلندۆر و لۆرکە، شوان و دووئاژۆ زۆر حەز لە خلندۆر و لۆرک دەکەن؛ کارێکی وا بکە هەر مەڕێکی چۆڕێ بدۆشی، نەکو بۆ بەرخۆڵان شیر نەمێنێ، بەڵام نابێ شوانەکانیش بەبرسێتی بمێننەوە، دەبێ مەڕی تازەزاو وا بدۆشی کە چەند خوشێک ژەکیان لە گواندا بمێنێ بۆ ساوا و بەرخەل چونکە ساوای تێرژەک زوو هێز و گوڕیان وەبەردێ و پتر بەرگەی دەرد و نەخۆشییان دەگرن. دژواریش هەر لە ڕۆژانی پێشەوەدان، پاشان کە پەز زۆر دەزێن، هەنگێ هەر مەڕێکی خوشێکیشی بدۆشی بەشی هەموویان دەکا.

– هەی لە دایکم، چما من منداڵۆچکەم، یان تازە دەچمە شەوێنێ، یا نەفامم؟ ئەمن چۆن مەڕ وا دەدۆشم شیریان لە گوانێدا نەمێنێ، وایان دەدۆشم هێندە خلندۆر و لۆرکی لێ پەیدا بێ هەم شوان تێر بخۆن هەم ساوا و بەرخەلیش برسی نەبن.

– دە باشە ڕووناکیی چاوانم، دە بڕۆ، ئیدی ئۆغرت خێربێ.

دایک لە کیژ نیزیک بووەوە، ماچێکی کرد، ئەوجا ئەملا و ئەولای کوڕە چکۆلەشی ماچ کرد. خوشک و برا بەڕێ کەوتن و لێیان دا ڕۆین. لە شوورەی قەڵای وەدەرکەوتن، بڕۆ بڕۆ تا گەیینە جێ.

هەرکە دلبەر گەیشتە نێو مێگەل تازە دە مەڕ یان زابوو، بەڵام پاش چەند ڕۆژێکی زیادیان کرد و تا دەهات پتر دەزان، ڕۆژێ وا بوو پێنج شەش مەڕ دەزان. ئەوێ ساڵێ مەڕەکانی مەخسوود زۆریان جمێیان هێنابوو. شوان لەگەڵ دلبەر دەیانکردە گەمە، دەیانگوت:

– ئەوە هەمووی پێ و قەدەمی تۆیە مەڕ جمێیان دەبێ.

دلبەریش بەپێکەنینەوە دەیگوت:

– دراوسێکانیشمان هەر وا دەڵێن. دەڵێن دلبەر چەند پێ و قەدەمت بەخێرە، هەرکە پێ داوێیە ئەم دیوی دەرگەیماڵێمان، خێر و خۆشی دنیامان بەسەردا دەڕژێ.

گەورەی شوانان پیاوێکی کامڵ بوو، گوتی:

– گەورە کچ هەمیشە پێ و قەدەمی بەخێر بووە.

ڕۆژێکی دلبەر بەشوانەکانی گوت:

– براینە، ئێوە هەر لە بەرەبەیانێڕا تاوەکو ئێوارێ لە دەشت و دەرانن، با و بۆرانی زۆرتان لێ دەدا، ئێوارانیش کە دەگەڕێنەوە، وێڕای ئەو هەموو شەکەتییە خۆتان خواردنێ بۆ خۆتان لێ دەنێن، ئەمە چەندی بەچەندە. بەڕاستی ئەمن لە ڕاستتان زۆر شەرمەزارم. خۆ من نەهاتووم ساوەلەوانی بکەم. بڕیارم دا منیش وەکو دایکم ئیدی لەمەوپاش تاشتی بەیانیان و شێوی

ئێوارانتان بۆ لێ بنێم، خەمتان نەبێ، ئیدی ڕەحەت و سەحەت وەرنە سەر سفرە و خوانی حازر و نانی خۆتان بخۆن.

گەورە شوان لە دڵبەری نۆڕی، گوتی:

– کیژێ، ڕاستت پێ بڵێم، کە زانیمان ئەوساڵ دایکت نەهاتووە، گوتمان: بەخوا وا دیارە ئەمساڵ حاڵمان شڕ دەبێ، بەڵام خوا تۆی بۆ ڕەخساندین، یا ڕەبی بەرخورداربی.

دلبەر ئیدی نەیدەزانی کام مەڕ زاوە. بۆ ڕۆژی پاشێ لەگەڵ بەرەبەیاندا لە خەو هەڵستا، براکەشی بەخەبەر هێنا مەڕانی بۆ هاوێر بکا، زۆر گورج و گۆڵانە هەر مەڕەی دوو خوشی دۆشین و تاشتی بۆ حازر کردن. تا شوان و دوواژۆ دەست و چاویان شوشت ئەویش تاشتی بۆ خستنە سەر خوانێ، گوتی:

– براینە، فەرموون تاشتی بکەن.

شوانەکان زۆر بەئیشتیاوە تاشتی خۆیان کرد، پاشان گەلێ دوعای خێریان بۆ دلبەر کرد:

– زۆرت سوپاس دەکەین، خوات لێ ڕازی بێ، ئافەرین بۆ خۆت و دەست و تاشتت، خوا مەخسوودت حاسڵ کا و بە کاوی خۆت بگەی. وەڵڵا باوە خواردنی دەستی تۆ دەڵێی گۆشتی بەرخە نەک خلندۆر.

دلبەر گوتی:

– هاپۆ ئەمە هونەری دایکمە لە دەستە ڕەنگینەکانی ئەوەوە فێر بووم. کە چێشت لێ دەنێ زۆر بەوردی سەرنج دەدەمێ. زۆر جار پێم دەڵێ کیژێ تۆ فڵانە چێشت لێ بنێ، جا بۆیە چێشتەکانم وا بەتام و خۆشن.

گەورە شوان گوتی:

– هەزار خۆزیم بەو ماڵ و خێزانەی تۆ دەبییە کابانی.

شوانە هەرزەکارەکان دەیانزانی دلبەر دڵداری شەبابە و هەردووکیان دڵداری یەکن، یەکیان لە ژێرەوە گوتی:

– بووکی ماڵی عەدییە، لەمێژە لەگەڵ شەبابدا دڵداری یەکن.

– دەی خوایە سا ئەو کارە ڕێک خەی و بیهێنیە دی، وەڵڵا شەباب شیاوی ئەمە و یەکە لاوی وڵاتی ئێمەیە.

کە نێوی شەبابیان هێنا دلبەر دەستی بەڕوویەوە گرت و بەری بەولاوە کرد.

خورشیدی بازاڕباشی پێی زانیبوو کە ئەمساڵ دلبەریان ناردووەتە دەشت و شەوێن. ئەویش بەقەستی هەڵستا لەگەڵ ژنەکەیدا باری گایەک شمەکیان پێچاوە و سواربوون، لێیان دا ڕۆیشتن.

تازە دوو ڕۆژ بوو گەیشتبوونە سەر وارگەی خۆیان، خورشید ئارامی لەبەر بڕابوو، دەیویست دلبەر ببینێ. بەڵام نەیدەزانی چی بکا و بە چ بیانوویەک بۆ وارگەی ماڵی دلبەر بچێ چاوی پێ بکەوێ. وارگەکانیان لێک دوور بوون، بیری کردەوە: ئەگەر چووم و دلبەر لێی پرسیم:

– بۆچی هاتووی؟

دەڵێم:

– زۆرمان ساوا لەنێو دەچن، دەر و دراوسێ دەڵێن: گەورە شوانی ئێوە حەکیمی ئەو جۆرە نەخۆشییانەیە و پسپۆڕە.

خورشید سواری ئەسپ بوو لێی دا چوو بۆ وارگەی ماڵی مەخسوود. کە گەییە وێندەرێ، لەبەر ڕەشماڵەکەیان ڕاوەستا. دلبەر لە ماڵێ نەبوو، چووبووە سەر کانی ئاوێ بێنێ، جگە لە برا بچکۆلەی کەسی گەورە لە ماڵێ نەبوو. گەدە دەستبەجێ خورشیدی ناسییەوە، گوتی:

– هاپۆ خورشید، فەرموو دابەزە، وەرە ژوورێ، بۆ بەسواری وەستاوی؟ خورشید لە دڵی خۆیدا گوتی:

– وەکو باوکی وایە، زۆر میوان پەزێرە.

ئەوجا لە ئەسپەکەی پیادە بوو و لەبەر ڕەشماڵێ ئەسپەکەی بەسنگێکەوە بەستەوە و وەژوور ڕەشماڵێ کەوت. ڕاستە ڕەشماڵ ناوماڵی گرانبایی وەکو

مـافـوور و ڕایەخی چاکی تێـدا نەبوو، بـەڵام دلبـەر نێـو ڕەشـمـاڵ و سـتـێـڕە بچووکەکـەی خـۆی هێند بەڕێکوپێکی ڕیزکـردبوو، پیـاو هـەر حـەزی دەکـرد تێی ڕابمێنێ. بۆ جـوانـی پەردەی گـوڵداری بـە ئاو و تاویشـی بەنێــو ڕەشــمــاڵدا گێڕابوو. دلبەر لەسـەر کانی بوو، زۆری پێ نـەچوو گەڕاوە. هـەرکـە لە دوورەوە لە پێش ڕەشماڵێ چاوی بەئەسپێکی کەوت بەسـترابووەوە، هەندێ دۆش داما، لە دڵی خۆیدا گوتی:

– خوایە، بەخێری بگێڕی، ئاخۆ کێ بێ؟

کە نیزیک بووەوە نۆڕی ئەسپی وان نییە.

خۆی بەخۆی:

– کەواتا ئەو سوارە میوانی مە نییە.

دلبـەر هـەرکـە گـەیشـتـە بەر ڕەشـمـاڵێ و جـەڕەئاوێی لە سـەرشـانـی داگـرت، چارەی خـورشـیـدی بەچـاودا چەقی. بەڵام کـچـی تاین هێند شـڵـەژا، ڕەنگی پەڕی، هـەر دەتگـوت نـاسـکـە گـوڵی بـەهـارێیــە و لەپڕ بـەر سـۆڵـەی زسـتــانـێ کـەوتووە، ئیـدی بەجـارێ ڕەنگە ئاڵەکـەی هەڵبـزڕکا. دلبـەر حـەزی لە چارەی خـورشـیـد نەدەکـرد و قـەتیش نەیدەویسـت سـەر و فـەسـاڵی ببـینـێ. هـەرکـە گەیشتە بەر ڕەشماڵێ، خورشید ماندوو نەبوونی لێ کرد، گوتی:

– دەک بەسـەر هـەردووک چاوان بێیەوە.

دلبەر وەڵامی نەداوە، بەڵام خورشید تێ هەڵچووەوە، گوتی:

– هـاتووم بۆ کن گـەورە شوانـی، بەینێکە دەردێ کەوتووەتە نێو سـاواکانمان زۆریان لەنـێو دەبا، دەڵێن گـەورە شـوانەکـەتان لە دەرمـانـی ئەو جـۆرە پەتا و دەردانە شارەزایە، جا بۆیە هـاتووم، گوتم بەشکو ناوی دەرمانەکەمان پێ بڵێ.

دلبەر بەڕقەوە گوتی:

– دەک خـوا بکا هـەمیشـە هـەر دەردەدار بن و قـەتتـان دەرد لێ نەبڕێ، چمـا نازانی بەو نیوەڕوانە شوان لە ماڵێ نین لە دەشتێ پەزان دەلەوەڕێنن؟

ئیدی خورشید پەستی دای گرت، گوتی:

– دلبـەر تۆ لە ناهەق پێـمدا هەڵدەکاڵێی، بـەخوا ئەمن زۆرم خـۆش دەوێی، کیـژێ مێـردی وەکو منت لە کـوێ دەست دەکەوێ. لە هـەیاسـە و کـەمـەرە، لە گـۆپکەی زێڕ و لووتـەوانە و خـەزێمی بەپلـپلـە و سلـسلـە، لە گـوارە زێڕ، لە دووتاسی زێڕ و ئیـدی نازانم بلـێم، چیی دیکەم بۆ حـازر کـردووی، خـۆ خـوا خۆی ئاگادارە هیچیان لە زێوکاری شـاری قـەڵایێ نییە. ئەمـانەم هەمـوو، لە شـاری بەغدایە بۆ کڕیوی، کـەی لەبەریـان کـەی، لێت بـبن بەنەخش و خـەڵکی قەڵات ببن بەحەیران:

دلبەر لەم قسـانـەی خـورشـید هێندەی دیکە ڕقی هـەڵستـا و سـوور بووەوە، گوتی:

– تۆ کـابـرایەکی زۆر بێ نامـووسی. ئەگـەر هێنـدەی تۆزکـاڵێکت نـامـووس و شەرم بەخۆت با ئەوڕۆ بەم نوێژی نیوەڕۆیە، هەڵتەک هەڵتەک نەدەهاتییە ئێرە، ئاخـر هیچ بیـرت نەکـردەوە بلـێی: «من خـاوەنی سێ ژنم، ئەوە چەند جـارە هەرچەند تێ دەکۆشم نە کچە دڵم دەداتێ، نە دایک و باوی قایلن، ئیدی بە چ ڕووێکەوە بچمە کنی. بێ نامووس هەستە بڕۆ ملت بشکێنە، دەنا هەر ئێستا لە دووی براکانم دەنێرم بێن لەت و پەتت کەن. نامەردی ناپیاو ئەتو مەردایەتی و پیاوەتییەکەت هەر لە مەیدانی قەڵایێ دەتوانی بنوێنی و تەنیا هەر ئی ئەوەی باج و ماج لە بازرگانان وەرگری. هەستە بەستۆی وردت، بریا قەت جارێکی دیم چاو بەسەر و گوێلاکی ناموبارەکت نەکەوتباوە.

پاشان دلبەر ڕووی دەمی لە برا چکۆلەی کرد، لێی توورە بوو، گوتی:

– بۆچی هێشتت وەژوور کەوێ:

– دلبـەر گیـان من دەڕۆم، بـەڵام لە پاشـان خـۆت پەشیـمـان دەبییـەوە. من دەزانم گراوی کوڕی عەدیت. سـەڵا لە ئاقڵت، ئەو لە کوێ و خـورشید لە کوێ؟ منێکی لـە تاران و بەغدا و مووسڵ و ئەستەمبـوولێ ناوبانگم ڕۆیشـتبێ ئەو کـێـیـە؟ ئـەوا لاتێک بـوو و نەبوو؛ ئـەمن نازانم تـۆ بۆ دەبی بـەکـۆسپ لـە ڕێی بەختی خۆتدا؟

کاتێکی خورشید هەر دەیرست و نەیدەبرییەوە، دلبەر بەبێ دەنگ بەگوێی براکەیدا چرپاند، گوتی:

– گورجێ ڕاپەڕە، برۆ ئەسپەکەی لە سنگی بکەوە، بەرەڵای کە بەشکو بەبۆنەی ئەسپەکەیەوە ملی دەشکێنێ دەڕوا.

دلبەر پشتی لێ کردبوو، وەستابوو، کەم تا کورتێک وەڵامی نەداوە، خورشیدیش پاش ئەوەی لە قسەکانی بووەوە لە ڕەشماڵێ وەدەرکەوت، چوو بۆ کن ئەسپەکەی، بەڵام ئەسپ لەوێ نەمابوو، کابرا دڵی داخورپا، ئەملا ئەسپ ئەولا ئەسپ، دیار نەبوو، بەجارێ دڵی کەوتە پەژارە و هەراسان بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی:

– کەواتە ئەسپەکەیان دزیوم.

بەڵام پاشان تەماشای کرد ئەسپەکەی وا لەو ژێر بەستەوە بەرەوخوار بۆی دەکشێ. خورشید وەدووی ئەسپی کەوت، لێی دا ڕۆیی. کچە دراوسێیەکانی ماڵی دلبەر کە ئاگایان لەو کەین و بەینە بوو، دایانە قاقای پێکەنینێ، هەندێکیان بەقەستی، بۆ ئەوەی خورشید گوێی لێ بێ، بەدەنگێکی بەرز گوتیان:

– ئەیەرۆ کیژێ پۆرو نەبرن، خۆ ئەوە خورشیدی بازاڕباشیی خۆمانە، تو خوا بنۆڕە دلبەر چ ئەتکێکی بەسەر ئەم پیاوە ماقووڵە هێناوە، بڕۆنێ چۆن بەدووی ئەسپەکەیەوە تەکان دەدا. کیژینە، داخوا دلبەر لەسەر چی ئەم پەندەی پێ دابێ؟ هەندێکی دیکەیان گوتیان:

– نۆشی گیانێ بێ. لە بیرتانە چۆن نەیدێشت شمەکان بفرۆشین و هەمیشە باجی لێ دەویستین.

خورشید بەئاشکرا گوێی لە حیلکە حیلکی کیژۆڵەکان بوو، بەڵام چیی دەسەڵات بوو، ناچار سەری شۆڕ کرد و لێی دا ڕۆیی.

بۆ ڕۆژی دواییێ دلبەر لەسەر کانی تووشی نانێی خوشکی شەباب هات، بەدوورودرێژی حیکایەتەکەی خورشیدی بۆ گێڕاوە کە چۆن هاتووەتە

ڕەشـمـاڵی مـاڵی مـەخـسـوودی و چۆن خـۆی بەخـشڵ و زێڕ و سـامـانەوە هەڵکێشـاوە و ئەمیش چۆن براکـەی گـاڵ داوە ئەسـپـەکـەی بەرەڵڵا بکا و خورشـید چۆن لە بەرچاوی هەمـوو دراوسـێیان شپـرزە بووە و بەڕاکە ڕاکە دووی ئەسپەکەی کەوتووە ڕۆیشتووە. هەردوو کیژۆڵە قەدەرێ پێکەنین، ئینجا نانێ گوتی:

– ئەم کابرایە چەند ئاڵچاخە، داک و باوت چەند جاریان پێ گوت: ئێمە کچ بە تۆ نادەین، ئەتووش خـۆت چەند جـارت پێ گـوتووە، کـەچی هیچ شـەرمی بەخۆی نییە و تەریق نابێتەوە و هەر واز ناهێنێ، کنا، خۆ سێ ژنیشی هەیە، چەند منداڵی هەن، کوڕێکی هەیە، باقڵ بەزای برا چکۆلەی تۆ دەبێ.

– کـیژێ چ دەڵێی نانێ، کـوڕی ئەو زۆر لە برای من گـەورەترە. ئەو هەمـوو ڕۆژێ دەچێ فێری مەشق دەبێ، ها، کەی بوو کە پێراری خوێندنی لە کن مەلا ڕەشید تەواو کرد. برای من تازە ئەمساڵ خەریکە دەچتە بەرخوێندن.

– بەڕاسـتی کـابرایەکی ئاڵچـاخ و بێ نامـووسـە. ڕەنگە پێی وابێ ئەم بازاڕباشێتییە شتێکی زۆر گەورە و گرنگ بێ، چما نازانێ لە نێو مەمانان‌دا، هەر ئازایەتی و کـەڵەمـێـردی نیـشـانەی پیـاوەتی و مـەردایەتیـیـە، نەک بازاڕباشێتی و شتی دی.

– ئەرێ بەڕاست لە بیرم چوو بۆت بگێڕمەوە، دەیگوت: « تۆ دەزانی ئەمن کێم؟ من خاوەن شـان و ناوبانگێکی وام شـار نییە نێوی منی نەبیستبێ، من لە کوێ و کوڕی عەدی لە کوێ، لاتی وا چییە؟»

نانێ دایە قاقای پێکەنین، گوتی:

– ئەشەدوبیللا ڕاستی فەرمووە! بەڵێ شار نییە نێوی نەبیستبێ، بەڵام نەک بەقارەمان و دلێر، بگرە وەکو خورشیدی بازاڕباشیی شاری قەڵا. ئەی نابینی خانۆ قەتی لەگەڵ خۆ نابا بۆ شەڕ. دەڵێ: «تۆ هەر ئاگاداری بازاڕ و مەیدانی وڵسات و پەزان بە نەبا یەکێ گوێدرێژێ، بزنە گەڕێ بدزێ...»

هەردوو کچە دیسان دایانە تریقەی پێکەنین. ڕاستە سەرەتای بەهار بوو و

پەز زابوون، بەڵام ئەویٚ ساڵیٚ وەکو ساڵانی دی نەبوو، بەهارەکەی وەکو جاران، هێند خۆش و دڵگیر نەبوو. ساڵانی پێشوو کاتێکی پەز دەزان دەبوو بە شایی و زەماوەند، لە دەهۆڵ دەدرا، زورِنا و تولَووم دەژەندرا، ئیدی لە هەموو لایەک دەبوو بەکەیف و، خۆشی بە نێو خەڵکدا بڵاودەبووەوە. ئامۆزا و خاڵۆزا و دۆست و خزم و خوێش و دەر و دراوسیٚ زیافەتیان بۆ یەک دەکرد، هی واش بوون لەنگەری و سینییە پلاو و چێشت و قلیاو مرتۆخیان دەبەشییەوە، هەر لە سبەینێرا تا بانگی شێوان گرمەی دەهۆڵ و زورِنا دەهات. جحێلان گۆرانییان دەگوت، دوو سیٚ رِۆژیان بەهەڵپەرِکیٚ و کەیفەوە رِادەبوارد، هەندێک بەگەمە و گاڵتە دەیانبردە سەر، هەندێک لە هەرزەکار و قۆشمە و گەوەزان شوانەکانیان دەخلافاند، کلاوەکانیان لیٚ دەشاردنەوە و پاشان لە یەکیان دەپرسی:

– کاکەی شوان کوا کلاوەکەت؟ ئەتوو چۆن شوانێکی، ئەورِۆ کلاوی سەرت ون کەی سبەینیٚ مێگەلان چۆن دەپارێزی؟

ئیدی دەبوو بەهەنگامە و بەزم و پێکەنینێکی وا ئەوسەری دیار نەبیٚ، هەرکە پەز دەزان شوان دەبوونە خاوەن بەشی خۆیان، چونکە هەر شوانە بەرخی هەرە چاکی پێشوەخت لەبۆ خۆی دەستنیشان دەکرد و دەیکرد بە شەکە دەستەکی خۆی. هەرکە پایز دادەهات بەرخ دەبوو بەکاورِ، ئیدی بیٚ ئەوەی خاوەن مێگەل بڵیٚ حاڵیٚ یا تەوریٚ هەرکەسە دەسنیشانی خۆی هەڵداوێرد و بۆ خۆی دەبرد.

ساڵانی پێشوو شایی و زەماوەند نەک تەنیا هەر لە وار و شەوێناندا، لە گوند و شارەکانیشدا دەگێرِدرا. بەڵام ئەم بەهارە وەکو جاران هێند خۆش نەبوو. خەڵکەکە زۆر کز و دڵ بەکوڵ و کەسەر بوون، پایزی رِابردوو قۆشەنی شای ئێران خەڵکێکی زۆری لە گەرمژ و قشلاخان کوشتبوون. هێشتا گەلیٚ دایک و خوشک و ئامۆزا و پوورزا رِەشپۆش و پرسەدار بوون و لەبری شایی و زەماوەند دەچوونە سەر گۆرِی کەسوکار و ئازیزان، سەد تووک و نەفرینیان لە شای ئێران و پادشای رِۆمی دەکرد کە چۆن بوون بەمێمڵی گەلی کورد و

ناهێڵن ئاسوودە بژی.

بەهاری ئەوساڵ تا بڵێی بێ شەوق بوو، بەڵام بەرهەمی پەز و مەڕ و ماڵات هاتی بوو. کوردەواری سەرلەنوێ دەبووژاوە؛ چونکە کورد تەنیا بە بەروبوومی پەز پتر دەبووژاوە و هەر ئەوەش دەبوو بەمایەی کۆکی و فرە سامانیی بووجەی دیکەی. هەر بۆیەش نوێبەرەی داهاتیان بۆ ماڵی یەکدی دەنارد و یەکتریان بانگ دەکردە سەر زیافەتان و لە هەموو ماڵێک: «دەوڵەت زیاد و ماڵی ئاوا» بوو.

نانێ خۆی پێ ڕانەگیرا، گورجێ لە دووی شەبابی برای نارد کە خێرا بێ و قاسیدی ڕاسپارد، گوتی:

– بە شەبابی برام بڵێ: «هەرچی سەری تەڕە بابێ لێرەکانە سەری سوور کا.» ماڵی عەدی کە چاویان بە قاسید کەوت و گوێیان لەو ڕاسپاردەیەی نانێ بوو بەجارێ دڵیان داخورپا و ترسیان ڕێ نیشت. گوتیان:

– دەخیلە چ قەوماوە؟

پرسییان: گدیۆ خۆت و بەختت، ئامان، ڕاستی بڵێ، خۆ منداڵ و مەزن ساخ و سەلامەتن!

گەدەش سوێندی دەخوارد: «وەڵڵا چ نەقەوماوە و شوکور هەموو ساخ و سەلامەتن».

دایکی شەباب پرسی:

– ئەی لەبەرچی نانێ وا بەپەلە لەدووی شەبابی ناردووە؟

سەر لە ئێوارێ بوو، شەباب خۆی کۆکردەوە، سواری ئەسپی بوو بڕوا، بابی پێی گوت:

– کوڕە، تازە درەنگە، سبەینێ بڕۆ. بەرەبەیان وا بەڕێ کەوە، بۆ ئێوارێ لەوێ بی.

بەڵام شەباب ئارامی لەبەر بڕابوو، نەیدەتوانی گیر بێ، شیر و مەتاڵی نوێی لە شان کرد و تیروکەوانی هەڵگرت. سواری ئەسپی بوو و بەڕێ کەوت.

شەباب هەر لە ئێوارێوە تا مەلابانگدانێ بەڕێوە بوو، لە هیچ شوێنێ دانەبەزی تا گەیشتە وارگەی. هەرکە گەیشتە وێ تازە بەیانی دابوو، تەیر و توو جریوە جریویان بوو. کە لە ڕەشماڵان نیزیک بووەوە سەگەل بەحەپە حەپ گەمارۆیان دا. شەباب ناوی سەگەکانی دەزانی بانگی کردن:

– «قاپڕەش، کوڵە»

سەگەل دەنگی شەبابیان ناسییەوە، لە پڕ کڕبوون. شوان گوێیان لە حەپەی سەگەل بوو، گورجێ تیریان دە کەوانێ ئاوێت، بەپەلە هەرکەسە لە زنجێ وەدەرکەوت، تەماشایان کرد ئەوە شەبابە، لە پێش ڕەشماڵێ دابەزیوە، وا خەریکە ئەسپەکەی دەبەستێتەوە. سەگەلیش بەدەوریدا گەپیان دەدا و کلسکەسووتەیان دەکرد، دەتگوت بە هاتنی شەباب زۆر بەدەماخن.

شەباب سڵاوی لە گەورە شوان کرد، پرسی:

– خۆ چ نەقەوماوە، ساخ و سەلامەتن؟

– عەلەیکومەسەلام، شوکور هەموو سەلامەتین.

– ئەدی بۆچی نانێی خوشکم وا بەهەڵەداوان لەدووی ناردووم؟

– وەڵڵا نازانم چت عەرزکەم، بەش بەحاڵی ئێمە و پەزەکان هەموو ساخ و سەلامەتین.

شەباب وەژوورکەوت، نواڕی نانێی خوشکی هێشتا هەر لە نێو نوێندایە و نووستووە. لێفەی لەسەر لاچوو بوو، لۆیەکی کەوتبووە سەر لبادەکەی ژێری، دەرکەوتبوو. کەزییە ڕەشە درێژەکانی لەسەر سەرینەکەی شۆڕ بووبوونەوە. شەباب بەکاوەخۆ لۆی لێفی خستەوە سەر خوشکی و داپۆشییەوە. بەئاسپایی چووە ژوورسەری، کەزیەکانی جوان و زەریف هەڵگرتەوە و خستنییەوە سەر سەرینەکەی. سەری شۆڕکردەوە، ناوچاوانی ماچ کرد، نانێ لەتاو سەرمای بەیان ڕاچڵەکی و بەخەبەر هات کە چاوی هەڵهێنا تەماشای کرد شەباب لە ژوورسەری وەستاوە. لە پێشان ترسی ڕێ نیشت، بەڵام کە وەبیری هاتەوە، خۆی لەدووی ناردبوو، گوتی:

– شەباب گیان، قەتم باوەڕ نەدەکرد وا زوو بگەیە ئێرە، پێم وابوو ئێوارە درەنگێک دەگەیە جێ. پێم بڵێ، باڵت گرتبووەوە، ڕەشەبا هێنایتی؟

– ئەدی تۆ خۆت لە دووت نەناردووم: خێرا بگەمە کنت؟ منیش دوێنێ هەرکە خەبەریان دامێ سواربووم، بەسەرڕەو هاتم.

ڕاستیت دەوێ دایکیشم و باویشم زۆر نیگەران بوون و وەپەژارەکەوتن. دە بڵێ بزانم چ قەوماوە کەسی برای؟ ئەمن لە گەورە شوانم پرسی، گوتی: «هەموو ساخ و سەلامەتین».

– بەڵێ، ئەرێ وەڵڵا، هەموو ساخ و سەلامەتین، دە تۆ جارێ بێ زەحمەت وەدەرکەوە، تا خوشکی خۆت خۆی پۆشتە دەکاتەوە، هەنگێ قسەت بۆ دەکەم لەبەرچی لە دووم ناردووی.

شەباب وەدەرکەوت چوو بۆ کن کۆزی بەرخەل. مەڕ هەموو زابوون و مۆڵگە پڕ بوون لە بەرخ و ساوا. چاوێکی بەبەرخەلەکەدا گێڕا، تەماشای کرد هەموو چاویان قوچاندبوو، دەتگوت کۆرپەی نێو لانکانن. لەسەرەخۆ کاوێژیان دەکرد، شەباب لە دڵی خۆیدا گوتی:

– بەڕاستی سەیرە، خۆ وەک ئادەمیزاد دەچن.

دەرگای کردەوە تۆزێ لێیان چووە پێشێ، لە پڕ وشیار بوونەوە، دەستیان بەبارە بارێ کرد. ئەوجا گەورە شوان و شەباب کەوتنە قسەکردن، کە چۆن ئەمساڵ پەزەکانیان زۆریان جمێیان بووە. ئەوجا چوو دەستنیشانی خۆی گرت، هێنای، گوتی:

– شەباب گیان، تەماشا، چ بەرخێکی جوانی خرتی دوگ خڕی مل ئەستوورە، کەمێ لە بەرانە دوگ زلە مل ئەستوورەکەی خۆمان ناچێ؟ ئەمەم کردووە بەدەستەکی ئەو ساڵی خۆم.

شەباب گوتی:

– وەی پیرۆزت بێ، ئەی شتی وا شیاوی تۆ نەبێ ئی کێ بێ؟

هێشتا لە نێو بەرخەل بوون، نانێ خێرا نوێنەکانی قەد کرد، چوو

دەموچاوی شوشت، ئەوجا چەند مەڕێکی دۆشی و گورجێ تاشتی سبەینێی حازرکرد. پاشان بانگی شوانەکان و شەبابی کرد بێن تاشت بکەن نانێ دەسخوانێکی خاوێنی سپی لەسەر لبادی ڕاخستبوو. شوانەکان ڕۆنیشتن تاشتیان کرد. شەباب هێشتا شێوی ئێوارێی نەکردبوو، دەبوو زۆر بەئیشتیاوە تاشتی کردبا، بەڵام هەر بیری دەکردەوە. ئاخۆ نانێی خوشکی بۆ لە دووی ناردووە، هەرچەندی دەیکرد و دەکۆشا تاشتی بۆ بەگەروودا نەدەچوو، ئیدی هەر لە پەژارەدا بوو و لێکی دەداوە: «ئاخۆ نانێ بۆ لە دووی ناردووم، دەبێ چ سرێک بێ و نایدرکێنێ؟»

کوڕە خۆی نەگرت، لە خوشکی پرسی:

– خوشکێ، نانێ گیان، پێم بڵێ بۆ وا بەپەلە لە دووت ناردووم؟ نانێ پێ کەنی، گوتی:

– برا گیان، جارێ تاشتی بخۆ، تۆ ئەو ساڵ هێشتا خلندۆر و لۆرکێت نەخواردووە. با شوان تاشتی خۆیان بخۆن و بەلای کاری خۆیانەوە بچن، هەنگێ پێت دەڵێم.

ئەم قسە نهێنییانەی خوشکی هێندەی دیکەی ئاڵۆزاند، نەیدەزانی چۆن نان دەخوا شوان هەموو نانی خۆیان خوارد و چوون بەرخەلیان تێ بەردا. گەلۆ، بوو بەقاڕە قاڕ و باڕە باڕێک کەژ و کێو دەنگی دەداوە و بەتۆ با هەر گوێ بگری.

عێلی بەرۆدار هێندێکیان نیشتەجێ بوون، بەڵام زۆربەیان هەر خەریکی پەز بەخێوکردن بوون. کە دەغڵودانیشیان دەچاند هەر هێندەی دێنا، کە بەشی خواردنی خۆیانی دەکرد. دەمڕاست و ڕدێن سپییان دەیانگوت:

– دەغڵودان چاندن و کشتوکاڵ کارێکی خراپ نییە، بەڵام پیت و بەرەکەت و خێر و بێر لە پەز و وڵساتدایە. کورد بێ گۆشت و سپیاتی هەڵناکا، بەڵام عەجەم بەتۆڵەکەش بەرێ دەچن و گوزەران دەکەن.

پاش ساوا تێبەردانێ، قەدەرێکی پێ چوو، تا ساوا تێر شیر بوون، ئەوجا

لە دایکیان هەڵاواردن و ڕایان دان ڕۆیشتن. کە شوان ڕۆیشت نانێ قسەکەی بۆ شەباب گێڕاوە، گوتی:

– دوێنێ نا پێرێ دلبەرم لەسەر کانیێ بینی، بۆی گێڕامەوە:

کە خورشید هاتووەتە واری وان و زۆر بەباهووی خۆی و سامان و خشڵ و زێڕیدا هاتووە و ویستوویە شووی پێ بکا. دلبەریش نەیکردووەتە نامەردی، ڕاست و ڕەوان دەری کردووە.

شەباب کە ئەوەی بیست بەجارێ کەللەیی بوو و لە نانێی خوشکی تووڕە بوو دەستی بۆ خەنجەرێ برد، گوتی:

– دەبێ هەر ئێستا ئەو زۆڵی لە زۆڵ بووە لەتوپەت کەم.

کوڕە بەجارێ ئارامی لەبەر بڕا، هەستا چوو سوار بوو، نانێی خوشکی هەرچەندی کردی و کۆشا، پەشیمانی کاتەوە، لە کەللەی شەیتانی بێنێتە خوار، کەڵکی نەگرت، گوتی: «خوا یەکە و نابێ بە دوو هەر دەڕۆم. شەباب لێی دا و ڕۆیی».

وارگەی ماڵی خورشید تەواوێ دوور بوو. هەرکە گەیشتە گۆڕخانی قشلاخێ نیوەڕۆیەکی درەنگ بوو. ئەسپەکەی لە دوێنێ ئێوارێوە دانەکرابوو، گۆڕخانەکە لەوەڕی خۆش بوو لە ئەسپەکەی دابەزی، بەرەڵڵای لەوەڕێی کرد، خۆشی چووە نێو نەزرگان. وەبیری هاتەوە کە چۆن لەگەڵ دایکیدا دەچووە سەر گۆڕخانی قەڵا و یەکە یەکە باسی فلان مێرخاس و فیسارە کەڵەمێردی بۆ دەکرد، ئەمیش خەیاڵی بۆ ئەوە چوو کە ئەو کێلە قۆچ بەرانە وێ دەچێ ئی مەزنی هۆزێ یان ئی مێرخاسێکە. ئەو گۆڕە کە کێلەکەی وێنەی شێرێکی لەسەر هەڵکەندراوە، دیارە ئی سەرۆکی عەشیرەتێکی گەورە بووە و هەمیشە لە دژی شا و سوڵتانان جەنگیوە. ئەوی دیکەیان کە وێنەی ئەسپی لەسەر هەڵکەندراوە ئی پیاوی ئازا و نەبەز و شۆڕە سوارە، ئەوی دییان کە وێنەی جۆلانەی لەسەر هەڵکەندراوە ئەوە ئی بێ مراد و وەجاخ کوێر و بێ تۆرە و سۆرە و ئەستیورە! شەباب کەمێکی دی لە گۆڕخانەی هاتە پێشێ چاوی بە

گڵکۆیەکی گەورەی سەر بەگومەزی تازە بیناکراو کەوت، هەرچەندی خەریک بوو چ سەرەودەرەی لێ دەر نەکرد. بەهاری ئەو دەشت و دەرە تەواو گوڕی تێ گەڕابوو و لە هەڕەتی هەڵدانیدابوو، مرۆ لە بۆن و بەرامەی عەتری ئەو دەشتە تێر نەدەبوو. شەباب ئەسپەکەی لەوێندەرێ بەجێ هێشت. خۆشی وەژوور گۆڕخانی کەوت، نۆڕی شوانێک لە سەروویڕا بەسەر ترۆپکی زنارێکەوە ڕۆنیشتووە. پەزەکانی بەدەوروبەریدا بڵاوەیان لێ کردووە و دەلەوەڕێن. خۆشی بلوێری بەدەمییەوە ناوە و پڕ بەو مەڵبەندەی دەچریکێنێ. شەباب قەدەرێ گوێی ڕایەشت بزانێ چ بەندە و کیهە مقامە. کە لە بەند و مقامی گەیی، لەبەر خۆیەوە ئەویش نەرم نەرم ئەمەی گوت:

بێژنگ برێ، بێژنگ برێ

بێژنگ بەسەری بابتدا خرا بکرێ

زوو خەبەر بدە ماڵێ

پەزی بابی تو دز بردی.

شەباب وەبیری هاتەوە کە چۆن لەو داستانەدا دەگێڕنەوە:

«ئاغا دەرهەق شوانەکەی ناپیاویی کرد، کچی خۆی نەدایێ». ئەو داستانە بەبۆنەی ئەو سەربهوردەوە گوتراوە.

شەباب پاش هەندێ کە ئەسپەکەی تێر لەوەڕا، سوار بوو ڕۆیی. هەر کە گەییە ماڵی خورشید، نیوەڕوانێکی درەنگ بوو.

لە بناری وارگەیڕا چۆمێکی بچووک دەکشا، پێنج شەش منداڵ بەو بەرەوە یارییان دەکرد، کەمێکیان لێ نیزیک بووەوە، پرسی:

– منداڵینە، ڕەشماڵی ماڵی خورشیدی بازاڕباشی کیهەیە؟

کیژێکی چکۆلە دەستی بەرەژوور درێژکرد، گوتی:

– مامە، هۆوەتێ لەو سەری، ها لێرەڕا دیارە.

شەباب دایکێشا ڕۆیی، نەگەیشتبووە پێش ڕەشماڵی بیری کردەوە «چی بەخورشید بڵێ». لە دڵی خۆیدا بڕیاری دا پێی بڵێ:

– «ناپیاو، بێ نامووس، ئەگەر پیاوی بۆم وەرە پشت ڕەشماڵێ تا دوو قسەی مەردانەت لەگەڵ بکەم، دەنا خودام نەبێ لاشەت بەدەردێ بەرم مەگەر لاشەی سەربازی ئێرانێ بەو دەردە چووبێ کە پار پایز بەر قەل و دالاشان کەوتن».

شەباب دە بیر کردنەوەیدا بوو، لەنکاو ژنێکی ڕەشتاڵەی سەر و کەللە خشتی، مل بەمتومۆری، دەست پڕ لە بازنی بەغدایی بەپیرییەوە هات، گوتی:

– برا فەرموو پیادە بە، بۆ بەسواری وەستاوی؟

– خوشکم پیادە نابم، کارم بەمێردەکەتە، پێی بڵێ وەدەرکەوێ.

– مێردەکەم لێرە نییە و دوێنێ بۆ قەلا گەڕاوە. نازانم چۆن ملی ئەو ڕێگا دوورەی گرت ڕۆیی؟ قەتیش بە پێ نەڕۆییوە.

شەباب کە ئەمەی بیست وەخت بوو لە داخان بەندی دڵی بپسێ. کەمێکی دۆش داما. ژنە دیسان گوتی:

– برا، دەفەرموو دابەزە، تۆ میوانی، هیچ نەبێ نانێ ئاوێ؟

– ئاوەدان بێ. خوشکێ، تۆ دەڵێی: «مێردەکەم بەپێ گەڕاوە، ئەدی ئەسپەکەی»؟

– برا، چت عەرزکەم، خورشید بۆ ئەو وارگەی سەرەوە چووبوو، نازانم بۆ ماڵی کێ؟ ئەسپەکەی لە پێش ڕەشماڵێکی دەبەستێتەوە، ئەسپ، جڵەوی بپسێنی و هەڵێی. خورشیدی داماویش هەرچەند دەکا ئەسپی بۆ ناگیرێتەوە. ئەسپ بەچوار ناڵ و سەڵەف تێی دەتەقێنێ، ناوەستێتەوە تا خۆی بەنێو شاری قەلایدا دەکا، بەبرای خۆم بڵێم، خورشیدیش بەلۆژە لۆژ ئێوارێ درەنگێک بۆ ماڵ گەڕاوە. ئەوێ شەوێ لە ماڵێ ماوە، بۆ سبەینێ تاریک و ڕووناک لە خەو ڕاپەڕی لێی دا گەڕاوە. کەساسە داخۆ کەنگێ گەیبێتە قەلا.

شەباب گەڕاوە وارگەی خۆیان. بەسەرهاتەکەی هەموو بۆ خوشکی گێڕاوە. نانێ گوتی: «بەڕاست لە بیرم چوو بیگێڕمەوە. کاتێکی خورشید دەچتە ڕەشماڵی مەخسوود، دلبەر برا چکۆلەی فێر دەکا جڵەوی ئەسپەکەی

خورشیدی لە سنگی بەر ڕەشماڵێ دادەماڵێ، ئەسپەکەش ناکاتە نامەردی قەڵا خۆ بگرە هاتم، ڕاست دەگەڕێتەوە. کاتێ خورشید لە ڕەشماڵی وەدەردەکەوێ دەنۆڕی ئەسپ نەماوە. کیژۆڵان ئاگاداری ئەو بەزمەی دەبن، دەدەنە حیلک و هۆڕی پێکەنینێ، ئەویش بەشەرمەزارییەوە مل شۆڕ دەکا و دەڕوا.»

چەند ڕۆژ بوو شەباب لە کن خوشکی بوو. لەنکاو ڕۆژێکی قاسیدێک لە قەڵاڕا هات، بەهەموو وارگاندا گەڕا: فەرمانی خانۆی بەهەمووان ڕاگەیاند: «ڕۆژی هەینی کۆڕێکی گەورە و فرەوان دەگیرێ». شەباب هەر کە ئەو فەرمانەی بیست، ئیدی نەیپەرژا بوەستێ، سوار بوو، ڕاست بۆ قەڵا گەڕاوە. کە گەیشتە قەڵای نێزیکی نیوەڕوانێ بوو، بۆ بەر ماڵی خۆیانی ئاژوا، تووشی باوی بوو، گوتی:

– کوڕم چا بوو لە وەختی خۆیدا گەیشتییە جێ، خەڵقی هەموو لە دیوەخانێ حازرن. تۆ بچۆ وا منیش هاتم. شەباب وەکو سەرپەلێک خێرا بەهەموو چەکییەوە چوو بۆ کۆڕ. دیوەخان هێند پڕ بوو یەکی دیی نەدەگرت. هەندێ لای خوارێ لەسەر چۆکان ڕۆنیشتبوون، هەندێ بەپێوە وەستابوون. بەڵام هەرچەندی کرد لەبەر دەرکیش جێگەی بەدەست نەدەکەوت بەپێوە بوەستێ. کوڕەکانی خانۆش هەر شەشیان لە ژێر داڵانی دیوەخان بەپێوە وەستابوون، دەبوو هەمیشە لە خزمەت باوکیاندا دەستە و سینگ بوەستن. سێ و چوار قەننەدار هەر خەریکی قەنەنە داگرتن و پووشوو ئایساندن بوون و بەدەم قەننەی مەزن و دەمڕاستانەوە دەچوون.

سەرۆک دیوەخان گوتی:

– قوربان، هەندێ هۆز و عەشیرەتەکانی ناوچەی دوورەکان تازە تەشریفیان هێناوە، لێرە جێ نابێتەوە، وا بەچاک دەزانم کە هەموو بۆ نێو باخچەی تەشریف بفەرموون، ئیدی بەهارە و هەوا خۆشە. لە پێشدا خانۆ، ئەوجا جەماوەرەکە، هەموو وەدەرکەوتن. سێ سەد مافووریان، بگرە زیاتریش، لە باخچە ڕاخستبوو. هەر مافوورە چوار پێنج پشتی و بالیفی پەڕاخنی

لەسەر ڕیزکرابوون. کاتێ جەماوەرەکە هاتنە نێو باخچەی، خانۆ گوتی:

– فەرمووو ڕۆنیشن.

بەڵام تا خانۆ ڕۆنەنیشت کەس دانەنیشت.

خانۆ تازە داو داو سپی کەوتبووە سەری بەڵام هەرچی دەیبینی قەتی بڕوا نەدەکرد تەمەنی حەفتا و پێنج ساڵە. خانۆ نۆڕییە جەماوەرەکە، سرتە لە کەسەوە نەدەهات، هەموو چاویان بڕیبووە دەمی خانۆ، بزانن چ دەڵێ، بەڵام خانۆ جارێ هیچی نەگوت، وا دیاربوو چاوەنۆڕی باوی دەکرد. زۆری پێ نەچوو، پیرێکی کەڵەگەتی وەکو خانۆ بەدیارکەوت، نەجاخێکی زەلامی دوو دەوی بەسەر شانەوە بوو، دەستووی ڕەمب و نیوێ درێژ دەبوو. هەندێ میوانی نەناسی عەشیرەتی شکاکی لێ بوون، گوتیان: «هەبێ و نەبێ ئەوە باوی خانۆیە». چونکە لە بەژن و بالادا کوتومت لێک دەچوون و دەتگوت سێوێکن، کراون بەدوو کەرتەوە؛ فەرقیان هەر هێندەبوو باوی بەجارێ پیر بووبوو و ڕدێنی پاک سپی بووبوو، بەڵام هێشتا بەگوڕ بوو.

هات سڵاوی کرد، خانۆ بەرزە پێ لەبەری هەڵستا، ئینجا جەماوەرەکە هەموو لەبەری هەڵستا. باو چوو لە سەرووی کوڕییەوە ڕۆنیشت. خانۆ هەندێ سمێڵی بادا، گوتی:

– ئەو بەسەرهاتەی ئەورۆ بۆتانی دەگێڕمەوە لەمێژە قەوماوە. لاوینە، ئێوە نەتانبیستووە، بەڵام ڕدێن سپی و بەتەمەنینە، ئێوە چاکتان وەبیر دێ. لاو بووم. هەر هێندەی – دەستی بۆ لاوێک درێژ کرد – ئەو لاوە دەبووم و نەدەبووم ڕەوکەوانی مەنسوور بەگ بووم، ڕەوەکەی لە کێشدا نەبوو، زۆر گەورە بوو ئەگەر بڵێم خۆی لە چوار سەد سەر پتر دەدا هێشتا کەمم گوتووە. دوو بەشی ڕێکی ماین بوون. چوار ئەسپیان تێدا بوون هەم کێشکچی و هەم پێشەنگی ڕەوە بوون. یەکیان هێشتا جوانوو بوو، هۆگری خۆمم کردبوو، بەدەست نانم بەدەمییەوە دەکرد. وام ڕاهێنابوو هەرکە بەندی جریدبازیم لێ دەدا، دەهاتە کنم و بەدەمی خۆی نانەکەی هەڵدەگرت. جاروبارێکیش سواری

دەبووم. ڕۆژێکی، لە دەم ڕووباری بووم، دوو ڕۆژ بوو نانم لێ بڕابوو، کەسی واشم لێ نێزیک نەبوو ڕەوەکەی پێ بسپێرم تا بچم نان بێنم. ڕۆژی سێیەم ڕەوەم لە دەم ڕووباری بەجێ هێشت، لێم دا چووم لە ماڵەوە نان بێنم، تا چووم نانم هێنا و گەڕامەوە، نۆڕیم نەڕەوە ماوە نەهیچ. کەمێ ڕۆنیشتم تا ماندوێتیم حەساوە ئەوجا کەوتمە سەر و سۆراخی ڕەوە، ئەم یاڵ ڕەوە ئەو تەلان ڕەوە، نەڕەوە و نەهیچ، سەرتان نەیەشێنم چەند ڕۆژ گەڕام هیچ سەر و سۆراخێکم نەزانی.

جار جار لەبەر خۆمەوە دەمگوت: «کەواتا ڕێگر بردوویە». ناهەقیشم نەبوو؛ چونکە ئەوێ ساڵێ ڕێگر و جەردە ئێجگار زۆر بوون. زۆر جاران دەیاندا بەسەر مێگەل و ڕانانادا دەیانبردن. هەتا جارێکی بەسەر خۆشمیان دادا، بەڵام خێریان لێ نەدیم، دووم لێ کردن بەخۆراکی دڕندە و داڵاشان.

ئیدی لەوێ ڕۆژێوە ببڕای ببڕای تخونم نەکەوتن. مەنسوور بەگ، گوتی:

– تۆ ئەوە چەند ساڵە ڕەوکەوانی منی و زۆریش دڵسۆز بووی! ئەوێ جارێ کە جەردە و ڕێگر بەسەریان دادای، ئەوە بوو وات تەمێ کردن، ئیدی جارێکی دیکە نە لە خۆت نە لە عەشیرەتی بەرۆدار نێزیک نەکەوتنەوە، پێم ناڵێی ئەمجارە ئەو ڕەوەیەت چۆن لێ ون بوو؟

ئەمنیش چۆن بوو وام بۆ گێڕاوە.

پرسی:

– باشە، تۆ ڕەوەکەت لەم بەر یان لەو بەری ڕووبار بەجێ هێشت؟ گوتم:

– بەگم، لەم بەرم بەجێ هێشت. جا من چۆن لە سنووری ئێران ڕەوە بەجێ دێڵم، خۆ شێت نیم؟

– دە کە هێندە ئاقڵ و ژیری، ئەوا دوو ڕۆژم مۆڵەت دای، بڕۆ، لە ڕەوەکە بگەڕێ، بەو دوو ڕۆژە سۆراخت زانی و گێڕاتەوە باشە، دەنا بەخوا پێستی سەرت دەگرووم، پڕی کای دەکەم، ئیدی لەسەری مەڕۆ.

ڕاستی مەنسوور بەگ پیاوێکی زۆردار و بێ داد بوو. چەند ڕەوکەوان و

ڕەنجبەری لە ژێر داردا کوشتبوو.

ناچار لێم دا ڕۆیشتم، بەڵام چەند گەڕام ڕەوەم نەدۆزیەوە، خوایە چ بکەم؟ بڕیارم دا ئیدی نەگەڕێمەوە، هەر لەو کەژ و کێوانە بمێنمەوە. ڕۆژێکی مەنسوور بەگ لە دووی باوم دەنێرێ دەڵێ:

– «ئەگەر خانۆی کوڕت ڕەوەکەم بۆ نەدۆزێتەوە، پێستی سەری دەگرووم و پڕی کا دەکەم و ئێوەش بە ورد و هەراشتانەوە تەفر و توونا دەکەم». مەنسوور بەگ کە ئەو قسانە بە باوم دەڵێ بیری لەوە نەکردبووەوە کە چەند جار دز و ڕێگر بەسەر ماڵ و عەشیرەتیاندا دەداین، خۆم و باوم لێیان ڕادەپەڕین، نەماندەهێشت بزگوڕێکمان بچێ، بزنە شەلێکمان تالان بکرێ، فەرموو با ڕدێن سپییان خۆیان بیڵێن ڕاستە یان نا؟ ئەم مەنسوور بەگە زۆر زاڵم بوو، ناچار ماوەیەکی دوورودرێژ شەو و ڕۆژ بەو کەژ و کێوانەوە بووم، تا وام لێ بەسەر هات ئیدی بەرگەم نەگرت. نیوەڕۆیەکی لەسەر چیایەکی بڵند نیزیکی ئاقاری ئێرانێ خەوم لێ کەوت. خێر بێ لە خەومدا بلوێرم لێ دەدا. ڕوانیم ڕەوەکە دوای ئەسپی پێشەنگ کەوتووە و بەرەو لای خۆم دەجمێن. لە خۆشییان خەبەرم بووەوە، بەڵام نەڕەوە هەبوو و نەهیچ.

پاشان تێ فکریم، گوتم: بەڕاست من بۆ دەست بەبلوێر لێدان نەکەم؟ بڕوام وابوو پێشەنگان دەنگی بلوێریان بەرگوێ کەوێ، لە هەر جێگەیەک بن بەدەنگییەوە دێن. بلوێرم لەبەر پشتێنم دەرکێشا، دەستم بەبلوێر لێدانێ کرد. ناڵەی پیرە بلوێر بەو چیاو بەندەن و کۆسارانەدا بڵاو بووەوە و ئەو مەڵبەندەی هێنا جۆش و خرۆش. هەندێ جار پشوورییەکم دەدا، بزانم ئاوازی بلوێرەکەم تا کوێ بڕ دەکا. جارێکیان پشوورییەکم دا، هەستم کرد دەنگی حیلەی ئەسپە پێشەنگی دێ، بەڵام حیلە لە چ لاوە بوو؟ بەدیم نەکرد. هەر هێندە گوێم لە حیلە بوو، لە خۆشییان ئەوەندەی دیکە فووم بەبلوێردا کرد و تا توانیم بینم تێدا خواردەوە. نەخێر ئەمجارە گوێم لە خرینگەی چوار ناڵ و سمکۆڵان بوو. ڕەوەیەکی چوار سەد سەری کەم نییە بەڵام هێشتا بەتەواوی لێم ڕوون نەبووبووەوە دەنگی ئەم سمکۆڵ و چوار ناڵەیە لە کوێڕا دێ.

ئەمجارەش فووم بەبلوێردا کرد و یەک دوو بەندی دیکەم لێ دا.

کاتێ تەماشا دەکەم ئەوە ئەسپە کوێت لە پێشەوە و ئەسپە شێش لە پاش ڕەوەوە بەرەو ئێرە دێن. هەر دەتگوت ڕەوکەوانن. یەکیان لە پێشەوە سەرڕەو بوو، ئەوی دیکەیان لە پاشەوە دواڕۆژ بوو. ڕەوەم لێ نیزیک بۆوە و لەو بنارە گیرسانەوە.

ئەسپە دەساژۆکەم سەری هەڵبڕی و کەوتە گوێ لەقە و سەیرێکی کردم، وەکو لە دڵی خۆیدا بپرسێ:

- بۆ وا نیگەرانی، ئەگەر لە ئێمە دەپرسی هەموو ساخ و سەلامەتین و شوکور هیچ کەموکورتییەکمان نییە.

منیش جاخی نانەکەمم لە پشت کردەوە دەستەوارە نانەکانم دەرهێنا، ئەسپی تاین کە چاوی بە نان کەوت بەحیلە حیل هات بۆ کنم، هەرچی نان لە جاخەکەمدا هەبوو هەمووم لە پێش دەمی دانا. لە پاشان سواری بووم و بێ سێ و دوو ڕەوەکەم وەپێش خۆم دا و تا بەردەرگەی ماڵی مەنسوورم ڕەتاند، ڕەوە ئەسپەکەم بەخاوەنی گەیاندەوە، گوتم:

- فەرموو، ئەوە خۆت و ڕەوەت، بەڵام ئیدی من ڕەوکەوانیت ناکەم، بەسە ئیتر. ئەوە چەند ساڵە بەحەلاڵی و زولاڵی خزمەتم کردی.

مەنسوور بەگ ویستی بەزۆر بمگەڕێنێتەوە سەر ڕەوکەوانییەکەی، بەڵام بۆی دەرکەوتبوو، ئەگەر بە زۆریش بێ تازە جارێکی تر خێرم لێ نابینێ و لە زیان و زەرەر بەولاوە چی  دیکەی وەدەس ناکەوێ، ئیدی بەرۆکی بەردام و دەستی لێ هەڵگرتم. بەجێم هێشت هەر ئەو هاوینە مەنسوور بەگ کتوپڕ بۆ خۆی کۆچی دواییی کرد.

هیچ نەخۆشیش نەبوو. دەیانگێڕاوە، جارێکی قلیانە شوانانە زۆر دەخوا، ژانی دێتێ و بۆ خۆی دەمرێ. بەو ڕەنگە هۆز و عەشیرەتانی لە چەنگاڵ ڕزگار دەبن. کابرا زۆر شۆفار و لاپرەسەن بوو، زۆرداری و دەسدرێژییەکەی لەوەدا نەبوو. چەند جار لەگەڵ ئێرانیان بەگژی یەکدا چووین، ئەو خۆی دوورەپەرێز دەگرت و هەر مەمانانی دەناردە شەڕێ. هەرکە ئێمە سەر دەکەوتین و

تالانێکی زۆرمـــان لێ دەگـرتن هەمـــووی بۆ خـــۆی گل دەداوە و بـزگـورێکی خـواسـاییی بۆ نەدەهێشـتینەوە. بەڵێ ئێمە خـوێنمـان دەڕۆیشت و ئەو تالانی دەبرد: کـورد گـوتەنی: «کـردەی ئێمـە و بردەی ئەو بوو» پاش مردنی مـەنسـوور بەگ، بـەهـارێ بۆ کـوێسـتـانێ چووین. بەلام لـەسـەر لـەوەڕ و پاوەن لەگـەڵ عەشیرەتی شکاک بەگژی یەکدا چووین و شەڕێکی گەورەمان بوو.

نیوەی بانەمـەڕێ بوو، گوڵ و سۆسن خـونچەیان کـردبوو، گژوگیا تا چۆکان هاتبوو. لە مشوور خواردنی کار و فرمانی خۆمان چ خەمێکی دیکەمان نەبوو. ژیانێکی بەخـتـەوەرانە و سـەربەسـتـانە دەژیاین. دەربایسـتی هیچ نـەبووین، بەلام عـەشـیـرەتەکـەمـان هەروەکـو ئێـسـتـا ئاسـایی کـۆک و تەیـاربوون و لە بەرانبـەر هـەموو هێرش و مەترسـییـەکی ناگەهان ئامادە بوون؛ چونکە شـەڕی نێوانی ئێمە و ڕۆم و عەجەم هەر نەدەبڕاوە.

سبەینێیـەک پێیـان ڕاگەیاندین کە عـەشـیرەتی شـکاک بەڕێوەن هێـرشمـان بکەنە سەر، باوم گورز و کەمەندی هەڵگرت، گوتی:

– کوڕینە ئەمرۆ ڕۆژی غیرەتە، ئێمـە و وەستانیان نەگوتووە. خانۆ تۆ چەند سـوارێک لەگـەڵ خـۆ خـە و پێـشـیـان لێ بگرە. لێـیـان دەن و دەسـتـیـان لێ مـەپارێزن. ئـەمنیش لەگـەڵ چەند شـەڕکـەرێکی دیکەدا لـە کن کـانی ترشـەوە هەڵیان دەکوتینە سەر و تێیان دەکەوین.

ئێمەش بەو قەرارەی باوم فەرمووی. لە دوژمنی چووینە پێشێ و گەمارۆمان دان و کوشتارێکی زۆرمان لێ کردن، ئیدی لەوێ ڕۆژێیەوە وامان چاوترسێن کـردن، جـارێکی دیکە ببـڕای ببـڕای نـەهاتنەوە سـەرمـان، سـەرەڕای ئەوەش، کـاتێکی شـا عـەببـاس لەشکری تێ بەردان و تـالانی و بڕۆی کردن هەر ئێـمـە دەفریایـان هـاتین و بەهاوارێڕا چووین. لەپاشان کە لەگەڵیـان ئاشت بووینەوە، لێمان بیستنەوە کە شا عەباس دنەی دابوون بەگژماندا بێن، پێی گوتبوون:

– هەرچـی زۆزان و پاوەنێکی کـە بەدەسـتی عــەشـیــرەتی بەرۆدارەوەیە، پێشکەشی ئێوەی دەکەم، بچن لە عەشیرەتی بەرۆداری بۆ خۆتان بستێننەوە.

خانۆ، وەکو شتێکی وەبیر خۆی بێنێتەوە پشووێکی دا، ئەوجا گوتی:

– ئیدی لە پاشی ئەو شەڕەی، ڕۆژێکی، بەهار بوو، ماقووڵ و دەمڕاستی هەردوو عەشیرەتی بەرۆدار و شکاک کۆبوونەوە و بانگیان کردم، – شوکور هێشتا زۆرتان ماون و شاهیدن – خانۆ سەیرێکی جەماوەرەکەی کرد، گوتی: کە بانگیان کردم چووم. سوورهەنگێکی پیر لە پێش مەجلیسەکە وەستابوو، گوتی:

– خانۆ، هێشتاکە مەنسوور بەگ لە ژیاندا بوو، ڕاستە هەر ئەو بەگی مە بوو، بەڵام گەڕناسی عەشیرەتەکەمان هەر تۆی و لە تۆش بەولاوە کێشکچییەکی ڕاستەقینەی وەکو تۆمان نییە، تکات لێ دەکەین مەزنایەتیی هۆزەکەمان هەر بەخۆت ڕەوایە و خواستمان ڕەت مەکەوە.

منیش خواستەکەیانم پەسند کرد، بەگوێم کردن و ئەو ئەرکە گرانەم وەئەستۆی خۆم گرت و بەم بەهارەوە ئەوە چل بەهاری بەسەردا ڕادەبرێ.

خۆ بۆ خۆتان، گەورە و بچووک ئاگادارن، لەوەتی قەلامان بیناکردووە، چەند جاران شای ئێران لەشکری لێ کردین و هێرشی هێنایە سەرمان، بەچاوی خۆتان دیتتان: کە پار پایزێ چ قۆشەنێکی ناردە سەرمان، بەڵام پشت بەخوا و سایەی سەری عەشیرەتەکەمانەوە، نەمانهێشت هێندەی پووشکەیەک سەرشۆڕبین و نێومان چڵکن و لەکەدار بێ.

ئێمە خاکی نیشتمانی کەونارای باو و باپیرانمان هەمیشە پاراستووە و دەشیپارێزین. بەڵام دوور نییە دیسان لەشکرمان لێ بکرێ. پیاو چابن وەرن هەموو سوێند بۆ یەک بخۆین، تا یەکمان هەناسەی تێدا مابێ کۆڵ نەدەین و خاکی خۆمان بە دوژمن نەدۆڕێنین.

خانۆ کە لە قسەکانی بووەوە، سەرێکی هەڵبڕی، تەماشای جەماوەرەکەی کرد، هەموو سوێندیان خوارد تا ماون و خوێن لە لەشیاندا بگەڕێ بجەنگن و کۆڵ نەدەن و ژیانی خۆیان لە ڕێی نیشتماندا بەخت کەن و خاکی باو و باپیران لە دوژمن بپارێزن.

***



بەشی حەوتەم

# قاسیدی شەمدینان

شەمدینان میرنیشنێکی کەونارای کوردستانە. ئەو میرنشینە قەت نەیدێشت دەستی دوژمن و زۆردارانی بگاتێ و هەمیشە سەربەخۆ و ئازاد بوو. پادشای ڕۆم چەند جاران لەشکری کردە سەر، بەڵام ئێستا و ئێستاش نەیتوانی زەفەری پێ ببا و شکستی پێ بێنێ. پاشان ڕکی هەڵدەستێ قۆشەنێکی گەورە و گرانی بەتۆپ و جبەخانەوە دەکاتە سەر، چەند مانگ بوو، خەڵکی شەمدینان بەرامبەر بەڕۆمییان زۆر پیاوانە شەڕیان دەکرد. بەڵام ئەو جارە وا دیاربوو کوردان دڕۆستیان نەدەهاتن. هێزی لەشکری ڕۆم لە وزەبەدەر بوو، میر سادق، میری شەمدینان کە وای زانی، خێرا کۆبوونەوەیەکی گەورەی بۆ ڕاوێژ پێک هێنا: چ بکەن، چۆن میرنشینەکەیان لە تاڵان و بڕۆ و دەستدرێژی جەندرمەی ڕۆمییان بپارێزن؟ میر سادق ڕووی لە مەجلیسێ کرد، گوتی:

– خۆتان دەزانن کە تا ئێستا ژیان و گوزەرانی خۆمان ئازاد و سەربەست پاراستووە و خەڵکی وڵاتەکەشمان هەمیشە بەختەوەر و ئاسوودە بوون. بەڵام پادشای ڕۆمی، وەکو هەموو ئاگادارن ئەوە چەند جارە، قۆشەنمان دەکاتە سەر و ئێمەش هیچ درێغییەکمان نەکردووە و بستێکمان لە خاکی پیرۆزی وڵات نەدۆڕاندووە. بەڵام ئەم جارە وێ دەچێ کار لە کار ترازابێ، قۆشەنێکی گرانیان ناردووینە سەر و هێزەکە لە وزەدا نییە. دەمڕاست و ڕدێن سپینە: ئێوە چ دەفەرموون؟ ڕاتان لەسەر چییە؟ کۆمەک و یارمەتی لە کێ بخوازین و

ڕوو لە کێ بنێین و کار بە چ بارێکدا هەڵسووڕێنین و چۆن وڵات بپارێزین؟

هەموو بێ دەنگ و کڕ بوون و متەقیان نەکرد.

قازی بەگ تازە لە مەیدانی شەڕ گەڕابووەوە. میر سادق ساڵێکی پتر بوو سەرکردایەتیی سوپای بەم قازی بەگە ئەسپاردبوو. لە پێشان تەنیا سەرۆکایەتیی هۆزەکەی دەکرد، هۆزەکەشی لە نێو هۆزەکانی شەمدیناندا هۆزێکی زۆر گەورە و زەبر بەدەست بوو. قازی بەگ دوو هەزار سواری بەچەکی کۆک و تەیارەوە بۆ میرنشین تەرخان کردبوو. خۆشی بووبوو بەسەرکردە. لە هەموو شەڕێکدا کەڵەمێردانە گۆی شەڕەفی بردبووەوە و هەمیشە بە نەبەزی و زاڵی لە مەیدانی شەڕ دەگەڕاوە. نێوبانگی لە نێو عێل و هۆزان بەبوێری و گەڕناسی ڕۆیبوو. هەر بۆیەش میر سادق پەسندی کردبوو و کردبوویە سەرکردەی سوپای میرنشینی شەمدینان. پیاو هەق بڵێ، قازی بەگ شیاوی پتریش بوو، چونکە لە کن پیر و دەمڕاستان خۆشەویست و بەڕێز بوو. لە ئازایەتی و چالاکیدا وێنەی نەبوو. وێڕای ئەوەش تا بڵێی ماقووڵ، جوامێر، چاوتێر، دۆستپەروەر و ژیر و پیاو بوو زۆری حەز لە یارمەتی و کۆمەکی هەژار و دەستەوسان و کەساسان دەکرد. هەرچی لاویش بوون خۆ ئەوە هەر مەپرسە، ڕۆحیان بەسەر سەریەوە بوو. نێوی وێردی سەرزاران بوو. بەسەری وی نەبا سوێندیان بەسەری کەسی دی نەدەخوارد، هاودەمیان بوو، خەمخۆریان بوو، لە شایی و زەماوەندا خۆی سەرچۆپیکێشیان بوو. گەڕان و سەیرانی نێو باخ و باخات، لە ئاهەنگگێڕانی جێژنی نەورۆزدا قازی بەگ بەدەم هەموو خۆشی و شادییەکیانەوە دەچوو و بێ هەوا شاییی لە تەکدا دەکردن، ئاهەنگی لەگەڵدا دەگێڕان. کە زستانیش دادەهات لاوەکان دەچوونە ڕاوە ورچێ. ئەو ڕاوەش هەر وا سانا نییە و هەموو کەسێ پێی ناکرێ و زۆر بەترسە؛ چونکە ورچ ئەو دەمی کە دەکەوێتە چلووی زۆر برسییە، کێ دەوێرێ توخنی کەوێ، بەڵام قازی بەگ گوێی نەدەدا ترس و بەتەنیا ڕاوە ورچی خۆی دەکرد و نێچیری خۆی دێناوە.

کە مانگی ئادار دادێ ڕۆژ دەداتە درێژی و بەفر لە ژێر تێنی هەتاودا

دەتوێتــەوە، ئیــدی قــاشــوانێ و هـۆڵێن باوی دێ. ئەو وەخــتــی قــازی بەگ بەدارشــەقـێکی درێژەوە لەگـەڵ لاواندا وەدەردەکـەوت یەک دوو ســەر هۆڵێنی لەگەڵ دەکـردن و بەزۆری هـەر خـۆشـی دەیبـردەوە. جـاری واش قـازی  بەگ لە گـەرمـەی هۆڵێندا تاکـو تەرا سـەرە دار شـەقی وێ دەکـەوت، بەڵام ئەو وەکـو بەگەکانی نەبوو. هێند بەتەنگەوە نەدەهات. لە هیچ دڵگیـر و نیگەران نەدەبوو، لە یاریدا ڕکی لە کەس هـەڵنەدەگرت، دەسـتـی لە کـەس نەدەوەشـاند. مـەگـەر ئەوە نەبێ، کە بەناوی ئامۆژگارییەوە جار جار بیگوتبا:

«کـاکـە گـیـان، یا کـاکـەلە، کـە یاری نازانی بۆ دێیـە بەر مـەیدانێ هـوڵێن دەکەی؟ تۆ بچۆ بۆ خۆت میچێن بکە».

قـەدەرێکی پێ چوو کەس مـتـەقی نەکرد. قـازی بەگ لە خـوار مەجلیسـەکەوە دانیشـتـبوو. درەنگ هـاتبـوو. خۆشـی پیـاوێکی قودە قـوڕە و بەفیـز و پۆز نەبوو، خــۆی بۆ هـەورازان بکـوتێ، ڕدێن سـپی چەنـدی لەگـەڵ خــەریک بـوون بچـتــە ســەرووتر نـەچوو. قــازی بەگ کــە زانی کــەس وەڵام نـاداتەوە هـەســتــا ســەر چۆکان، گوتی:

– میرم، حەز دەکەم ڕێگام بدەی قسەیەک لە خزمەتتاندا بکەم. میر گوتی:

– قازی بەگ، لاوۆ، تۆ هـەموو وەختێ ڕێی قسـەت هـەیە و فەرموو قسـە بکە.

– میر خۆش و پایەداربێ، خەڵکی کوردستان هـەموو دەزانن کە خانۆی لەپ زێڕین، سـەرداری قـەڵای دمدم خـاوەن سـوپا و قۆشـەنی گـەورەیە و تا ئێسـتـا، غـەیانەتیی لە میللەتی کورد نەکردووە. پار نا پێرار، کۆمـەک و یارمـەتییـەکی پیاوانەی عەشیرەتی تاکوری کرد. وەرن پیاوی چاک بن با هـاواری بەرینە بەر، پێم وایە هـەر ئەو دەتوانێ لەم تەنگانەیەمان ڕزگار کا.

دوای ئەوەی کـە قـازی بەگ لـە قسـەکـانی بـووەوە گـەورەپیـاو و دەمـڕاسـتـی عەشیرەت و میرنشینی شـەمدینان ئەم پێشنیارەی قازی بەگیان پەسند کرد و هـەموو تێکڕا گوتیان:

– میر پایەدار بێ، تەگبیر و پێشنیار لەمە چاتر نابێ، ئەگەر  بێو یارمەتیی

خانۆی لەپ زێڕینمان بەم زووانە فریا نەکەوێ، ئەوا ڕۆم وڵاتەکەمان داگیر دەکا و هەموومان تالآن و بڕۆ دەکا، چۆن زۆربەی عەشیرەتەکەی ئاوێتینە ژێر باندووری خۆی ئەوەشمان کە ماوین وامان لێ بەسەردێ.

میر سادق گوتی:

– ئەم پێشنیارەی قازی بەگ زۆر بەجێ و ژیرانەیە. نابێ سێ و دووی لێ بکەین و دەبێ هەر ئێستا قاسید بنێرین. بەڵام کێ بنێرین کە دەم و دووی شیاوی بارەگای خانۆی لەپ زێڕین بێ و هێند زۆرزان و ژیر بێ دڵی خانۆ نەرم کا و کۆمەککردنمان بەئەرکی سەرشانان بزانێ؟

یەکێ لە جەماوەرەکە گوتی:

– بۆ مەلا محەمەد نەنێرین؟ خۆ لە خوێندەواری خوێندەوارە و لە ژیری و زۆرزانیشدا کەمی وەکو ئەومان هەیە.

قازی بەگ ئەم پێشنیازەی پەسند نەکرد، هەڵی دایێ، گوتی:

– بەڕاستی، ناڕەوایییەکی زۆر گەورە لە خۆمان دەکەین ئەگەر بێو ئەم مەلا محەمەدە بکەین بەجێ بڕوای خۆمان و کارێکی وا گرنگی پێ بسپێرین. ئەگەر دەتانەوێ ڕاستیی ئەم کابرایەتان لە مست نێم: ئەم مەلا محەمەدە دوژمنی گەلی کوردە. ئەم کابرایە لە نێو ڕۆمییان پێ گەییوە و لەسەر دەستی ئەوان مەشق دراوە و ئاڵقە لەگوێی ئەوانە، سەری زمان و بنی زمانی دەڵێ: «پادشای ڕۆم پادشای هەموو موسڵمانانە، میللەتی کورد نابێ کەڵەوەکێشیی لەگەڵ بکا. دەبێ حوکم و فەرمانی قبووڵ بکا. دنیا هەموو لە ژێر دەستی پادشای عوسمانییە، ئەم کابرایە جاسووس و پیاوخراپە».

یەکێ گوتی:

– کەواتا لەبەرچی لە خۆمانی دوور نەخەینەوە؟ پێم ناڵێن؟ ئەمە چییە؟ چ پێوەندییەکی بە ئێمەوە هەیە؟ ئێمە شێخی خۆمان هەیە. ئەمەمان بۆ چییە؟.

پاشان بڕیاریان دا عەبدوڕەزاقی برای میر سادق و شێخ زادە و دوو خولامان بنێرن. ئەم دووانە هێشتا لە شەڕ نەگەڕابوونەوە. میر سادق

فەرمووی لەدوویان بنێرن.

دەمەو تاریکانێ بوو، جەماوەرەکە هێشتا بڵاوەیان لێ نەکردبوو. هەموو زوڵم و زۆری پادشای ڕۆمییان چێشتبوو. هەریەکە لە لایەکەوە کز و مەلوول دامابوون. بیریان لەوە دەکردەوە: خوا نەخواستە ئەمانیش نەکەونە ژێر دەستی ڕۆم و تێدا بچن، بەڵام سوێندیان خواردبوو کە تا دوامین تنۆکی خوێنیان شەڕ بکەن و بستێ لە خاکی باو و باپیران بەداگیرکەری زۆردار نەدۆڕێنن.

وەزیری ڕۆم چەند جار قاسیدی ناردبووە کن میر سادق، کە بەشکو بێنە سەر ڕێ و سەر بۆ دەسەڵاتی پادشای ڕۆم دانەوێنن، دەنا بەقۆشەنی گەورە و گران و تۆپ و تۆپخانەوە وڵاتمان خاپوور و وێران دەکرێ و خاکمان بەتوورەکە دەبێژرێ.

بەڵام میر سادق هەموو جارێ پیاوانە دەیگوت:

– ئەمە وڵاتی کوردانە. خاکی باو و باپیرانە، ئێمە زۆر لەمێژە نیشتەجێی ئەم خاکەین و هیچ جۆرە حوکمڕانییەکی بیانیمان بەسەرەوە نەبووە، قەتمان نەهێشتووە و ناشهێڵین بیانی پێ باوێتە ئەم خاکە پیرۆزەوە و تاوەکو یەکمان مابێ شەڕ دەکەین و وڵاتی خۆمان دەپارێزین.

گزنگی بەرەبەیان تازە لە نێو دیوەخانی دەدا، میر سادق هەر بەجلەکانییەوە سبیلکێشێ لەسەر دۆشەکێک هەڵاژا، بەڵام هێندەی نەخایان باو نۆکەر خەبەری هێنا: کە شێخ زادە و عەبدوڕەزاق هەردووکیان وا لە بەردەرگەی وەستاون.

میر سادق گوتی: «با بفەرموون». کە شێخ زادە و عەبدوڕەزاق وەژوورکەوتن. میر لێی پرسی:

– ئەرێ دەنگوباسی شەڕ لە چ دایە؟

شێخ زادە گوتی:

– دەبێ لە چ دابێ قوربان، هێزی دوژمن هێندە زۆرە لە کێشدا نییە. پێرێ

بەرتۆپانیـان داین، ناچار لە قـەڵاچەی وەدەرکەوتین بەڵام دوێنـێ ئێمـە فـرمـان ئاویشتـە وان، خـۆمـان بۆ لە بۆسـەدان، لـە پڕ نێـزیکەی سـەد زەلامـێکمـان لێ کوشتن. بەڵام ئەوان هەمـوو ڕۆژێ کۆمـەک و یارمەتییـان پەیتا پەیتا بەسـەردا دەڕژێ و بە بار تۆپ و جبەخانەیان بەدواوەیە و بۆ هیچ دانامێنن.

میر گوتی:

– من بـۆیەم لـەدوو ناردوون، بۆ قـــەڵای دمــدم، بۆ خــزمـــەت خـــانـۆی لەپ زێڕینتان بنێرم، عـەرزی بکەن: «میر سادق دەستت ماچ دەکا، دەڵێ: تکایە، تا زووە بەهاوارمانڕا بگا و فریامان کەوێ حاڵەکەی یەکە یەکە بۆ ڕوون کەنەوە. پێی بڵێن: خۆ خـۆی ئاگاداری هـەموو شتێکە. ئەوە چەند سـاڵە ڕۆم بەقۆشـەنی گەورە و گرانەوە هێرشمـان بۆ دێن. ئێمەش هـەمیشـە مەردانە وەکو شوورەی پۆڵا وەسـتـاوین و قـەت نایـەڵین پێی ئـەو گـەمـارانە شـــەقـڵی خـاکی پیـرۆزی کوردسـتان بشکێنن. بەڵام لەگـەڵ زۆردار چ دەکرێ؟ کورد دەڵێ: «کە زۆر هـات قەواڵە بەتاڵە». ئەمـجارە لەشکرەکەیان ئێجگار زۆرە و تۆپ و تۆپخـانەکەیان لە وزە بەدەرە و لە کێشی مەمـاناندا نییـە. ئەگـەر کوردستـانی لە دڵدا شـیـرینە، ئەوا بیکا لە ڕێی خـاکی کـوردسـتان و کـوردایەتیـدا، تا زووە فـریامان کـەوێ و بەلەشکر کۆمەکمان بکا.».

«ئەگـەر بێـو بەم زووانە بەهاوارمـانڕا نەگا، ئەوا ڕۆم بەبێ چەند و چۆن ورد و درشـتمـان قـڕ دەکـەن و ولاتەکەشـمـان لێ داگیر دەکـەن، دەوجا بڕۆن، دەی ئۆغرتان خێر بێ».

– مـیـر پـایەدار بێ، ئەگـەر قـەدبڕ نەڕۆین لەوانـەیە زۆرمـان پـێ بچێ و زوو نەگەینە قەڵای دمدم. سیمـۆنی فەلەی بازرگان زۆرجـار کووتاڵ و شمـەکی بۆ قـەڵای دمدم بردووە و لەو ڕێگاوبانـە شـارەزایە، ئەگـەر بێـو وەکو بەڵەد ڕەگـەڵ خۆمانی خەین، لەوانەیە کەڵکێکی زۆری بۆمان ببێ.

میـر خێرا نۆکەرێکی لە دووی سـیمۆن نارد. هـەر هێندەی قـەننەیەک بکێشـی سیمۆن گەیشتە خزمەت میر و ئیکلامێکی بۆ کێشا و وەکو سەرباز وەستا.

میر گوتی:

– سیمۆن، خۆ تۆ بۆ خۆت زۆر چاکت ئاگا لێیە کە ڕۆم چییان بەسەرهێناین: لە دیاربەکر هەرچی کورد و فەلە بوون قڕ و قەلاچۆیان کردن و خاکی باو و باپیرانیان هەموو لێ داگیرکردن. ئێستاش نۆرە هاتووەتە سەر ئێمە و وا بەچاوی خۆت دەبینی چمان پێ دەکەن.

سیمۆن گوتی:

– بەڵێ میرم، ئاگام لە هەموو شتێک هەیە. بەش بەحاڵی خۆم هەر چیم لە باردا هەیە و پێم شک دەبەی ئامادەم و فەرموو بڵێ، سەرم لە پێناودایە و بەڵێنی پیاو بێ درێغی نەکەم.

– وەڵڵا بۆیەم بانگ کردووی، دەمەوێ لەگەڵ شێخ زادە و عەبدولڕەزاق بچی بۆ قەڵای دمدم و بەڵەدی ڕێگایان بی. ڕێگای کورت و قەدبڕیان نیشان بدە و هاوار ببەنە بەر خانۆی لەپ زێڕین، بەڵکو ئەمە خودایە بەهاوارمانڕا بگا.

سیمۆن گوتی:

– میرم، وەی بەسەر هەردوو چاوان. هەر ئێستا خۆم ئامادە دەکەم و لە تەکیاندا بەڕێ دەکەوم. خوا یار بێ بەلاڕێ و قەدبڕی وایاندا بەرم، بەزووترین کات بیانگەیەنمە قەلا. خانۆ پیاوێکی قۆچاخ و ژیرە، لەمێژە بەمەشقدانی سەربازەوە خەریکە، دەڵێن سوپاکەی لە سەدان لاوی خوێنگەرم پێکەوە ناوە، دەتوانێ هەوتەقای ئۆردووێکی پێ بکا. شای ئێران چەند جار لەشکری لێ کرد، بەڵام هێندە بەپیاوانە و چالاکانە لێیان وەدەس هاتن فریان ئاوێتە دوژمن و بەورد و درشتیانەوە قڕی کردن و ئیدی قەت بستێ ڕێگای سەربازێکیان نەدا پێ باوێتە خاکی کوردستان. شاری قەڵای دمدم ئەوڕۆ یەکێ لەو شارە بەناوبانگانەیە کە بەسەدان بازرگان و کاروانی کووتاڵ و شمەکی هەمەڕەنگەی بۆ دەچێ.

– سیمۆن. خۆ من تۆ بۆ بازرگانی و کڕین و فرۆشتن نانێرم، من بۆیەت دەنێرم ڕابەریی قاسیدەکانم بۆ بکەی.

– جا قوربان من چیم گوتووه، سەرم لە پێناودایە. هەر ئێستا ئەسپەکەم زین دەکەم.

لە کاتێکی خەڵکی شەمدینان تازە لە خرپەی خەوی شیرینی سبەینێ وەخەبەر هاتن، پێنج سوار لەبەر دەرگای کۆشک و تەلاری میری شەمدینانەوە بەرەو قەڵای دمدم پێیان پێدا نا. چوون پەنا ببەنە بەر مروەت و پیاوەتیی خانۆی لەپ زێڕین. یەکیان عەبدورەزاق، ئەوەی دیکەیان شێخ زادە و ئەوانی تریان سیمۆنی فەلە و دوو خوڵام بوون.

ئەوێ ڕۆژێ هەر پێنج سوارەکە، ورتە لە دەمی کەسیانەوە دەرنەدەهات، دەتگوت کەڕ و لاڵن، تا نیوەڕۆ، بێ پشوو بەڕێوەبوون. بیریان لە خاک و نیشتمان و نامووس و شەرەف دەکردەوە. ئیدی نیوەڕۆ بوو، سیمۆن پەردەی ئەم کشوماتییەی دڕی، گوتی:

– ئەگەر هەروا بەشارێیاندا بڕۆین لەوانەیە بە پازدە ڕۆژیش نەگەینە قەڵا. بەڵام ئەگەر قەدبڕ بڕۆین، زووتر دەگەین.

ئاخر و ئۆخری هاوین بوو. ئەو ساڵە دەغڵودانی دەوروبەری قەڵای دمدم ڕووی لە نەهاتی بوو، سەرەڕای ئەوەش ناوچەی نێزیکی واش نەبوو کە ئازووخەی بۆ فرۆشتن لێ دەس کەوێ، ئەوەی هەشی بوو نەیدەفرۆشت و عەمباری کردبوو و بۆ ڕۆژی ڕەشی شاردبووەوە. زۆربەی عێلی بەرۆدار بۆ دەغڵودان کڕین دەچوونە ناوچە دوورەدەستەکان. ڕۆژێکیان، کاروانی قەڵای دمدم بەرەو شەمدینان بەڕێ کەوت، چوو لەوێ ئازووخە بکڕێ. چەند ڕۆژ بەڕێوە بوو، تا ڕۆژێکی دەمەونیوەڕۆ بووبوو و نەبووبوو، لەسەر کانیاوێکی سارد بۆ پشوودان لایان دا. چۆمێک لە بناری کانیاوەکەوە دەکشا، کوڕگەل تێی کەوتن، کۆمەڵێ ماسییان گرت. کوورەیەک ئاگریان هەڵچنی، چزە چز دەستیان بەماسی برژاندن کرد.

هەندێ لە لاوەکان خەریک بوون وڵاخەکانیان دەلەوەڕاند، تومەز پێنج سواریان لە نێو لێڕەوارەوە بەدی کردووە، بۆ کن ئەوان دێن.

سەرقەتارچی لالۆیەکی ڕدێن سپیی دنیا دیتە بوو، کوڕگەل خەبەریان هێنا کە حاڵ لەوە حیکایەت لەوە. ئەویش گوتی:

– باشە سوار لەو لێرە چ دەکا؟ پێم وایە ئەوان هەبن و نەبن پیاوخراپن و بۆ تالآن و بڕۆ هاتوون.

کوڕینە با چەند زەلامێک خۆیان لەنێو وڵاخەکاندا مەڵاس دەن، هەندێکی دیکەیان بچنە لێڕەکە خۆ بشارنەوە، هەرکەسە شیر و مەتاڵی خۆی هەڵگرێ، ئەگەر ئەوان پێنج سوارن ئێمە بیست و پێنج پیاوی عەشیرەتی بەرۆدارین. سا سوێند و قەرار بێ ئەگەر هەموویان قڕکردووین نایەڵین تالآنمان کەن.

هەمـــوو بڕیاریان دا وا بکەن. لالۆی پیـــر بە خـــۆی و دە زەلامـــەوە لە نێــو وڵاخەکان خۆیان مەڵاس دا و چەند زەلامێکیش خۆیان لە نێو لێڕەوارەکەدا شاردەوە، چەند کەسێکی دیکەش بۆ ماسی برژاندن لەسەر کوورە ئاگر مانەوە. ئیدی خۆیان بۆ ئەوە ئامادە کرد سەریان لە پێناوی ناموسدا بەخت کەن، نەبا تالآن کرێن و گۆی پیاوەتی بدۆڕێن. سوارەکان وردە وردە هاتن تا گەیشتنە نێو وڵاخەکان، سڵاویان کرد و پرسییان:

– ئەمە کاروانی کێیە؟ لە کوێوە دێن و بۆ کوێ دەڕۆن؟

لالۆی سەرقەتارچی بەرەو پیریان چوو، گوتی:

– ئەمە کاروانی عەشیرەتی بەرۆدارە، لە قەڵای دمدمەوە دێین. گەورەمان خانۆی لەپ زێڕینە. ئەمســاڵ لای ئێمــە نەهات بوو، خــەلە و دان کــز بوو، دەمانەوێ بەرەو شەمدینان بۆ گەنم کڕین بڕۆین. چەند کاروانێک سیمۆنیان ناسییەوە، لێیان پرسی:

– ئەرێ کاکە تۆ سیمۆنی بازرگان نی؟

– بەرێ وەڵڵا من سیمۆنم، بەڕاستی زیرەکن، ئەوە چۆنتان ناسیمەوە؟

عەبدوڕەزاق بەلالۆی سەرقەتارچیی گوت:

– دەغڵودان لە کن ئێمە زۆرە و چەند ساڵە خەلە و خەرمانمان لە هاتدایە، بەڵام حەیفێ ناتوانن چتان دەس کەوێ. چما نازانن پادشای ڕۆم هێرشی

هێناوەتە سەر شەمدینان و لەشکر و تۆپ و تۆپخانەی گەورە و گرانی کردووەتە سەرمان، دەیەوێ نیشتمانمان داگیر کا؟ ئێستا حاڵی حازر لەوێ شەڕێکی زۆر توند و سەختە. پادشای ڕۆم بەشێکی زۆری لە کوردستان داگیرکردووە و زۆری لە هۆز و خێڵەکانی کورد بەزۆر هێناوەتە گیر و خستوونییە ژێردەستی خۆی. بێ ڕەحمانە بەرۆکی ئەم کوردە داماوەی گرتووە و هەر بەوەدا ڕادەگا باج و سەرانەی لێ بستێنێ. هەندێکیش ناپاک و بەکرێگیراوی ئاڵقە لە گوێی وەکو ئاغا و بەگ و میرەکانی ئێمەش بەهەموو بێ شەرمییەوە دەستیان داوەتە غەیانەتیی میللەتەکەمان و چوون بوون بەنۆکەری ڕۆم، ئەگەر ئەوانیش وەکو خانۆی لەپ زێڕین و سەرداری جزیر و بۆتان چاکی مەردایەتییان لێ هەڵکردبا و لێی ڕاپەڕیبان نەزۆرداری ڕۆم، نەداگیرکەری ئێران نەیاندەتوانی پێ باوێنە کوردستان.

شێخ زادە گوتی:

– چەند جار پادشای ڕۆم کردییە سەر میری مە نۆکەری قبوڵ کا و بەحوکمی ڕۆم قایل بێ، میر قایل نەبوو، پاشا ڕقی هەستا، ئەوە چەند جارە قۆشەنی گەورە و گرانمان دەنێرێتە سەر، دەیەوێ کورد لە نێو ببا، ئێمەش تا ئێستا چ درێغیمان لە خۆبەختکردندا نەکردووە و بەهەموو تواناوە شەڕمان کردووە، بەڵام چ دەکەی؟ کە زۆر هات قەواڵە بەتاڵە؛ لەشکری ئەمجارەی لە وزە بەدەرە. پادشای ڕۆم و شا عەباس پەیمانیان بەستووە کە کوردستان لە نێوان خۆیان بەش بکەن، نیوەی ئێران هەڵی لووشێ و نیوەکەی دیکەی ڕۆم. بۆیە هەردوو دەوڵەت تەقەلای ئەوەیانە کە کوردستان داگیرکەن.

یەکیان گوتی:

– بەڵێ ڕاستە.

لالۆی سەرقەتارچی کە زانیی ئەم سوارانە پیاوخراپ نین بانگی هاوڕێکانی کرد: وەرن کوڕینە وەرن.

عەبدوڕەزاق ڕووی کردە لالۆی سەر قەتارچی گوتی:

– ئێمە قاسیدی شەمدینانین، میر سادق ناردووینی بچینە خزمەت خانۆی لەپ زێڕین داوای کۆمەکی لێ بکەین و زوو بەهاوارمان ڕابگا، نازانم چەندمان بۆ قەڵای دمدم ماوە؟

لالۆ گوتی:

– ئێمە ئەوە دوو ڕۆژە بەڕێوەین، بەڵام ئێوە سوارەن، دەتوانن بۆ سبەینێ نیوەڕۆ بگەنە قەڵا.

کاروانییەکان لە لێڕەکە وەدەرکەوتن و هەموو هاتنە کن سوارەکان، سڵاویان کرد و لە دەوریان کۆبوونەوە. سەرقەتارچی گوتی: «قاسیدە بەڕێزەکان، براینە فەرموون دابەزن، با ئەسپەکانتان کەمێ پشوو بدەن. لاوە کاروانییەکان لەو چۆمەی خوارێ ماسییەکی زۆریان ڕاوکردووە و برژاندوونیان، فەرموون جارێ نانمان لەگەڵ بخۆن، پاشان ئۆغرتان خێر و خوداتان لەگەڵ».

شێخ زادە سەیرێکی عەبدوڕەزاقی کرد، وەک بڵێ. «دابەزین یان نا؟» عەبدوڕەزاق گوتی: «با دابەزین».

ئیدی هەموویان دابەزین. لالۆ گوتی: «ئا کوڕە جڵەوی ئەسپەکانیان بگرن، دەڵێی دنیاتان نەدیتووە.»

عەبدوڕەزاق گوتی:

– کاکە، ئێوە زەحمەت مەکێشن، بلا خولامەکانمان بیانبەن، لەو دۆڵە بیانلەوەڕێنن.

عەبدوڕەزاق کۆڵۆسی لەسەر داکەند و بەدەستەسڕەکەی هەنییەی سڕییەوە، تەمۆرییە سووورباوە چەقەڵ ڕەنگە لوولەکەی و بسکەکانی بەسەر لاجانگ و دەموچاویدا شۆڕبووبوونەوە، هێندەی لێ دەهات بەتۆبا نە بکەی و نە بخۆی هەر سەیری تەمووری پێچ پێچ و چاوی شین و بەژنی نازدار و سمێڵی قەیتانیی بکەی.

سەرقەتارچی لە ژێرەوە بەکاروانییەکانی گوت:

– ئەمە لە پیاوی ڕەمەکی ناچێ، هەبێ و نەبێ لە پیاوماقووڵانە، پیاوماقووڵێکی مەزنیش.

چەک و ڕیحاڵی عەبدوڕەزاق و پێسیری عەباکە بەنەخش و نیگارێکی زۆر سفت تەریب درابوو. خەنجەرێکی مشتوو زێوی بەبەر پشتێنەوە بوو. کاروانیەکان کە سیمۆنیان ناسییەوە سوێندیان دا:

– تو ئینجیل، ئەگەر پێمان نەڵێی، ئەم شۆڕەسوارە کێیە؟

– ئەوە میر عەبدوڕەزاقی برای میری شەمدینانە، بیست ساڵ پترە باوکیان ئەمری خوای کردووە، بەڵام هێشتا خۆی مابوو کە میر سادقی کوڕە گەورەی کرد بە میر و لە جێی خۆی دانا.

– ئەی ئەو تەنگەستوورەی دیکەیان کێیە؟

– ئەوە شێخ زادەیە. باوکی هێشتا ماوە، تەمەنی سەد و دە ساڵ دەبێ، ناو بەناو لەگەڵ میر سادق سەرگەرمی دامە و شەترەنجن، ناوی شێخ شەمۆیە. تا ئێستاش بە شیر و مەتاڵ و ڕمبی گەورە گەورە لە شەڕی ڕۆمییان هەر خۆی بەکەڵەمێردی مەیدان دەزانێ.

شێخ شەمۆ دەڵێ:

– دوژمنی گەلی کورد پادشای ڕۆم و شای ئێرانە.

کوڕگەل ماسییەکی زۆریان برژاند، لالۆی قەتارچی گوتی:

– میوانانی خۆشەویست فەرموون نان بخۆن.

قاسیدەکان دەستیان بەنانخواردن کرد. تێر و تەسەل بوون.

شێخ زادە گوتی:

– زۆر سوپاس، خوا بەزیادی کا. بەڕاستی ئەمە چەند ڕۆژە زەوادمان نەچووتە سەر زار، نەک لەبەر بێ تۆشەیی، بگرە لەبەر بێ وەختی کە نەمانپەرژاوەتە سەر نانخواردن. بەڵام ئەمڕۆ بەخۆشیی ئێوەوە تێروپڕمان خوارد، ئیتر تکامان وایە ئیزنمان بدەن، بڕۆین. بەدوعا.

لالۆ گوتی:

– خواتان لەگەڵ، بەخێرێن بەسەر هەردوو چاوان. بەڵام بەم ڕێگادا مەڕۆن، کەمێ بەرەخواربنەوە، لەو دیوەوە کۆچەڕێیەک هەیە ڕێوڕاست دەچێتە نێو قەڵاوە.

سوارەکان پێیان پیانا ڕۆیشتن، ئەوێ شەوێ لە هیچ کوێ دانەبەزین ئەسپەکانیان ڕەوان ڕەوان دەڕۆیشتن، تازە سپێدەی دابوو، تەیر و توو بەجریوە جریو تازە لە هێلانان وەدەردەکەوتن، ئازاد و سەربەست دەیاندا شەقەی باڵان و لە دوای بژیو هەڵوەدابوون. بەرە بەرە ڕۆژ ڕووناکتر دەبووەوە. ئەسپەکان بەجارێ شەکەت بووبوون، ناچار سوارەکان لەسەر کانییەک دابەزین، خوڵامەکان لغاویان لە دەم ئەسپان دەرێنا و ڕێشمەکانیان لە مل ئاڵاندن و لە کانیاوەکەیان دوورخستنەوە تا پشوو بدەن و بلەوەڕێن. سوارەکانیش دەست و دەموچاویان لە کانیاوەکە پاک و خاوێن شوشت. زۆری نەخایاند ئەسپەکان تێروپڕ لەوەڕان، ئەمانیش پشوویکی باشیان دا. سەر کانیاوەکە چەند خۆش و دڵگیر بوو، لەوەڕەکەی دەوروبەریشی هێند خۆش بوو. ئینجا سەرلەنوێ سواربوونەوە و پێیان پێوە نا. خۆر هێشتا دوو بەژنە زەلامی مابوو کە قەڵای دمدم لە دووڕا وەدیارکەوت. قەڵا چ قەڵا دەتگوت هێلانەی هەڵۆیە بەسەر لووتکە چیاوە. لە لایەکی پاڵی بەسەر لووتکەی چیاوە، لە لایەکی پاڵی بەچیایەکی گەورەی گەردنکەشەوە دابوو، پیاو وای دەزانی: بۆیە لەو شوێنە سەخت و تووشەیان بیناکردووە تا کەس نەتوانێ زەفەری پێ ببا. شوورەکی قایمی درێژی بڵندیان بەچوار دەوردا بەرز کردبووەوە و تەنیا سێ دەرگای هەبوون.

سیمۆن گوتی:

– گەورەم ئەگەر ئارەزوو دەفەرمووی، با هەندێکت لە بارەی بینانانی ئەم قەڵای دمدمەوە بۆ بگێڕمەوە.

– جا تۆ لە کوێ سەربەهوردی ئەم قەڵایە دەزانی؟

– سەربەهوردیم لە کابرایەک بیستووە. حەز دەکەی با بۆتی بگێڕمەوە، زۆر سەیرە.

– دە بیگێڕەوە، خۆ جارێ قەڵا دوورە با کەمێ لەسەرەخۆ بڕۆین، تا ئەسپەکانیش پشوویەک بدەن.

سیمۆن دەستی بەگێڕانەوەی سەربەهوردی قەڵای دمدم کرد، گوتی:

– من لەمێژە هاتوچۆی قەڵا دەکەم، کووتاڵی بازرگانیم بۆ دەهێنا. ئەوێ ساڵێ کە کووتاڵم لە شامەوە هێنابوو. کابرایەکی ئێشکچیم بەکرێ گرت ئێشک لە کووتاڵەکانم بگرێ. ئێوارەیەکیان هاتمە کن کابرا، قەدەرێ لە تەنیشتی ڕۆنیشتم، بۆی بگێڕامەوە، گوتی:

– وەختێکی قەڵایان بیناکرد من منداڵ بووم. عەشیرەتی بەرۆدار و عەشیرەتی ئێمە، تازە هاتبوونە ئێرە. هەندێ دەیانگوت وەستای ئەو قەڵایە فەلەیە، هەندێکی دیکە دەیانگێڕاوە، کە گۆیا ڕۆمییە و شوورە و نەخش و نیگارەکەی و هەر سێ دەرگا ئاسنەکەی و پێپلیکانە بڵندەکانی ئەو وەستایە دروستی کردووە. کێشکچییان شەو و ڕۆژ بەسەر قوللە بەرزەکانییەوە چاوێکی دەکەنە چواران و لە هەر لایەکی تارماییی دوژمن وەدەرکەوت، هێند چاویان تیژە، لە هەر کوێوە بێن، بەدییان دەکەن و دەستبەجێ خەبەر دەدەنە خانۆ و خێرا لەشکر بۆ شەڕ حازر دەکرێ. لە خوار قەڵاوە، هێشتا سەعاتە ڕێیەکی دەمێنێ چەند قوللەی بڵندی دیکە دروست کراون، هەر یەکە کێشکچیی خۆی هەیە و بەنۆرە کێشکی لێ دەگرن و قەت چاو لە دوژمن خافڵ ناکەن. کێ دەوێرێ سەری دەرخا، هەڵۆ بێ باڵی دەشکێنن، هەرکە هەست بەدوژمن دەکەن هێندەی چاو داخەی و بیکەیەوە خەبەر دەگاتە قەڵا و لەشکری خانۆی لەپ زێڕین لە دوژمن ڕادەپەڕێ و تێک و پێکیان دەشکێنێ.

ئەوە چەندە لەشکری شای ئێران هێرش دەباتە سەر قەڵای دمدم، بەڵام ناتوانێ بستێکی لێ داگیرکا و بەجارێ خۆی بە قڕ دەچێ و هەرچییەکیش دەمێننەوە بەسەر و گوێلاکی شکاو و سەرشۆڕی دەگەڕێنەوە. شێخ زادە

پرسی:

– بەقسەی تۆ بێ ئێستا کێشکچییەکانی سەر قوللەکان ئێمەیان لێوە دیاربن؟

– بەڵێ لێیانەوە دیارین. وەکو کابرا بۆی گێڕامەوە گۆیا، ئەو سەروەستایەی کە قەڵای دروست کردووە لە پێشدا سەروەستای شای ئێران بووە. گەلێ قەڵای بۆ شاعەباس لە دژ ڕۆم دروست کردووە. لەو دەمی کە دوژمن زۆری بۆ ئێران هێنا قەڵایەکی زۆر بەرک و سەختی بۆ دروست کرد، لە هیچ شتێکی کەم نەبوو: ئاو، ئازووخە، چەک و چەند جۆرە شتی دیکەی زۆر و زەوەندی هەموو تێدا بوو. شا کە هاتە سەیری قەڵا و بەنێویدا گەڕا، بانگی وەستای کرد و ئافەرینی کرد، بەڵام ئێوارەیەکی درەنگ شا لە دووی نارد، لێی پرسی:

– ئەم قەڵایەی بۆت دروست کردووم زۆر چاکە، بەڵام ڕاستم پێ بڵێ، دەتوانی یەکێکی دیکەم لەمە مەحکەمتر بۆ دروس بکەی؟

وەستا هەندێ بیری کردەوە، گوتی:

– شاهەنشا پایەداربێ، بەڵێ دەتوانم.

شا مەرەخەسی کرد، وەستا چووەوە ماڵی خۆی. بەڵام شەوێ شا ئەمری کردە یاساوڵان: سبەینێ نیوەڕۆ وەستاباشی لەنێو حەوشەی قەڵا بەداردا بکەن.

کابرا بەتەنێ چوو، گوتی:

– «خێرەومەند لە هەموو جێگەیەک هەن، بۆچی هەر ئەو دەمی پیاوێکی خێرخودا خەبەر بەوەستاباشی نەدا: حاڵ لەمە و حیکایەت لەمە. وەستاباشیش دەست دەبا جۆرکێ زێڕی دەداتێ و کابرای خێرخواش ناکاتە نامەردی سەری وەستاباشی دەکرێتەوە، دەچێ ئەسپێکی بە زین و لغاوەوە بۆ حازر دەکا و هەر ئەوێ شەوێ سێ و دووی لێ ناکا، پێی پیا دەنێ و ڕێوڕاست دەچێ پەنا وەبەر خانۆی لەپ زێڕین دەبا و حاڵ و حیکایەتی ورد و

درشت بۆ دەگێڕێتەوە. خانۆش وەستاباشی لە کنە خۆی گل دەداتەوە، دڵنەواییەکی پیاوانەی دەکا و پێی دەڵێ: «من شا عەباس نیم، تۆ قەڵایەکی چاکم بۆ دروست بکە بەڵێنی پیاوان بێ، وەکو بیبیلەی چاومت بپارێزم و دەسمزێکی چاکیشت بدەمێ».

خانۆ پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند بوو، مێگەلە مەڕی لە بەغدا، لە موسڵ، لە شام، لە بەسرە، لە ئەستەمبووڵ و شوێنانی دیکە زۆر لە برەو و رمێندا بوون، دوو سێ ڕەوە ئەسپی بژاردەی ڕەسەنیشی هەبوون. حەوت قەتار وشتری بۆ گواستنەوەی ئازووخەی ساڵانەی سوپای هەمیشە بەڕێی هەندەرانەوە بوون. پێشان ناوی خان بوو، بەڵام کە لە دروستکردنی قەڵا بووەوە هێنای بەدەستی خۆی دەسمزی وەستا و شاگردانی دا. چوار چەنگ بۆ وەستا، سێ چەنگ بۆ ئەم، دوو چەنگ بۆ ئەو، ئیدی لەوێ ڕۆژێوە ناوبانگی بە خانۆی لەپ زێڕین ڕۆیی، لە ئێران بەپیاوی دەوڵەمەند و موڵکداریش دەگوترێ خان؛ خانی کوردانیشی پێ دەڵێن».

هەر وا بەدەم قسەوە گەیشتنە قەڵا.

شوورەی ئەم قەڵایە هێند درێژ بوو ئەم سەر و ئەو سەری بەحاڵ چاو هەتەری لێ دەکرد. بەگاشە بەردی زلە زلەی داتاشراو بەرز کرابووەوە، سوار ڕاستە پێ بەسەر ئەسپەوە وەستابا دەستی نەدەگەیشتە سەرەوەی. کێشکچی لە قوللەکانڕا چاویان لە عەبدوڕەزاق و سوارەکانی هاوڕێی بوو، کە گەیشتنە بەر دەرگا ئاسنە بەرزە زلەکەی قەڵا تەماشایان کرد لەسەر بەردە داتاشراوەکانی لای ڕاستی شوورە، وێنەی ورچ و لای چەپی ئی شێریان هەڵکەندووە.

عەبدوڕەزاق لە ژێر لێوەوە گوتی:

– ئەمانەی لە دروشمی شای ئێران وەرگرتووە، ئەو دەمیش دروشمی شاهەنشایەتیی ئێران هەر شێر و خورشید بوو.

عەبدوڕەزاق و شێخ زادە کە بە چاوی خۆیان دیتیان چ وەستایەتی و

هونەرێک لەو قوللەیەدا بەخەرج دراوە بە سیمۆنیان گوت: «ڕاست دەکەی...»
ئینجا کە لە شوورەکە وەژوورکەوتن و هاتنە نێو شاری و چاویان بەشەقام و مەیدان و دووکان و خان و بازاڕ کەوت، بەجارێ سەرسام بوون و خۆشیان نەیانزانی چۆن گەیشتنە بەر کۆشک و تالاری خانۆ. مەیدانێکی هەراو لەپێش کۆشکی بوو، چەند پیرە دارێکی زەلام لە پێش کۆشکی ڕوابوو و ئاوێکی سازگاری ڕوونی بەخوڕ بەبن ئەم دارانەدا بەرەخوار دەڕۆیی. خەڵکێکی زۆر لەبەردەمی کۆشکدا، لە ژێر سێبەری دارەکان وەستابوون. هەندێک دەستە و جڵەو چاوەنۆڕ بوون، کەس نەیدەزانی بەهەویای چ وەستابوون. هەندێکیشیان وا دیار بوو کە پاڵا و کرێکار بوون. یەکیان بەو پیاوەی کە تازە لە کۆشکی وەدەردەکەت، گوت: «گیانە، دوێنێ وەستاباشی پێی گوتین دەبێ لێرە حازر بین، تا لەگەڵ بازرگاندا بڕۆین بۆ کارگەی ئاسن، کوا بۆچی دیار نییە؟» چەند زەلامێکی دیکەش لە ژێر درەختەکاندا دانیشتبوون و دیار بوو ئەوانیش چاوەنۆڕی شتێکیان دەکرد. لەنکاو سوارێک لە کۆڵانەکەوە وەدەرکەوت و بەتەکیاندا تێ پەڕی، پرسی:

– برا، لەمێژە لێرەن؟

– بەڵێ لە سبەینێوە لێرەین.

– فەرموون سواربن، با بڕۆین.

ئەوانیش سواربوون و بەگەڵی کەوتن.

پیاوێکی کەڵەگەتی وربە لەبەری چوارشانە لە کۆشکەوە بەدەرکەوت کە هاتە پێشێ، پرسی: کارتان چییە؟ لە کیهە تیرەن؟

شێخ زادە گوتی:

– شەمدینانین و میر سادقی شەمدینان ناردووینی. لە خزمەت خانۆی لەپ زێڕین کارێکی زۆر گرنگ و بەپەلەمان هەیە. شێخ زادە پەنجەی بۆ عەبدوڕەزاق درێژ کرد، گوتی: «ئەوەش عەبدوڕزاقی برای میری شەمدینانە، دەمانەوێ بەخزمەت خانۆ بگەین، ڕاسپاردەی میری پێ ڕابگەیێنین. کابرای

وربە لەبەر بەدەم و دوویدا بۆی بەدیارکەوت کە ئەم میوانانە هەر وا ئاسایی نین و لە پیاو ماقوولان دەچن. دەستوبرد فەرمانی دا.

- خولامینە، خێرا جڵەوی ئەسپەکانیان بگرن و بۆ یەختەخانەیان ببەن، بە میر ئاخوڕ ڕاگەیەنن: «سەرەک دیوەخان دەڵێ: دریغی لەو ئەسپانە نەکا چاکیان داکا».

سەرەک دیوەخان، سیمۆنی فەلەی ناسییەوە، پرسی:

- ئەرێ ئەتۆ سیمۆن نی، یاخوا بەخێرێی، خێرە؟

- بەڵێ قوربان، سیمۆنم، لەگەڵ ئەم زاتانە هاتووم، ئەمانە قاسیدی میری شەمدینانن. ئەوە پێنج شەو و پێنج ڕۆژە بەڕێگاوەین و ئەو ڕێگا دوورودرێژەمان بەقەدبڕ بڕیوە.

سەرەک دیوەخان جارێکی دیکەش لە چەک و ڕیحالەکەیان ورد بووەوە، گوتی: «بۆ وا وەستاون؟ فەرموون بۆ دیوەخان».

سەرەک دیوەخان وەپێشیان کەوت بۆ دیوەخانێ. کە وەژوور کەوتن، جێگەیان لەسەری سەرەوە بۆ دەستنیشان کردن و دانیشتن.

دیوەخانەکە دوێرێکی پان و بەرینی چوارگۆشەی زەلام، عەرزەکەی بەمەڕمەڕ ڕەش و سپی گۆڕ کرابوو، دەتگوت کەزیی کیژانە و بەپەلکەهۆن هۆنراوەتەوە. کە لە ڕاڕەوێ وەژوور کەوتن سۆڵەخانەیەکی بچووک لە مەڕمەڕی سپی دروست کرابوو، ئاوی لە کانیێ بەلوولە لە ژێر زەوییەوە بۆ ڕاکێشرابوو و ئاوەکەی دیسان هەر بەژێر زەویدا دەچووە نێو باخچەی حەوشێ. جامێکی پاک و خاوێنی قەلاییکراوی بۆ ئاو خواردنەوە لەسەر سۆڵەخانەکە داندرابوو. نیمچە مەسینەیەکی عادەتیش بۆ ئاودەست و دەسنوێژ لە تەنیشتی داندرابوو. لە ڕاڕەوێدا لە بەردەرگەی دیوەخانەکەوە لە چەند جێگەیەک لباد ڕاخرابوو و خولام و پێشخان و پاکاری لەسەر دادەنیشتن و هەمیشە دەستە و نەزەر چاوەنۆڕی کار بوون. خولام و نۆکەران هەرکە چاویان بە عەبدوڕەزاق و شێخ زادە کەوت، دەستە و سینە لەبەریان

هەڵستان.

سەرەک دیوەخان بەخولامەکانی عەبدوڕەزاقی گوت:

– ئێوە لێرە ڕۆنیشن، تا گەورەکانتان دێن.

دەرگا کراوە، فەرموویان لێ کرا.

لە پێشدا عەبدوڕەزاق، پاشان شێخ زادە وەژوورکەوتن. کەس لە دیوەخان نەبوو، بەڵام بەپێی ڕێوڕەسم سلاویان کرد:

– سەلامون عەلەیکوم.

سەرەک دیوەخان:

– عەلەیکومە سەلام و بەسەر هەردووک چاوان.

جێگەیان نیشان دان، چوون ڕۆنیشتن، بەڵام سیمۆن بەرەژوور نەچوو، هەر وا لە خوارێ وەستا. سەرەک دیوەخان گوتی:

– کاک سیمۆن، تۆش فەرموو بەرەژوور، ئەتۆش میوانێکی خۆشەویستی ئێمەی.

– نە قوربان، ناماقووڵییە بۆ من، چۆن دەشێ بۆ من بچم ببم بەهاوشانی عەبدوڕەزاق و شێخ زادە. جێگای من ئێرەیە، بەڵام ئەگەر عەبدوڕەزاق ئیزنم بدا، دۆستێکم هەیە حەز دەکەم بەسەری کەمەوە، ئەوە دوو ساڵە نەمدیوە. نازانم حاڵی چۆنە.

عەبدوڕەزاق گوتی:

– سیمۆن گیان یانی چی ئیزنت نادەم، فەرموو بچۆ دۆستەکەت ببینە، بەڵام زوو بگەڕێوە.

سیمۆن لەگەڵ سەرەک دیوەخاندا وەدەرکەوت. لە ڕاڕەوێ سەرەک دیوەخان لێی پرسی:

– سیمۆن دۆستی تۆ دەبێ کێ بێ وا زۆری بەپەرۆشەوەی؟

– خورشیدی بازاڕباشییە.

– چاکە، ماڵیان دەزانی؟

– بەڵێ.

کاتێ سیمۆن ڕۆیی سەرەک دیوەخان لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەمە بوو بە چی هەرچی بازرگان هەن دەیناسن و دەچنە کنی، تومەس بەم ڕەنگە ئەو هەموو سامانەی پێکەوە ناوە».

دیوەخان زۆر فرەوان و گەورە بوو، بڵند بوو، پەنجەرە و کلاوڕۆژنەکانی هەرچەند تەسک و ترووسک و بچووک بوون، بەڵام هێند زۆر بوون لە هەموو لایەکەوە تیرێژ و ڕووناکییان دەهاتە ژوورێ و وەکو ڕۆژی نیوەڕۆ وا بوو. دوو ڕیزە تەختی نەخشراوی نەزۆر بەرز و نەزۆر نزم دانرابوون، هەر تەختە و لبادێکی بەسەرەوە بوو، سەر و قاڵیچەش لەسەر لبادەکان ڕاخرابوو. هەر قاڵیچەیەک سەرینێکی پەڕ نەرمی لەسەر بوو. لە پڕ دەرگا کراوە، کوڕێکی لاوی شۆخ وەژوورکەوت، دوو قەننەی داگیراوە و دوو تەپڵەکی بەدەستەوە بوو. قەننەیەکی لە پێش عەبدوڕەزاق و ئەوی دیکەی لە پێش شێخ زادە دانا، سەر و تەپڵەکی لە پێشیان دانا و بەنەزاکەتێکەوە، گوتی: «فەرموون، میوانە ئازیزەکان قەننە بکێشن». کوڕە ئەمەی گوت و خێرا دەستی بەگیرفانیدا کرد، بەرد و ئەستێیەکی دەرێنا، لەگەڵ ئەستێی لە بەرد دا دەستبەجێ پووشوو ئاگری گرت. ئاگری بۆ لەسەر قەننەکانیان دانا و پاشە و پاش کشاوە.

دیوەخان جگە لە عەبدوڕەزاق و شێخ زادە کەسی دیکەی لێ نەبوو. شێخ زادە لە کوڕەی پرسی:

– کوڕی باش، ئەو جێگا بەرزە کێی لەسەر دادەنیشێ؟

– قوربان، ئەوە جێگای خانۆیە. هەندێ جاریش مەزن و دەمڕاستی هۆزەکانیشی لێ دادەنیشن، بەڵام هەر یەکە بەپێی پلە و مەقامی خۆی جێگای هەیە.

شێخ زادە بە ئانقەست پرسی:

– یانی چی بەپێی پلە و مەقام؟

– یانی، هەرچی گەورە و مەزنی هۆزانن لای سەرووەوە دادەنیشن، پاشان ئەوانی دیکە.

عەبدورەزاق پرسی:

– باشە، خانۆی لەپ زێڕین خۆی لە چ پلە و مەقامێکدایە؟ بەگە، ئاغایە، میرە، چییە؟

کوڕە گوتی:

– خانۆ، نە بەگە، نە ئاغایە، نە میرە، کوردە و هیچی تر، بەڵام لە هەموو بەگ و ئاغا و میری دنیا چاترە.

تەماشای هەر لایەکی دیواری دیوەخانەکەت دەکرد، ئەوە هەر قاڵیچەی چاک بوو و بەداردا کرابوو. هێندە چەک و سیلاحی جۆراوجۆر بەسەر قاڵیچەکاندا هەڵواسرابوون دەتگوت جبەخانەیە. لە گورز و کەمەند، لە تیر و کەوان، لە شمشێر، لە مەتاڵ، لە ڕمب و نێزە، لە دەمانچە و کڵاوزرێ و زرێبەند. ئەوانە هەموو بەداردا کرابوون. شمشێرێکی گەورەی کەمێ خوار هەڵواسرابوو، مشتووکەی بەزێو ڕووکەش کرابوو. کێلانەکەی لە زێڕ بوو، دەچریسکاوە.

لە کوڕەی پرسی:

– ئەدی ئەو شمشێرە گەورەیە ئی کێیە؟

– ئەوە شمشێری خانۆی لەپ زێڕینە. ئای ئەگەر دەزانی چەند سەری کەڵە کەڵەی عەجەمانی بەو شمشێرە پەڕاندووە.

شێخ زادە و عەبدورەزاق واقیان وڕ مابوو، تەماشایان دەکرد. لە سەرووی چەکەکانەوەش بەڕیز کەللەی دەعبا و تەرەوڵان بەدیواریدا چەقێندرابوون. کەللەی گورگ، ورچ، شێر، پڵینگ، گا کێوی، بزنە کێوی، بەرانە کێوی، کەوڵە دەڵەک و کەوڵە ڕێوی و کەوڵە کەروێشک بەدیواردا داکوترابوو. بەڵام کەللەیەک داکوترابوو زۆر سەیر بوو. کەس نەیدەزانی ئی چ دەعبایەکە.

دیسان پرسی:

ئەرێ کاکە، هۆ ئەو کەللەیە ئی چ دەعبایەکە؟

– قوربان، ئەوە کەللەی کەمتیارە. با حیکایەتەکەیت بۆ بگێڕمەوە: جاران کەسێ مردوویەکی ناشتبا، پاش یەک دوو ڕۆژان مردوو لە گۆڕدا نەدەما، مەڵێ ئەم دەعبایە دەیبرد و دەیخوارد، ئیدی بووبوو بەمێملی ئەو عالەمە و زیانێکی زۆری بە هۆزەکەمان گەیاند و گەلێ ساوای بەرمەمکان و شیرە خۆرەشی دزی و خواردنی، چەند دایک و باوی جەرگسووتاو کردن و کۆستی زۆر کەسی خست.

ناچار نێچیرەوان شەو و ڕۆژ وەپەیدۆزی کەوتن، جێگە نەما نەگەڕێن، کون و کەلێن نەما نەپشکنن، بەڵام بێ سوود بوو، ئیدی وای لێ هات، خەڵکەکە هەموو هاواریان وەبەر خانۆی برد و بە گریان و لالانەوە دەستیان بەگریان کرد. ئەو دەمی خانۆ برێ تولە و تاژیی وەدووی خۆی دا، بەڵام هەرچەندی کرد و کۆشا شوێن پێی هەڵنەگرت. پایزێکی درەنگ بوو، ڕۆژێکی، ژنان بەهەڵەداوان خەبەریان هێنا: کە کەمتیارەکەیان بەچاوی خۆیان دیتووە. ئەوێ ڕۆژێ بەفر باریبوو، ئیدی خانۆ کالۆکی لە پێ کرد، لەگەڵ چەند ڕاوچییەکی شارەزادا برێ سەگی گورێخیان ڕست کرد و وەدووی شوێن پێی کەمتیار کەوتن، برۆ برۆ، تا شوێن پێیان گەیاندە بەر زارکی ئەشکەوتێک، کاتێکی گەیشتنە بەر زارکی ئەشکەوت وشتیان لە سەگەل کرد، سەگەل خۆیان لە زارکی ئەشکەوت ئاوێت، لەپڕ کەمتیار هاتە بەر زارکی ئەشکەوت، سەگەل گەمارۆیان دا، خانۆش سێ چەتالی لە گەرووی ڕاکرد و تا هێزی تێدابوو شمشێریشی بە تەپلی سەریدادا و لە جێگای خۆی خپی کرد. ئەوجا سەریان لێ کردەوە، هێنایانە مالێ، جوان و زەریف وشکیان کردەوە و بەو دیوارەیاندا داکوتا. ئیدی عالەمی لێ ڕزگار بوو.

زۆری پێ نەچوو تەقەی دەرگا هات، دەرگا کراوە. خانۆ وەژوور کەوت. شێخ زادە و عەبدوڕەزاق ڕاستەوپێ و دەستەونەزەر لەبەری هەڵستان. خانۆ سلاوی کرد. سلاویان ئەستاندەوە و ئیکلامیان بۆ کێشا، ڕۆنەنیشتن تا خانۆ ڕۆنیشت. ئەوجا هەرکەسە لە جێگای خۆی ڕۆنیشت. خانۆ پیاوێکی

چوارشانەی کەڵەگەتی کەتە بوو، هەرچەند تەنگەی ئەستوور بوو، بەڵام لەگەڵ ئەو کەڵەگەتییەیدا لێی بووبوو بەنەخش. هەرچی چاوی بەدەسەوانە و پێڵاوەکانی کەوتبا دەیگوت کوتومت لە ئی مرۆی سەردەمی کۆن دەچێ و هەرهێندە نەبوو زەندەقی لێ نەچێ. بەڵام زۆر بە هەیبەت و بە سام بوو. سمێڵێکی درێژی لوولی بوو، تا پشت گوێی دەهات، هەر دەتگوت لە خەنە گیراوە، هێند سووربوو بوو. لە دەمودوو و قسە و ئاخاوتندا زۆر لەبز شیرین بوو، پیاو هەرئەوە نەبوو قووتی نەدا. کڵاوێکی بەرگنی لەسەردا بوو و جامانەیەکی دیاربەکرییانەشی بەسەرەوە پێچا بوو. ڕیشووی جامانەکەی بەسەر شانیدا شۆڕ بووبووەوە. قایشێکی بەسەر پشتێنەوە بەستبوو، خەنجەرێکی بەلا ڕاستەوە بەبەر پشتیدا کردبوو. مشتووی خەنجەرەکەی ماهی بوو. دەمانچەیەکی بەقەدەوە بوو، دەسکەکەی وەکو تیرەمار بەزێو نەخش کرابوو. عەبایەکی سپیی بەشانەوە بوو. پێسیرەکەی بەسورمە و قەیتانی ڕەش چندرابوو، هێندەی لێ دەهات لێی بووبوو بەنەخش. شەرواڵێکی پان و پۆڕی چۆغەی لە پێدا بوو. هەر لە دەرلینگەوە تا پزووی قەیتانێکی ئاڵی پێوە دوورا بوو، جووتێ قۆندەرەی بەغدایی لەپێدا بوو. ئەو کوڕەی کە بەردەستی خانۆی دەکرد خێرا قەننەیەکی بۆ خانۆ داگرتەوە، بردی، لە پێش دەمی دانا، ئەوجا دەستی بەگیرفانیدا کرد بەرد و ئەستێی دەرێنا و دوو جاری ئەستێ لە بەردی دا پووشوو هەڵایسا، قەننەی بۆ خانۆ هەڵایساند. پاشان پاشە و پاش کشاوە. خانۆ نەفەسێکی قووڵی لە قەننەی دا، دووکەڵەکەی بەئاسماندا پەرت کرد، گوتی:

– پێیان گوتم: ئێوە شەمدینانین. ئەمن هەر جارێکم شەمدینان دیوە، ئەوەش زۆر لەمێژە. ئەو دەمی، لە هەڕەتی گەنجیدا بووم و هێشتا ئێرەمان ئاوەدان نەکردبووەوە. بەڕاستی وڵاتی ئێوە وڵاتێکی خۆشە و خاک و عەرزی وا لە کەم شوێنان وەچەنگ دەکەوێ. ئەو دەشت و دەر و زەوی و زارە بەپیت و بەرەکەتە و بەبڕشتەی لە شەمدینان هەیە بەدەست کێ دەکەوێ. وێڕای ئەوەش خەڵکی وڵاتی ئێوە هەموو وریا و تێ گەیشتوو و خاوەن دەوڵەت و سامانی

گرانن.

عەبدوڕەزاق گوتی:

– بەڵێ قوربان، ڕاست دەفەرمووی، دەڵێن: «شەمدینان بەشێکە لە بەهەشت». بەڵام ڕۆمی ناهێڵن پشوو بدەین. ئەوە چەند جارە بەقۆشەن و لەشکری زۆر و زەوەندەوە هێرشمان دێننە سەر، دەیانەوێ وڵاتەکەمان لێ داگیر بکەن و لە ژێر دەستی خۆیانیان خەن. بەڵام وەڵڵاهی هەر جارێکی لەشکریشیان لێ کردووین زۆر پیاوانە لێیان ڕاپەڕیوین و نەمانهێشتووە پێ باوێنە وڵاتمان. چ دەکەی هێزی ئەو جارەیان هێند زۆرە لە سنوور بەدەرە و لە کێشدا نییە، دەرۆستیان نایەین.

– بەڵێ پادشای ڕۆم و شای ئێران کوردستانیان لە نێوان خۆیان بەش کردووە، نازانم میر سادق پێی زانیوە؟ بۆیە شای ئێران لە لایەک و پادشای ڕۆم لە لایەک هێرشمان بۆ دێن. هەندێ سەرۆک خێڵ و عەشیرەتی کورد دەستیان داوەتە بێ ناموسی و غایەنەتیی میللەت، لە جیاتی ئەوەی لایەکی خێر لە گەلە داماوەکەیان بکەنەوە کەچی بەهەموو بێ شەرمییەکەوە دەچن دەبنە لایەنگری ئەم و ئەو و دەبن بە نۆکەری ڕۆم و عەجەم و مافی میللەتەکەی خۆشیان پێشێل دەکەن.

عەبدوڕەزاق گوتی:

– بەڵێ قوربان، ڕاست دەفەرمووی، میر سادق من و شێخ زادەی ناردووەتە خزمەتتان، دەیگوت: «پێی بڵێن: دەستی ڕادەمووسم، ئێمە لە تەنگانە و دژوارییەکی زۆر گران و نالەباردایین، خۆم هاویشتە بەختی: دەبێ لەشکرمان بۆ بنێری و زوو بەهاوارمانڕا بگا، ڕۆمی دیاربەکریان داگیرکردووە، هەرچەند عەشیرەتی ئەو ناوچانە هەن هەموویان بەدیل گرتوون و کردوویانن بەژێر دەستەی خۆیان ئێستاش هاتوونە سەر ئێمە و دەیانەوێ بەدەردی وانمان ببەن و وڵاتەکەمان لێ داگیرکەن. هەر کاتێکی توانییان ئێمە ببەزێن، هەنگێ بەسانایی دەچن بەسەر حەکاریشدا دەدەن و بەرە بەرە کوردستان هەموو

داگیر دەکەن. ئیدی تا زووە فریامان کەوێ».

خانۆ کە ئەم قسانەی عەبدوڕەزاقی بیست، پرسی:

– ئەوە زانیم کە ئەم زاتە شێخ زادەیە ئەی جەنابت کێی؟ عەبدوڕەزاق نەختێ خۆی گرت، شەرمی دەکرد خۆی ئاشکرا کا، بەڵام شێخ زادە، گوتی:

– قوربان، ئەویش عەبدوڕەزاقە، برا بچووکی میر سادقە.

– بەخێرێن، بەسەر هەردوو چاوان. چەند ڕۆژە بەڕێوەن؟

– قوربان، قەدبڕ هاتین، ئەمڕۆ پێنج شەو و پێنج ڕۆژە بەڕێوەین.

کاتێکی خانۆ سەرگەرمی قسە بوو بەرە بەرە دیوەخان قەرەباڵغ دەبوو، هەرچی دەهات بە ئیکلامەوە سڵاوی دەکرد و لە جێگەی دیاریکراوی خۆی دادەنیشت. مەجلیسەکە پیر و ڕدێن سپی وای تێدا بوو تەمەنیان لە هەشتا – نەوەت ساڵ پتر بوو. هەرچیش وەژوور دەکەوت بەچەک و سیلاحەوە بوون. ئەوانەی ڕمبیان پێ بوو ڕمبەکانیان لە خوارێ دادەنا. بۆ ڕمبان جێگەیەکیان تەرخان کردبوو، بۆ گورز و کەمەندان جێگەیەکی دیکەیان دیاری کردبوو. بەڵام هەرچی شیر و مەتاڵ و قەمە و نێزە و دەمانچە و خەنجەری پێ بوو بەچەکەوە ڕۆدەنیشت. ئەوجا کە مەجلیس هەموو حازر بوون پیاوێکی کەڵەگەتی تەنگەستووری ڕدێن سپی وەژوورکەوت، مەجلیسەکە هەموو لەبەری هەڵستان. ئەم پیاوە وەکو ئەوانی دیکە نەبوو، ئەوانی دی نەختێ پشت کۆم بوون، بەڵام ئەم دەتگوت لاوێکی کەڵەگەتی گورج و گۆڵە، چوو لە سەرووی هەمووانەوە لای ڕاستەوە بەتەنیشت خانۆوە دانیشت. شێخ زادە لەوەی تەنیشتی پرسی:

– ئەو پیاوە پیرە بەڕێزە کێیە؟

– ئەوە باوی خانۆیە. لە ڕاوێژی گرنگدا حازر دەبێ و ڕای وەردەگیرێ. پیاوێکی چازان و زۆرهانە، تەنانەت هاوبەشی شەڕیش دەکا و ئێستاش خۆی بەزۆر لاو ناگۆڕێتەوە و زۆر چاپکانە دەچتە شەڕێ. لە شەڕدا دەمانچە و مەمانچە هەڵناگرێ، تەنیا بەڕمب و میسری و مەتاڵ شەڕ دەکا. جارێکی

چەند سەربازێکی ئێرانی گەمارۆیان دا نیزیکەی بیست کەسێ دەبوون، گوتمان دەیکوژن، بەڵام پیرەمێرد کارێکی پێ کردن نیوەیان بەهەڵاتن ڕزگاریان بوو.

خانۆ سەری بڵند کرد نۆڕییە مەجلیسی، لە سەرەک دیوەخانی پرسی:

– کەس ماوە، هەموو حازرن؟

– بەڵێ قوربان، هەموو حازرن، تەنیا گەورەی هۆزی کەشکۆر نەبێ، دەڵێن نەخۆشە و حاڵی زۆر خراپە، هەر ئەو دواکەوتووە.

خانۆ گوتی:

– مەجلیس، ئەم میوانانە پەیکی میر سادقن، لە شەمدینانڕا هاتوون. حاڵیان زۆر پەرێشان و شلۆقە، لەشکری ڕەشی ڕۆم بەسەریاندا داون و دەیانەوێ وڵاتیان داگیر بکەن و بیانکەنە ژێر چەپۆکەی خۆیان. ئەمڕۆ ڕۆژی غیرەت و نامووسە، ڕۆمی گوندیان وێران دەکەن، سامانیان تاڵان و بڕۆ دەکەن، ژن و منداڵیان بەدیل دەگرن، ئێوە ڕاتان لەسەر چییە؟ چ دەڵێن؟ بەهاواریانەوە بچین؟ نەچین؟

یەکێ گوتی:

– ئێمە چ کارمان بەسەریانەوەیە؟ شەمدینان لە کوێ و ئێمە لە کوێ، ئەوان لە ئێمەوە زۆر دوورن، ئێمە هەر خۆمانمان پێ دەپارێزرێ.

کەس گوێی نەدا ئەو قسەی. پاشان درێژای کێشا، هەریەکە بیروڕایەکی دەردەبڕی. لە پاشان باوی خانۆ گوتی:

– ئەگەر ئێمەش وەکو هەندێ بەگ و ئاغا چاو لە غیرەت و نامووس بپۆشین، ئەوی ئەمڕۆ بەسەر شەمدینان هاتووە، سبەینێ بەسەر مەش دێ. ئێمە نابێ هەروا دەستەپاچە ڕاوەستین، دەبێ هەر ئێستا بەهاواریانەوە بچین و فریایان کەوین.

خانۆ گوتی:

– منیش لەسەر ئەم ڕایەم: دەبێ دوو هەزار سەرباز ئامادەکەین و

بەهاوریانڕا بگەین؛ چونکە ئەم پەیکانە لەمێژە لە شەمدینانڕا بەڕێ کەوتوون، کێ دەزانێ ئێستا شەمدینان چیی لێ بەسەر هاتووە.

مەجلیس وەڕاوێژ کەوت: کێ دەگەڵ لەشکری بە سەرکردە بنێرن، هەندێک گوتیان خانۆ خۆی سەرکردە بێ، بەڵام باوی خانۆ گوتی:

– ئەوە چەند ساڵە هەمزە چاوەش بەسەدان سەربازان بۆ شەڕ ئامادە دەکا، با ئەو سەرکردەی ئەو لەشکرە بێ. ئەو ناردنەی وی دەبێتە ئەزموونێکیش بۆ ئەوەی کە تا چ ڕادەیەک لە مەشقی لەشکر سەرکەوتووە.

هەموو بڕیاریان دا و خێرا لەدووی هەمزە چاوەشیان نارد. کەس نەیدەزانی مەجلیسەکەی خانۆ چەندی لەو ڕاوێژە گرانەدا وەخت خایاند، بەڵام تیرێژی هەتاوی سەر لە ئێوارە لە پەنجەرانڕا وەژوور دیوەخان کەوتبوو، چەک و سیلاح بەدیوارەکانەوە دەچریسکانەوە و ساپیتە و بنمیچی دیوەخانێی تەواو ڕوون کردبووەوە. شێخ زادە سەری بڵند کرد تەماشایەکی ساپیتەی کرد هەموو بە بەردی ڕەنگاوڕەنگی زەرد و سوور و ڕەش و سپی نەخشێنرابوو. دەرگە کراوە سەرەک دیوەخان و هەمزە چاوەش وەژوورکەوتن. هەمزە چاوەش بەئیکلامەوە سڵاوی کرد گوتی:

– قوربان، لەسەر فەرمانی جەنابت وا حازر و ئامادەم.

هەندێ لەبەر خۆیەوە پێکەنینی بەچاوەش هات؛ چونکە تا ئێستا ڕێوڕەسمی وای نەدیتبوو، بەڵام هەمزە چاوەش بیست ساڵ بوو لە نێو ڕۆمیدا ئەو جۆرە ڕێوڕەسمەی لە نێو وان فێر بووبوو و سەربازەکانیش هەر بەو ڕێوڕەسمە مەشق دابوو.

خانۆ بەدەنگێکی نەرم، گوتی:

– من بۆیەم لەدوو ناردووی. کە دوو هەزار سەرباز لەگەڵ خۆت خەی و بەهاواری شەمدینانەوە بچی، ئەمانە پەیکی میر سادقی میری شەمدینانن، ڕۆمی تەنگیان پێ هەڵچنیون، گوندەکانیان وێران دەکەن و ژن و منداڵیان قڕ دەکەن.

هەمزە چاوەش کە ئەو ڕاسپاردانەی خانۆی بیست زەردەخەنە زایە لێوانی، گوتی:

– ئۆخەی، ئەوە منم ئاواتم وەدی هات. بەسەرچاو، هەر ئێستاکە حازرم، بڕۆم.

خانۆ گوتی:

– بەڵێ، دەبێ هەر ئێستا بەڕێ کەوی، چونکە ماوە نەماوە، ئەو پەیکانە ئەوە چەند ڕۆژە بەڕێوەن، کێ دەزانێ ئێستا چ بەسەر میرنیشنی شەمدینان هاتووە.

جەماوەرەکە لە قسەکانی هەمزە چاوەش سەرسام بوون، تێ نەگەیین، بەڵام ڕدێن سپی و چازان لە مەبەستی گەیشتن، گوتیان:

– ئەی نازانن پادشای ڕۆم وڵاتی ئەویشی وێران کردووە و هەرچی گوندی ئەو وڵاتەش هەن هەمووی سووتاندوون و ماڵ و منداڵی قڕ کردوون.

هەندێ لاو پاڕانەوە کە ئەوانیش لەم فریاکەوتنەدا بەشداربن، خانۆ قایل بوو، ئەمانە کەسانێک بوون کە داخی ڕۆمییان زۆر لە دڵدا بوو و دەسخەڕۆی زۆرداری و دەستدرێژییان بوون. کەسانێک بوون کە لە وڵاتی خۆیان تار و لانەواز بووبوون و پەنایان وەبەر خانۆی لەپ زێڕین هێنابوو و لە ژێر داڵدەی ویدا بوون. هەر ئەو ئێوارەیە دوو هەزار پیاو لە شەڕکەرانی خانۆ بەرەو شەمدینان بەڕێ کەوتن؛ هەمزە چاوەش وای بڕیار دا، کە لەشکر هەموو شەوێ سێ چوار سەعات دەبێ بحەسێتەوە و ئەسپان زۆر تەنگاو نەکەن، نەبا لە پێ بکەون، گوتی: ئەسپیش گیانلەبەرە، وەک مرۆ دەچێ، ئەگەر زۆرت ماندوو کرد، زوو لە پێ دەکەوێ و دەوەستێ. وەختی خۆی ئەفسەرەکانمان لە وڵاتی بڵغاریا هێندە جوان بەسەر چیاکاندا دەڕۆیشتن، خۆشمان سەرمان سووڕ مابوو. گەورەمان دەیگوت:

– لە وڵاتی وا نەناسدا مەگەر هەر ئەسپ فریامان کەوێ.

ڕاستە ئێمە لە وڵاتی غەوارە و بیانیان نین و ئێرە کوردستانە، بەڵام ئێمە

زۆر کارمان بەو ئەسپانەیە.

هەمزە چاوەش بە شەش ڕۆژان گەیشتە شەمدینان. لەشکر لە گەلییەکی تووش و سەختدا وەستا.

عەبدوڕەزاق و شێخ زادە و سیمۆنی فەلە دەبوو لەگەڵ خۆلامان چووبان خەبەریان بەمیر سادق دابا. هەمزە چاوەش لە تەڵەکەبازی و فێڵ و دەهۆی ڕۆم شارەزابوو، نسحەتی کردن لە کن کەس باسی گەیشتنی لەشکر نەکەن و نەهێڵن کەس بزانێ سوپاکە لە کوێیە، بەکورتی دەبێ بەدزییەوە خەبەر بەمیر سادق بدەن.

کە خەبەریان بە میر سادق دا، میر سادق بۆ خۆی بەپیرییانەوە چوو، تەنانەت لە خۆشییان بە سواری نەچوو، بە پیادە چوو.

کاتێک نێزیک بووەوە هەمزە چاوەش بەپیرییەوە چوو، پاشان گەڕاوە کن سەربازەکانی، گوتی:

– سەرباز ڕێز لە میر سادق.

بێ جووڵە هەموو لە جێگەی خۆیان وەکو ماستی مەییو وەستان و لە میر سادق ڕامان. میر سەری سوڕما؛ تا ئێستا شتی وای لە نێو کوردان نەدیتبوو، لە دڵی خۆیدا، گوتی:

– ئەمانە وەکو سەربازی ڕۆم دەچن کە لە ئەستەمبۆڵ دیتمن، پاشان هەمزە چاوەش گوتی:

– بەخێرێن میرم، بەسەرچاوان.

– ناوەڵڵا خۆتان بەخێرێن.

هەمزە چاوەش گوتی:

– خانۆی لەپ زێڕین سلاوتان لێ دەکا، داوای تەمەنی درێژی خۆت و میرنشینەکەتان دەکا.

– سلاوی بەسەر سەرم، خوا تەمەنی درێژکا و بۆ کوردانی بەرخوردار کا.

پاش چاک و چۆنی، میر سادق نێوچاوانی هەمزە چاوەشی ماچ کرد و ئەوجا ڕووی لە سەربازان کرد و دەستی لەسەر سنگی دانا، بەدەنگێکی بەرز، گوتی:

– هەمووتان بە خێربێن، بەسەرچاوان هاتن.

ئەم قسانەی میر سادق هێندەی دیکە سەربازەکانی دڵخۆش کرد.

ئینجا هەمزە چاوەش گەڕاوە کن سەربازەکانی، گوتی:

– سەرباز، حەسانەوە! تەنگەی ئەسپان شل کەنەوە و دەسکێش بیانلەوەڕێنن.

هەمزە چاوەش پشووێک میر سادقی لە خۆڵامان دوورخستەوە و چوون لەسەر کانیاوێک لەدەم ئەو گەلییە ڕۆنیشتن، هەمزە چاوەش دەستی بەپرسیاران کرد:

– قوربان، ئەوجا بۆم بگێڕەوە. حاڵتان چۆنە؟

– حاڵمان دەبێ چۆن بێ، قۆشەنی ئەو کافرە پەیتا پەیتا هێرشمان بۆ دێنێ. هێزەکەی لە دەشتی ڕاستان وەدەرناین، ئێستا گەرمەی شەڕ لەو هەڵەتەیە. تۆپیان زۆرە، بەو خوایەی لە ژوور سەرانە تۆپیان نەبا نەماندێشت پێ باوێنە خاکی شەمدینان.

– ببوورن، نێوی خزمەتتان؟

– هەمزە چاوەش میرم.

– ئەتو چی خانۆی لەپ زێڕینی؟

– قوربان، بەخزمایەتی ناگەینە یەک، ئەمن مەشقدەری سەربازانیم.

– یاخوا بەخێربێی. بەڕاستی ئەوە چەند جارە پادشای ڕۆم لەشکری لەسەر دەکردین و هەموو جارێ قڕمان دەکردن، بەڵام لەشکری ئەم جارە زۆرە و لە کێشدا نییە.

– باشە، چ جۆرە لەشکرە، چتۆ قۆشەنە، سوارەن، پیادەن؟

– سوارەشن و پیادەشن، تۆپیان زۆرە. ئەوێ ڕۆژێ چەند کەسێکمان لێ بەدیل گرتن، یەکیان کورد بوو. هەرچەند بەکوردی قسەی نەدەکرد، بەڵام لاوێکی خۆمان ئاشکرای کرد.

– جا ئەو دیلە کوردە ماوە؟

– بەڵێ، ماوە.

–دە کەواتە، بینێرنە کن من، زۆرمان کار پێ دەبێ. جگە لەوە، بەڕاستی زۆر ماندووین، ئەوە شەش شەو و شەش ڕۆژە بەڕێوەین. سەرباز هەموو شەکەتن و پێویستییان بەحەسانەوەیە، دەبێ تێر بنوون. جا سبەینێ بۆ ئەوەی بەچاوی خۆم سەنگەری سوپای دوژمن ببینم دەچمە مەیدانی شەڕ، هەنگێ پێتان دەڵێم چ بکەین. بەڵام لە پێشدا دە زەلامی ئازا و بوێرمان دەوێ، شارەزای ڕێگاوبان و کەل و بەندەنی چیاکانی شەمدینان بن و ببن بە بەڵەدی سەربازەکانمان. جا، دەبێ هەر ئێستا ئامادەیان بفەرموون و هەر کاتێکی داوامان کردن گورجێ بۆمیان بنێرن.

میر سادق گوتی:

– زۆر بەجێیە، با جارێ بچینە ماڵێ.

– بەڵێ دێم، تۆ فەرموو، من کەمێکم کار هەیە، پاش تۆزێکی دیکە دێم.

میر سادق ڕۆیی. هەمزە چاوەش لە هەموو شوێنێکی پێویست ئێشکگری ڕاگرت، فەرمانی بە سەرکردەی سەرلقان دا کە عەسکەر هەموو بحەسێنەوە و بنوون. بۆ هەر سەرلقێ چەند ئێشکچییەکی دانا، کە بەنۆرە، یەکی سێ سەعاتان ئێشک بگرن، تا ئێشگرەکانیش بحەسێنەوە.

فەرمانی دا کە دەبێ یەکێ لە سەرکاری سەرلقەکانیش ئێشکی ئێشکگرانی بێ، گوتی:

– پێویستە زۆر چاک بزانن کە دە بەرانبەر لەشکری ڕۆمی وەستاوین و زۆر بەتەڵەکە و فێڵان شەڕێ دەکەن. دەبێ زۆر چاکمان ئاگا لە خۆ بێ، نەبا لە نکا بەسەرماندا بدەن و لە ئاکامدا تووشی سەرشۆڕی و تێشکان بێین.

سەربازە شەکەتەکان زوو خەویان لێ کەوت. جگە لە ئێشکگران، کە دەهاتن و دەچوون، کەس وەخەبەر نەبوو، هەمزە چاوەش لەسەر گاشە بەردێکی ڕۆنیشتبوو، ئێشکگرێک لە نێزیکەوە بوو، گوتی:

– «سەرکردە، پیاوێک لە کن میر سادقەوە هاتووە، دەڵێ ڕێگام بدەن، بۆ کن هەمزە چاوەش هاتووم، میر سادق ناردوومی».

هەمزە چاوەش گوتی:

– ڕێگای بدەن، با بێ.

پیاوەکە هات، ئیکلامێکی عەشایەرانەی کێشا و گوتی:

– ئەو کوردەی کە بەدیل گیراوە، بەفەرمانی میر سادق بۆ ئەشکەوتەکەمان هێناوە.

هەمزە چاوەش هەستا چووە ئەشکەوتێ، نۆڕی کابرایەکی دەست و چاو بەستراوە وەستاوە، فەرمانی دا دەست و چاوی بکەنەوە. دەست و چاویان کردەوە. ئینجا لێی پرسی:

– تۆ سەربازی کام بلووکی و سەر بە کێهە تابووری؟

دیلەکە، کە بیستی بەڕۆمییەکی ڕەوان لەگەڵی دەئاخێوێ، ترسی ڕێ نیشت و کڕ بوو. هەمزە چاوەش بەتووڕەییەوە پرسیارەکەی لێ دووپات کردەوە و تێی ڕاخوڕی:

– بۆ قسە ناکەی، سەربازی کێهە بلووکی؟ سەر بە کام تابووری؟

– بلۆکی چوارەم، تابووری شەشەم.

– من پێم وایە تۆ تورک نی، کوردێکی وەکو منی، بەڵام هەرچی تۆی غەیانی میللەتی خۆتی، ئەمنیش بیست ساڵی ڕەبەق پاسەوانی پادشای ڕۆمی بووم، چاوەشێکی دڵسۆز بووم. هێرشمان بۆ سەر عەرەب و یۆنانییان دەبرد، ئەو دەمی قوماندان و بینباشی و پاشاکانیان پێیان دەگوتین: کورد و تورک بران، ئێمەش بڕوامان پێ دەکردن. بەڵام لە پاشان قشونێکی گەورە و گرانیان لەسەر کردین، دێهات و شار و ماڵ و منداڵیان بەر گوللە تۆپ داین و بەشیر و

ڕم و سـەرە نێز قـڕیان کـردین، دیاربەکـریان داگـیر کـرد، دەشـتـی «کەڤـانی کیر»یان خـاپوور و تەفر و توونا کـرد، منیش هـەر ئەوەندە نەبوو لە داخـان دڵم نەتۆقیێ، ئـیدی لەمـە پـتـرم خـۆ پێ نەگـیرا، هـەڵاتم و بۆ نێـو مـیللەتەکـەی خـۆم گەڕامەوە و ئێستا خەباتی بۆ دەکەم.

کـابرای دیل کـە ئەم قـسـانەی بیـسـت خـۆی بەسـەر دەست و پێی هـەمـزە چاوەشدا دا، گوتی:

– ڕاسـتـە، من کـوردم. لە عـەشـیـرەتی ئەترووشـم، ناوم (نەبی)یە، بەڵام پەیمانت دەدەمێ ئەمنیش وەکو تۆ لەمەوپاش پاسەوانی میللەتەکەی خۆم بکەم و لە پێناوی ویدا خەبات بکەم.

نەبی هەرچی سـڕی لـەشکری ڕۆم هەبوو: چـەند ئۆردوون، چەند بلـووکن، تۆپ و جبەخانەیان لە کوێدایە، هەمووی ورد و باریک بۆ ئاشکرا کرد.

لە پاشان فرمێسک بەچاویدا هاتە خوارێ گوتی:

– ئەفسـەر، شـەرت و پەیمانی پیاوەتی بێ ئـیدی لەمـەوپاش منیش وەکو تۆ بەهەموو دڵسۆزییەکەوە خزمەتی گەلەکەی خۆم بکەم.

هـەمزە چاوەش هێشتا لە ئەشکـەوتێدا بوو، خەبەریان دایە، کە وا دوو سـەت شـەکە نێر و دە جوانەگایان بۆ سەربازان هێناوە، لە گەلی بیانکوژنەوە، باری چەند وشـترێکیش نانیـان هێناوە. هـەندێکی دیکە هـەمزە چاوەش نەبیی دواند، پاشان گوتی:

– ئەمن تۆ لە کنە خۆم گل دەدەمەوە.

بۆ ڕۆژی دواییێ، ئێـوارێ هەمزە چاوەش لە دیوەخـانەکـەی میـر سـادقی بوو، لەگەڵ مـەزنی هـۆز و خـێڵـەکانی شـەمدینان و دەمڕاست و گـەورە گەورەکـانی میر سادقدا دەستی بەتەگبیر و ڕایێ کرد، گوتی:

– پیاو ماقووڵان، برایان، من زۆر چاک هەستم بەوە کردووە کە هێز و چەک و جبەخانەی دوژمن مۆڵی خواردووە. سەرکردەیان عوسمان پاشایە، بەڵام ئەو هێـشـتـا بـەوەی نەزانیـوە، کـە هێـزی دوو سـێ هەندی جـارانە، ئەو ئێـسـتـا

ئەرخاین و دڵنیایە، هەرچی سەربازەکانی منیشن ئەوە دوو ڕۆژە ماندوویان نەحەساوەتەوە. دەمەوێ ئەو شەو لە پشتڕا بەسەریاندا بدەم، ئێوەش لە کن خۆتانەوە تێیان کەون، من لەو بڕوایەدام، لە دەشتی شەمدینانێ، ئەم جارە دەتوانین جەندرمان قڕبکەین و دەرزێکی وایان بدەینێ جارێکی دی ڕوو لێرە نەکەن.

تازە کەوتبوونە مانگی پایزێ، هەوا هێشتا خۆش بوو، هەمزە چاوەش قومانداندانە سەدلکەکانی کۆکردەوە تێی گەیاندن، کە چۆن ئەوشەو بەسەر دوژمندا دەدەن. قوماندانە سەدلکەکان یەکەم جار بوو لە کۆبوونەوەیەکی وادا هاوبەش بن و ڕاوێژی شەڕی تێدا بکەن. لە پاش ڕاوێژەکە هەرکەس گەڕاوە نێو ڕیزی خۆی.

شێخ زادە هاتە کن هەمزە چاوەش، گوتی:

– میر سادق دەفەرمووێ، بێ، نانی ئێوارێ لێرە بخوا.

– شێخ زادە بە میری بڵێ، خوا خێر و دەوڵەتی دنیای هێندەی دی بەسەردا ببارێنێ: قلیانی و گۆشتێکی مشەمان هەیە، با بمبوورێ، لە سەربازەکان جوێ نابمەوە، خوا یا بێ لەگەڵ میردا زۆر دادەنیشین و جامە شەربەتان زۆر دەنۆشین.

بڕۆ، بە میری بڵێ، لە بیری نەچێ: لەشکری خۆی تەیار بکا و بۆ هێرشی بەرەبەیانێ، من دەبێ لە کاتێکدا بەسەر دوژمندا بدەم، کە هێشتا لە پرخەی خەوێدا بن، هەرکە بەسەرماندا دان، ئێوەش وەکو دوێنێ شەوێ بڕیارمان لەسەر دا لە قۆڵی خۆتانڕا لێیان وەرێن.

عەبدوڕەزاق، گورجێ، پاش ڕاوێژەکە چووە کن قازی بەگی، سەرداری لەشکر ڕای گەیاندێ کە خۆیان بۆ ئەو شەو ئامادە و تەیار بکەن.

– عەبدوڕەزاق کێیە؟ نایناسم.

– عەبدوڕەزاق ئەو پیاوەیە کە پێکەوە بۆ قەڵای ئێوە هاتبووین.

پاش ئەوەی کە شێخ زادە گەڕاوە، هەمزە چاوەش هاتەوە نێو

سەربازەکانی، گوتی:

– جا ئەو شەو بتانبینم، شەوێکە لە شەوان، بتانبینم. بتانبینم تا چەند فێرە مەشقی سەربازی بوون، چلۆن شەڕێ دەکەن، چۆن ناوی خانۆ و عەشیرەتی بەرۆداری قارەمان لە نێو میرنشینی شەمدینان و هەموو کوردستاندا بەئاسمانێ دەگەیێنن.

شەوێکی تاریکی ئەنگوستە چاو بوو، هەور بەری ئاسمانی بەرەنگێ گرتبوو، دەتگوت بەلباد داپۆشراوە، هەمزە چاوەش بانگی بەڵەدی کرد، گوتی:

– ئێوە سێ لاوتان لە پێشەوە بڕۆن، تا دەمان گەیەننە پشت لەشکری ڕۆمی، دیلەکەی لەمەڕ خۆشمان خەبەرتان دەداتێ، کە مۆڵگەی دوژمن بەتەواوی لە کوێدایە. ئێوە شارەزان، دەبێ بەرێگایەکماندا ببەن کەس هەستمان پێ نەکا. هەندێکتان لە کن من بمێننەوە. دە بەڕێ کەون خواتان لەگەڵ.

هەمزە چاوەش، سەربازەکانی چۆن تەمێ دابوو، بەو ڕەنگی بەرێکوپێکی، سەدلکی سوارە، بەرە بەرە دوا بەدوای یەک بەڕێ کەوتن و ڕۆیشتن. هەمزە چاوەش بۆ خۆی پێشەنگ بوو، شەبابیشی کردبووە پاشەنگ.

کاتێکی بەڕێ کەوتن، بەهاوڕێکەی تەنیشتی گوت:

– ئەم شەو لە خەونمدا.

هاوەڵەکەی هەڵی دایێ:

– خوا بەخێری بگێڕێ، هەواڵ.

ئەم شەو لە خەونمدا چووبوومە گەرماوێ، لە گەلییەکدا مەلەی بکەم. ویستم بەرگم فڕێ دەم و خۆ لە ئاوێ خەم، هەر ئەوەندەم زانی دلبەری گیراوێم دەست بەمسینە بەرەو سەراوێ هات. ئەمنیش خۆم لە پەنا گاشە بەردێکی شێردەوە، بزانم بۆ کوێ دێ. نۆڕیم ڕێ و ڕاست بۆ پەنا گاشە بەردەکەی هات. ویستم بیگرم، لە ئامێزێی کەم، بەڵان لەو خەونەدا خۆم بەخۆمم گوت: «من ئەم کیژە بۆ چ بتۆقێنم» ئیدی دلبەر کە چاوی پێ کەوتم، دەستی

بەپێکەنینێ کرد و گەڕاوە، گوتی: «پێت وایە ناتبینم، من هێشتا لە ڕۆخ گەلییێ بووم بەدیم کردی، ئامان وریای خۆت بە» لەم خەونەدا گرتم ماچی کەم لە حیلەی ئەسپەکەم وەخەبەر هاتم. کاتێ سەیر دەکەم زینی ئەسپەکەمم لە باوەشێ گرتووە کە لە بن سەرمدا بوو. بەڕاستی هێندە تووڕە بووم هەر ئەوەندە نەبوو ئەسپەکەم وەبەر شیران بدەم، نەیهێشت لەو خەونەدا دلبەر باش ببینم، بەڵام لە پاشان بیرم کردەوە: «ئەم گیانلەبەرە بەسەزمانە گوناهی چییە؟ ئەسپە و دەحیلێنێ». خۆشت دەزانی ئەسپەکەم چۆن ئەسپێکە.

هەردووکیان دایانە قاقای پێکەنینێ و هاوڕێکەی گوتی:

– مادام پێی گوتی: «وریای خۆت بە» خوا لە بەڵای ناگەهان و وەیت دەپارێزێ.

لەشکرەکە بەو شەوی وا تاریک ڕێگایەکی باشیان بڕی. هەمزە چاوەش جار جار دەی ئاژوا، پێش لەشکرێ دەکەوت، جار جاریش وەپاش دەکەوت و لەگەڵ شەبابدا دوو سێ ورتەی بەنەرمی دەکرد، دیسان بەرەو پێشی دەیئاژوا. زۆری نەخایاند لە پڕ ترووسکەی جگەرەیەکی* لە لای سەربازێکەوە بەدی کرد. هەمزە چاوەش خۆی پێ نەگیرا هەڵی کوتایە سەری و تازیانەیەکی تێ سرەواند، گوتی:

– توڵە باو، من دوێنێ تەمێم نەکردن، کە نابێ کەس ئاگر هەڵکات. بەتەمای بەو شەوە ئەنگوستە چاوە لە دوژمنمان ئاشکراکەی و وەبەر تۆپانمان دەن و قڕمان کەن. سەربازەکە جگەرەکەی کوژاندەوە و تووڕی هەڵدا، گوتی:

– چاوەش گیان، ببوورە، نەمزانی، ڕاستت دەوێ تەمێکەتم لە بیر چووبوو.

لەشکرەکە لەبەر گوژمێکدا مۆڵی خوارد و هێورا، کوڕە بەدیل گیراوەکەی نێزیکی هەمزە چاوەش، بەقەستی، هێدی هێدی بەتورکی گوتی:

– ئەفەندی، لەشکری عوسمان پاشا وا پشت ئەوێهێ چیای، تا چاو هەتەر دەکا لەشکرە، تا دەگەیە ئەو چیایەی دیکە. هەمزە چاوەش بەکوردی گوتی:

---

* پێم وایە ئەو سەردەمی جگەرە و تووتن نەبوو –وەرگێڕ–.

– نەبی گیان، ئەتو زۆر چاکت هێناین، بەڵەدیی تۆ جێی سوپاسە. ئیدی چاوەنۆڕی غیرەت و پیاوەتیتم.

بایەکی نەرم لە چیایڕا هەڵی کرد، دەتگوت بۆیەی هەڵکرد، هەور و هەڵای ئاسمانێ ڕامالّی و بیکا بە سامالّ، مانگ لە دەم کەلەوە تازە بەدیار دەکەوت و بەرە بەرە گەورەتر دەبوو، تا هێندەی سینێیەکی خشتی لێ هات. هەمزە چاوەش نەبیی لەوێندەرێ بەجێ هێشت، چوو بەسەرەک سەدلکی گوت: لەشکر ئامادە بن و لەبۆی ڕوون کردەوە کە کێ لە کوێیە و لە کێهە لاوەی لە دوژمن وەرێن، لە پاشان گەڕاوە شوێنی خۆی.

هەمزە چاوەش نۆڕییە مانگ، وەبیری هاتەوە کە هێشتا منداڵ بوو، داپیری قسەی بۆ دەکرد، دەیگوت:

هەمزە گیان، مانگ و ڕۆژ خوشک و بران، هەردووکیان حەزیان لێک کرد، ئەوەش گوناهێکی زۆر گەورە بوو، خودا بەو گوناهەی زانی و هۆردووکیانی لێک هەڵبڕین و تا ئێستا هەر بەدووی یەکدا وێڵن و بەهەویای ئەوەن بەیەک بگەن، بەلام هەرچەند دەکەن ناگەنە یەک. خوا نەخواستە، ئەگەر وەیەک گەیشتن، ئەوە بەجارێ شیرازە و کۆکی دنیا تێک دەچێ و ئەرز و ئاسمان وەردەگەڕێن و کەس بەسەر ڕووی بساتەوە نامێنێ. مانگ تەواوێک بڵند بووبووەوە، تریفەی مانگە شەو کەمێ دنیای ڕوون کردبووەوە. ئیدی بەرەبەیان نێزیک بووبووەوە، هەندێ لاو باوێشکیان دەهاتێ، هەمزە چاوەش گوتی: «نوستنی بەیانیان خۆشە، ئێستا دوژمن لە خرپەی خەوێدان»، فەرمانی دا لەشکر بەسەریاندا دان.

ئەوێ شەوێ سەربازی ڕۆمییان وەکو مەڕی گێژیان لێ بەسەرهاتبوو، نەیاندەزانی ڕوو لە کوێ بکەن و بەرەو کێندەرێ هەڵێن. بەچاوی خەواڵووەوە خۆ بەخۆ تێک بەربووبوون، دۆست و دوژمنیان لێک هەڵنەدەبڕین. لەشکری هۆزی بەرۆداریان وا تێ کەوتبوون، تا دنیاش ڕوون بووەوە هەر شینگەی شیر و مەتاڵ و خرپەی رمبان بوو و بەسەر تەپڵی سەری سەربازی ڕۆمی داگیرکەردا دەدرا. هەمزە چاوەش کە بەسواری تێیان دەکەوت، بەڕاست و

چەپدا دای دەپاچین و پێی دەگوتن:

– ئەمە لە تۆڵەی دیاربەکر، ئەوە لە تۆڵەی هۆزەکەم، هۆزی خالیدیان، ئەوەش لە تۆڵەی دەشتی بشێریان.

لەشکری ڕۆم سەری لێ شێوابوو، ئیدی تێک بەربووبوون و یەکدییان قڕ دەکرد، سەربازەکانی میر سادق، لە قۆڵی شاری شەمدینانەوە گەمارۆیان دابوون. هەتاو لە دەشتی شەمدینانی دەدا، کە دەتنۆڕییە ئەو دەشتەی، دەتگوت جندۆکە دەستیان لە سەربازی ڕۆمی وەشاندووە: هەندێکیان چەکیان فڕێ دەدا، دەیانگوت: «بەن تەسلیمم»، هەندێکی دیکەیان خۆیان بەعاردیدا دادەنووساند، وەبەر ڕمب و شیران نەکەون، بەڵام بەو حاڵەشەوە لە ڕمب و شیری کوردان ڕزگاریان نەدەبوو و بەڕاست و چەپدا هەڵدەپاچران، هەندێکیش هەڵدەهاتن و لە بن دەست و پێی ئەسپاندا گولۆڵە دەبوون.

هەمزە چاوەش لەم شەڕەدا بۆی بەدەرکەوت کە ڕەنجی بێوەر نەبووە و مەشقەکانی بەفیڕۆ نەچووە و سەربازەکانی سوودێکی زۆریان لێ وەچەنگ کەوتووە، بەڕاستی هێندە جوان پێڕەوی یاسا و دەستووری شەڕیان دەکرد، دەتگوت لە بۆتەی زۆر شەڕی گەورە گەورەدا قاڵ بوونەوە. سەربازەکانی ئی وایان لێ هەڵکەوتبوو، کە ئەڵقەی کەمەندیان لە قورقوڕاگەی دوژمنان شەتەک دەدا و بەتاو کەمەندکێشیان دەکردن، سەربازی ڕۆم کە چاویان بەوە دەکەوت لە پەلوپۆ دەکەوتن و بەجارێ ورەیان بەر دەدا و لە ترسان نەیاندەزانی کێوە هەڵێن. نەبی لە هەمزە چاوەش دوور نەدەکەوتەوە، گوتی:

– ئەفەندی، بنۆڕە ئاشەکانی بناری ئەو گوندە، کەمێ لە خوارەوە، ها ها، ئەو زەلامانە چۆن خۆیان چەماندووەتەوە بەماتە ماتە هەڵدێن.

هەمزە چاوەش کە لای کردەوە تەماشای کرد چەند ئاشێک لە بناری گوندەکە دیارن و چەند زەلامێکیش خۆیان مات داوە، خەریکن لە جۆگەی ئاشەکانەوە هەڵدێن. هەمزە چاوەش لەگەڵ نەبیدا هەڵیانکوتانە سەر، نوارییان چەند ئەفسەرێکی ڕۆمین. ئەم ئەفسەرانە وایان زەندەق چووبوو،

نامـەخوا هیـچیـان دەستـیـان چەکی نەدەگـرت. چونکە ڕوویـان لە هـەر لایەک دەکـرد، کـورد ڕێگای لێ دەگـرتن و دەوروبـەریانـی هـەمـوو لێ دەتەنین. هـەمـزە چاوەش بەزمانی تورکی تێی ڕاخوڕین:

– وا مـەزانن ئێـرەش دیاربەکـرە، ڕوو لە هـەر کـوێ بکەن کـوردە، تـەنانەت پەنا و پەسێوی بەردیش پڕن لە کوردان.

یەکیان نەبی ناسییەوە، نەبیش ئەوی ناسییەوە.

کـاتێ هـەمـزە چاوەش ئەم دیلانەی بـەنێـو گـوندەکـەدا دەگـێـڕا، ژنێک لە سەربانەوە بەدەنگ و ئاوازێکی خۆش و بڵند ئەم لاوکەی دەگوت:

برا، لێ دەن خزمینە لێدەن.

تۆڵەی وڵات، ئی ژن و منداڵی کوردانیان لێ بستێنن.

شەڕێک داکەوتووەتە دەشتی شەمدینانی خواروو،

خوا خانۆی لەپ زێڕین لە بەڵا بپارێزی،

برا لێ دەن، خزمینە لێ دەن

تۆڵەی وڵات، ژن و منداڵی کوردانیان لێ بستێنن.

شەڕێک داکەوتووەتە دەشتێکی ڕاست و تەختان

سەربازی ڕۆم هەناسە بڕکێیەتی وەکو کوچکان

براینە..................................................

تۆڵەی..................................................

سـوارێک سـەڵەف و سەرەڕۆ بۆ کن هـەمزە چاوەش هات، دەسـتی درێژکـرد، گوتی:

– ئەوە عوسـمان پاشایە و گـەورەی لەشکری ڕۆمە و لەو دۆڵەدا چەند کیژە کوردێکی وەپێش خۆی داوە و هـەڵدێ.

هـەمزە چـاوەش لەگـەڵ چەند سـوارێکدا بـەرەو ئەوێ دەسـتـیـان بەجـڵـەواندا هێنا، گەیشـتنە دۆڵەکە، کـەسیان نەدی. بەڵام کیژێک لە پەنا گـاشە بەردێکەوە

وەدیارکەوت، بازێکی دا، لە پێش سوارەکاندا قوت بووەوە، گوتی: لێرەوە هەڵاتن.

هەمزە چاوەش لەگەڵ سوارەکاندا بەرەو گەلی چوون، بەڵام پاشا لەوێش نەبوو. پاشا لە چەنگ سەربازی کورد ڕزگار بووبوو. و هەڵاتبوو.

مانگێ پتر بوو کورد لە دەشتی شەمدینان و چیاکاندا خەریک بوون سەربازی ڕۆمیان ڕاو دەکرد، ئەوی کوژرا، کوژرا، ئەوی بەر هەڵمەتی کوردان نەکەوت بۆ خۆی دەرباز بوو.

لەوێ ڕۆژێوە کە شەباب بۆ شەڕی شەمدینان چووبوو، ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێ پەڕیبوو و هیچ سەر و سۆراخێکی نەبوو. کەس نەیدەزانی لەشکرەکە چیی بەسەرهاتووە. دلبەر هەمیشە بیری دەکردەوە، جاروباریش لەبەر خۆیەوە دەیگوت:

– خوا بیپارێزێ و لەگەڵ هاوڕێکانیدا بەسەلامەتی زوو بگەڕێتەوە.

چەند جارێ چووبووە کن مەلا نوشتەی بۆ دەکرد، کتێبی بۆ دەگرتەوە، دەیگوت:

– بەم زووانە بە سەلامەتی دەگەڕێتەوە.

ئیدی دنیا پایز بوو، بەڵام شەباب هەر نەگەڕاوە و کەس سەرەنجام و هەواڵی نەزانی. دلبەر ڕۆژێکی هەینی چوو بۆ کن فاڵچییەک، کاتێکی وەژوورکەوت، تەماشای کرد پیرێژنێکی سەر سپی، لاواز دانیشتبوو قەندەی دەکێشا، پیرێژن کە چاوی بە دلبەر کەوت و ڕوانی جلوبەرگی پۆشتەیە، تەزووی شادی بە لەشیدا گەڕا و لە دڵی خۆیدا گوتی:

– «دەنگ مەکە خوا ڕۆزییەکی چاکی بۆ ناردین». قەندەکەی دانا، گوتی:

– بەرەژوور وەرە کچی خۆم، شەرم مەکە، ئێرە ماڵی فاڵچیی بەناوبانگە. ئەوی ڕووی تێ کردبێ بەئاوات و هەویای خۆی گەییوە و بە ناهومێدی نەگەڕاوەتەوە. دلبەر هاتە پێشێ، گوتی:

– خوا ماڵت پڕ لە خێر و بێر کا.

– بەخێربێی، بەسەرچاومان، کچی خۆم.

پیرێژن بەدەست ئیشارەتی کرد، دلبەری لە تەنیشتی خۆی دانا، گوتی:

– شەرم مەکە، پێم بڵێ چت لە دڵدایە و بۆچی هاتووی؟

دلبەر سەیرێکی ئەملا و ئەولای خۆی کرد، کەسێکی دیکەی بەرچاو نەکەوت، کچێکی چواردە ساڵان نەبێ، ئەویش پیرێژن چاوی لێ داگرت، وەدەرکەوت.

دلبەر گوتی:

– داپیرە، وا هاتوومە خزمەتت و داخوازێکم هەیە.

– فەرموو، بێژە، بەڵام من دەزانم داخوازەکەت چییە و بۆ کێیە.

دلبەر کە ئەمەی بیست، وەکو گوڵ گەشاوە، گوتی:

– ئەرێ وەڵڵا داپیرە من لەبەر وی هاتووم.

– دە مادامێکی دەتەوێ نیاز و داخوازەکەت بێتە دی و ڕەمڵەکەت ڕاستی بێنێ، هەندێ دراو باوە سەر ئەو ڕەمڵە.

دلبەریش جۆرکێکی لەبەر پشتێنی دەرێنا و چەند دراوێکی زێوی هاویشتە سەر دەسماڵی داپیرە، داپیرە کە چاوی بەجۆرک کەوت، دراوێکی زۆری تێدایە، گوتی:

– کیژی خۆم، ئەمن کە ڕەملان بۆ خەڵکی دیکە دەگرمەوە زێرم بۆ داوێنە سەر دەسماڵی، کەچی تۆ دراوەکەت زیویشە و کەمیشە. ئەگەر دەتەوێ کارت سەر بگرێ، نابێ درێغی بکەی، دە هەندێ دراوی دیکەش دەرێنە و بۆمی لەسەر ڕەملەکە دانێ. دلبەریش هەندێ دراوی دیکەی لە جۆرکی دەرێنا و بۆی لەسەر دەسماڵی دانا. داپیرە دراوەکانی کۆکردەوە و دەگیرفانی هاویشت. ئەوجا ڕووی لە دلبەر وەرگێڕا و پشتی تێ کرد، هەندێ ورتە ورتی لێوە هات، گوتی:

– کچێک کارەکەی لێ ئاڵۆزاندووی، بەڵام من کارێکت بۆ دەکەم، کە لەبەر چاوی ڕەش بێ و لە تۆ زیاتر بەنگیی کەسی دیکە نەبێ.

دلبەر بەسەرسوڕمانەوە لە داپیرەی نۆڕی گوتی:

– من بۆ ئەوە نەهاتووم، بەنگی بکەم. داپیـــرە کـــە زانی لە داخـــوازی نەگەیشووە و ڕازی دڵی هەڵنەهێنا، گوتی:

– ئەی ڕازت چییە و بۆچی هاتووی؟

– من بۆیە هاتووم، ڕەمڵـەکـەت باسـی سـەر و سـۆراخـیم بۆ بکا، کـەنگێ دەگەڕێتەوە.

داپیرە دیسان ڕووی خۆی لەولای کرد و بووەوە بە ورتە ورت، پاشان ڕووی لە دلبەر کردەوە گوتی:

– شوکور ساخ و سەلامەتە، ڕۆژی چوارشەممە دەگەڕێتەوە.

دلبەر ڕەزامەندیی خۆی بۆ داپیرە دەربڕی و لێی دا ڕۆیی.

ڕۆژی چوارشەمە هات، دلبەر ئەوێ ڕۆژێ لە ماڵێ وەدەرنەکەوت بەتەما بوو ئەوێ ڕۆژێ شەباب بگەڕێتەوە. گەلێ چوارشـەممە ڕابردن، بەڵام شـەباب هەر نەگەڕاوە، پاش ئەوەی شەڕ لە شـەمدینان بڕابووەوە، ڕاسـتە لە هـەندێ ماڵە کوڕکوژراو و مێرد کوژراواندا کۆڕی شین دەبەستـرا، بەڵام لە سـەرانسـەری میرنشینی شەمدیناندا شایی و زەماوەند بوو؛ چونکە خەڵکی شـەمدینان لە کـوشتن و بڕین و زۆرداری ڕۆمـیـیـان ڕزگـاریان بووبوو. ئیـدی گـەلێ ڕێزی لەشکری خانۆی لەپ زێڕینیان گرت و هەرچی شایان بوو بۆی کرا.

مـیر سـادق لە پاداشـتی مـێرخـاسـیی هەمـزە چاوەشدا بـەدەسـتی خـۆی وربەیەکی میرێتیی بەخەڵات لەبەرکرد.

هەتاو زوو هەڵاتبـوو، ئیـدی ڕۆژ چێـشـتـانێکی تەواو بـوو، بەگ و ئاغـا و سـەرۆک هۆز و تیرەکان و شێخ و مەلا زوو لەبەر دیوەخـانەکەی مـیر سـادقی ئامادە بووبوون، چاوەنۆڕی هەمزە چاوەش بوون، لە دیوەخانەی وەدەرکەوێ.

ئەو بەیانییـە خـەڵکی شاری شـەمدینان بە ژن و منداڵ و پیر و کاڵەوە زوو هاتبـوونە دەرێ، هـەندێ لـەبەر دەرکی، مـاڵی خـۆیـان، هەندێ لە سـەربـانی کۆشـک و تالارە بڵندەکانیـانەوە چاوەنۆڕ بوون، کە مـیوانە خۆشەویسـتەکـەیان

بەرەو قەڵای دمدم بەڕێ کەن.

لە مەیدانی کۆشکی میر سادقدا، جگە لە خەڵکی شاری شەمدینان خۆی، گەلێ پیاوی دیکەش لە گوندەکانەوە هاتبوون. هەندێکیان لە گوند و ناوچە دوورەکانەوە هاتبوون، هەم میوان بەڕێ کەن، هەم بەچاوی خۆیان هەمزە چاوەش ببینن. میر سادق، شێخ زادە، عەبدورەزاق، هەمزە چاوەش، کۆمەکدارانی، چەند سەرپەل و سەرلکێکی و دەمڕاست و گەورە گەورەکانی میرنشینی شەمدینان لە دیوەخان وەدەرکەوتن. بەردەرکەی کۆشکی میر سادق هێندەی خەڵک لێ ڕاوەستابوون، دەرزیت هەڵدابا بەر زەوی نەدەکەوت. بابی شێخ زادە، شێخی میرنشینی شەمدینان هات، لە نێوەندی مەیدانێ ڕاوەستا، گوتی:

– لاوەکانم، ئێوە ئێمەی کوردی شەمدینانتان لە زۆرداری و کوشتن و بڕینی پادشای ڕۆم ڕزگار کرد، خۆزی هەموو میر و بەگ و ئاغا کوردەکانی ئێمەش وەکو خانۆ و ئێوە بان – شێخ ڕووی لە هەمزە چاوەش و سەرپەل و سەرلکەکانی کرد، گوتی: بڕۆن، بە خانۆ بڵێن، بۆیەش خانۆ دەڵێم؛ چونکە دەزانم خۆی حەز ناکا لەپ زێڕینی پێ بڵێن، بڕۆن پێی بڵێن، ئێمە گەورە و بچووکی شەمدینان ئەم چاکە و پیاوەتییەیمان هەرگیز لە بیر ناچێتەوە، بڕۆن، سڵاوی میر سادقی پێ ڕاگەیێنن، بڵێن میر سادق ئەم شیرە کەونارایەی باو و باپیرانی خۆی بەدیاری بۆ خانۆی ناردووە و شیری وا هەر شیاوی دەستی ئەوە و بەس.

میر سادق بەدەنگێکی بڵند گوتی:

– ئەرێ وەڵڵا، ئەشەدوبیللا، ڕاست دەفەرمووی.

شێخ شیری دایە دەستی هەمزە چاوەش، شیرێکی زۆر درێژ نەبوو، شیرێکی کووڕ بوو، کالاکەیان بەزێڕ نەخشاندبوو، هەمزە چاوەش شیرەکەی لە دەستی شێخ وەرگرت، گوتی:

– گەلی براینە، پیاو ماقوولانی تیرە و هۆزەکانی شەمدینان، ڕاستە لەم

شەڕەدا چەند  پیاوێک لە سەربازەکانم بریندار بوون، بەڵام من تۆڵەی کۆن و نوێم لە ڕۆمیان ئەستاندەوە و داخی دڵی خۆم بەجارێ پێ ڕشتن. ئێمە زۆرتان لێ ڕازین، بەڕاستی گەلێ شادم بەوە کە بەئابڕوو و ناموسەوە دەگەڕێینەوە و ئێوەمان لە زوڵم و زۆری ڕۆمییان، لە بێ ئینساف و بێ بەزەو دوژمنی کوردان ڕزگار کرد و بەسەربەرزی بۆ وڵاتی خۆمان و چیای دمدم دەگەڕێینەوە. لە ڕێز و میوان پەروەریتان بەزیاد بێ.

هەمزە چاوەش فەرمانی بەسەرکردەیەک دا، گوتی:

– سواربن، بەڵەد وە پێش خەن.

کە لە شکر بەڕێ کەوت، میر سادقیش لەگەڵ دەستە و دایەرەکەی و سەرۆک هۆزەکانیدا سوار بوون، بەڕێیان بخەن.

کاتێ بەکووچە و کۆڵانەکانی شاردا ڕادەبردن، خەڵک هەموو هاتبوونە دەرێ و گەورە و بچووکی شار دەیانگوت:

– خوا شیری خانۆ هەمیشە هەر بڕا کا، خوا بۆ کوردانی بهێڵێ و تەمەنی درێژ کا.

بەڵام کاتێکی گەینە قەراخ شار، ژنێکی سەرەی پۆپ سپی، ڕەشپۆش هاتە پێش لەشکرەکە، گوتی:

– براینە، مەردی خوا بن ئەوانە کامیان خانۆی لەپ زێڕینە، نیشانم بدەن.
شێخ زادە گوتی: «دایە خانۆی لەپ زێڕین لێرە نییە، ئەمانە سەربازی ئەون، چت دەوێ بڵێ؟»

– لە دەورت گەڕێم، ئەمن هیچم ناوێ، تاقە کوڕێکم هەبوو، ئەویش لەم شەڕەدا ڕۆمییان کوشتیان، بەقوربانی خانۆی لەپ زێڕین بێ و خوا هێندەی دیکە دەستەڵاتی پتر کا، لە زۆر و ستەمی پادشای ڕۆمی ڕزگار کردین، خوا تەختێ ژێر و ژوور کا، گەلێ پیاوی لێ کوشتین گەلێ ژنی بێوەژن کردین، گەلێ منداڵی هەتیو و بێ باو کردین.

میر سادق و دەستە و دایەرەکەی لەشکری خانۆیان تا سەر سنوور بەڕێ

کرد و لە پاشان گەڕانەوە.

هەمزە چاوەش لە گەڕانەوەدا نەبیی دەگەڵ خۆیدا بۆ قەڵای دمدم هێنا، چونکە دەیزانی ڕۆژێک دێ بەکاریان بێ، لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

– ئەم کابرایە غایەن نییە، دەوڵەتی تورک خۆم ئاسایی، بەناوی یاساوە بۆ سەربازییان بردووە.

ئەو ئێوارەیە کە لەشکر گەییە قەڵا، شەباب سرەوتی لێ بڕا، دەستبەجێ خۆی گەیاندە کووچەی ماڵی دلبەر. ماوەیەک بوو، بەکووچەدا دەهات و دەچوو، چاوی بەدلبەر بکەوێ، بەڵام هەرچی کرد و کۆشا ئەو ئێوارەیە چاوی پێ نەکەوت و بەپەژارەوە گەڕاوە بۆ ماڵ. لە نانێی خوشکی پاڕاوە، گوتی:

– نانێ گیان، خوشکی خۆشەویستم، زۆرم هەوڵدا دلبەرم نەدیت، سبەینێ بەبیانووی شتێکەوە بچۆ بۆ ماڵیان و بەدزییەوە پێی بڵێ: «شەباب دەیەوێ بتبینێ، جا خۆی بڕیاری کوێ دەدا، لەوێ بەیەک دەگەین».

نانێ بۆ ڕۆژی دواییێ چوو بۆ ماڵی دلبەر. کاتێ دەرکەیان لێ کردەوە، چووە ژوورێ سەیری کرد هەر دایکی دلبەر و قەرەواشێکی لەوێ بوون، دلبەر لە ماڵێ نەبوو، دایکی گوتی:

– نانێ، کیژی خۆم، خێرە بەو بەیانییە؟

– خێرە، پوورە ئایشێ، بۆ بەوشی مافوور هاتووم، دایکم بەتەمایە سبەینێ دەزگەی مافوور تەونکردنێ دامەزرێنێ، بەڵام بەوشێکمان کەمە.

– جا بەوش کەماڵی چییە کچی خۆم، بەوشێ نا دوو بەوشان ببە، ئێمە ئەمساڵ مافوور تەون ناکەین. پار، دلبەر دوو مافووری تەواو کرد، بەڵام مافوور نە گاڵتە، حەزێ دەکەی بیانبینی؟

– ئەرێ وەڵڵا پوورێ، حەزێ دەکەم، بەشکو لەبەر نەخشەکانیان بگرمەوە و مافوورەکانی خۆشمان لەسەر نەخشی هینەکانی ئێوە دروست بکەین.

ئایشێ بە قەرەواشی گوت:

– ئا کچێ، هەڕۆ ئەو دوو مافوورەی کە پار دلبەر دروستی کردن لەسەر

ستێری مافووران داندراون بیانهێنه، بەڵام وریا بە لێت نەگۆڕێن، ئی دی مەهێنە، تۆ هەمیشە شتانت لێ دەگۆڕێن.

– نا، ئایشێ خان، چۆنم لێ دەگۆڕێن، هەر ئەوان دێنم.

ئایشێ لە نانێی پرسی:

– شەبابی برات شوکور بەسەلامەتی گەڕاوە؟

– بەڵێ پوورە ئایشێ، ئەرێ وەڵڵا گەڕاوە. ئەو مێرخاسی و ئازایەتییەی کە هەمزە چاوەش لەو شەڕەدا لێی دەگێڕاوە نەبووە و نەبیستراوە.

– جا، چما هەر لەم شەڕەدا، ئەدی ئەوێ ساڵێ کە شای ئێران بەسەر گوندەکانیدا داین، شەباب هێشتا توولەک بوو و بەری سمێڵی تازە بۆر بووبوو، ئەوێ ساڵێش مێرخاسییەکی مەردانەی نواند، خوا دەستی بەباڵییەوە بێ.

قەرەواش مافوورەکانی هێنا لە پێش ئایشێ خانی دانان، ئەویش ڕای خستن و نیشانی نانێی دان. نانێ کە چاوی بە نەخش و نیگاری مافوورەکان کەوت واقی وڕما. جا بەڕاستی نانێ هێشتا چاوی بەمافووری وا نایاب نەکەوتبوو، کەڵەکێوی لە کاتی بازدان و هەڵاتندا لەسەر نەخش کرابوو. نێچیروانیش چۆکی دادا بوو تیری تێ دەگرت.

نانێی خوشکی شەباب چەند ساڵێک لە شەباب منداڵتر بوو، دایکی بەجیازی کردنییەوە سەری زۆر قاڵ بوو. دەبوو مافووری جیازی بۆ دروست بکا، بەڵام وەکو ئەم مافوورانە نەبوو.

– پوورە ئایشێ، ئەم نەخشە جوانەتان لە کوێ هێناوە؟ نەخشی وا لە کن ئێمە نییە.

– کچم، ئەوە کە پار بازرگانانی بلووجستانێ بۆ شاری قەڵا هاتبوون، مافوورێکیان بەدیاری پێشکەش بەمووسای خاوەن خان کردبوو. مێردەکەم لێی خواستبووەوە هێنای، دلبەریش لەبەری گرتەوە. بەڵام کە مووسا هات مافوورەکەی بباتەوە گوتی:

– وەڵلا مافووری کچی ئێوە زۆر لە مافووری من جوانتر و ڕەنگینترە. دەبا ئی من بۆ ئێوە و ئی ئێوە بۆ من، بەڵام قایل نەبووین و نەماندایێ.

ماوەیەک نانێ خۆی بەئاخاوتنەوە خلافاند، چاوەنۆڕ بوو دلبەر بگەڕێتەوە، بیبینێ، بەڵام هەر دیار نەبوو، ئیدی نانێ بەوشەکەی هەڵگرت، دوعاخوازیی کرد و ڕۆیی. هێشتا لە کووچەی وەدەرنەکەوتبوو لە ڕێیێ لووتی بوو بەلووتی دلبەرەوە، گوتی:

– دلبەر گیان، ئەوە چەند سەعاتە، لە ماڵی ئێوە بووم، چاوەنۆڕت بووم، ئەوە بۆ کوێ چووبووی؟

– وەڵلا لە ماڵی نەنکم بووم، ئەوە چەند ڕۆژە نەخۆشە.

– خوا نەکا، نەخۆشییەکەی چییە، هاواری کوێیەتی؟

– دوور لە تۆ، دڵی دێشێ. لەمێژبوو هاواری دڵی دەکرد، بەڵام گوێی نەدەدایە، تا پەرێشانی کرد و وا لە نێو جێ کەوتووە. هەنگوینی سبەینانم بۆ برد، دەڵێن بەقسەی حەکیمی، مەگەر هەنگوینی سبەینان فریای کەوێ. لەوە زیاتر هیچ شتێکی دیکە بەکار نایە.

– باشە ئەدی چۆن بۆ کن کۆچەک گوڵتان نەبردووە. دەڵێن کەس وەکو وی مەلا شێخ قاسمی نەخۆش چا ناکاتەوە، هەر کەسێ پەنا وەبەر مەرقەدی شێخ قاسم دەبا بەساغی دەگەڕێتەوە. پار نا پێراریێ کریڤی ئێمە نەخۆش کەوت، بابم بردییە سەر مەرقەدێ شێخ قاسمی، مانگێکی پێ نەچوو چاک بووەوە و گەڕاوە ماڵی خۆی. دوو زێڕیان لە بەر مەرقەدی بۆ دانا و مەڕێکیشیان لە بۆ سەر بڕی و یەکێکیان بۆ بەرەڵڵای نێو مێگەلەکەی کرد.

– مێردی پووری من نە بەکۆچەک و نە بەشێخان قایلە، دەڵێ: «چاک و خراپ هەموو بەدەست ڕەبولعالەمینە، کۆچەک و شێخیش وەکو من بەندەی خوان، ئەمانە چییان لەگەڵ کاری خوا پێ دەکرێ. هەموویان درۆ دەکەن.»

– دلبەر دەزانی بۆچی هاتووم؟

– شەباب دوێنێ شەوێ کە گەڕاوە، هەر ئەوێ ئێوارێ لەم کووچەیەدا زۆری

لەسەر ئەم دووکانە خۆ خلافاند، کە بتبینێ، بەڵام تا تاریکیش داهات هەر نەیبینیت، ئەمنیش ئەمڕۆ بەبیانووی بەوش خواستنەوە سەرێکی ماڵەوەتانم دا بتبینم.

کاتێ کە نانێ باسی شەبابی کرد، دلبەر ڕەنگی سوور هەڵگەڕا و گەشاوە و بەنیوە پێکەنینێکەوە زاری کردەوە ددانەکانی وەکو مرواریی سپی بەدیارکەوت، بەتۆ با نە کردبات، نەخواردبات هەر سەیری سای گەردنی دلبەرت کردبا.

بە لەرزەی خرخاڵەکانیدا وا دیار بوو کە دڵی بەتەپە تەپ و هاتوچۆ کەوت، دەستی برد ئاوێنەیەکی لەبەر پشتێنی دەرێنا و سەیرێکی سەر و ڕوخساری خۆی کرد، گوتی:

– من سبەینێ بەبیانووی کوڵەوە دەچمە ئەو گەلییە، کەسی لێ نییە، هەر خۆم و قەرەواشەکەم دەچین. با بێ بۆ وێندەرێ.

– دلبەر، ئەو دەیگوت دەبێ ئەمڕۆ بیبینم، جا چۆن دەتوانێ تا سبەینێ ئۆقرە بگرێ؟

– جا ئەمڕۆ چم پێ دەکرێ و چ بکەم؟

دلبەر نەختێ بیری کردەوە، گوتی:

– دە کەواتا، دوای نیوەڕۆ دیسان بەبیانووی سەردانی پوورمەوە بۆ گەڕەکی وان دەچم. با بێ بۆ ئەوێ. ئەوێ چۆڵە و کەسی لێ نییە، لەوێ بەیەک دەگەین.

نانێ گوتی: باشە وا دەچم پێی دەڵێم، پاش نیوەڕۆ بۆ ئەوێ بێ. نانێ لێی دا ڕۆیی.

هێشتا نیوەڕۆ نەبووبوو شەباب خۆی گەیاندە گەڕەکی قەلا چیای کە ماڵی پووری دلبەری لێ بوو، ماوەیەک هاتوچۆی کرد و ئەملا و ئەولا گەڕا، تا دەنگی بانگی مەلا ڕەشید لە منارەی مزگەوتەوە بڵند بووەوە، ئیدی بۆی بەدیارکەوت، کە وەختی نوێژ و خواناسینێیە، بەڵام دلبەر هێشتا هەر دیار نەبوو. شەباب

دەتگوت سەرمای زستانی بردوویە، هەر هەڵدەلەرزی و چۆقە چۆقی ددانی ڕۆژە ڕێیەک دەڕۆیی. پاش نیوەڕوانێکی درەنگ بوو، لە نکاو دلبەر لەسەر سیلەی کووچەوە بەدیارکەوت. شەباب داپەڕی چووە پێشی، دلبەری گرت لە باوەشی کا، بەڵام دلبەر نەختێ پێی هەڵبڕی و سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد، گوتی؛ شەباب کوڕە تۆ چەند چاو قایمی، لەوە ناپرینگێیتەوە یەکێ بمانبینێ. لاچۆ.

– دلبەر گیان، چۆن چاوقایم نەبم، ئەمە ماوەیەکی دوورودرێژە لێک دابڕاوین و لەو ساوە، ئەوە یەکەم جارە چاومان بەیەکدی دەکەوێ.

– ئاخر تۆ بیر ناکەیەوە، خەڵک بمانبینێ، شەرمێ ناکەی، لەوە ناترسی دەستبەجێ نێومان لە نێو خەڵکدا بزڕێ و بۆسۆ و بەدناو ببین و بڵێن: «دڵبەری کچی مەخسوود بێ نامووسە و هەمیشە لە کووچە و کۆڵاناندا لە پیاوان دەگەڕێ و ماچی دەکەن».

وەرە با بچین بۆ سەر ئەو گوێ ئاو و ڕووبارانەی دەوروبەری شار لەوێ چاتر یەکدی دەبینین.

– کێهە گوێ ئاو و ڕووبار؟

– هەی، ئەی تۆ چۆن شارستانییەکی کە باش شارەزای شارەکەی خۆت نەبی؟

– وەڵڵا، نازانم کام گوێ ئاو و چەم دەڵێی؟

– ئەو بازرگانانەی کە بۆ شارەکەمان دێن و بەبار کووتاڵی بۆ دێنن، وشترەکانیان بەڕۆژ لە دارستانەکاندا دەلەوەڕێنن، کە شەو داهات دێن، تا بەیانی ڕۆژ دەبێتەوە لەوێ دەنوون، لە پاشان وشترەوانەکان دیسان وشترەکانیان بۆ دارستانەکان دەبەنەوە بلەوەڕێن. من بۆ ئەو جێگەیە دەڕۆم، جا تۆش دوا بەدوای من بۆ ئەوێ وەرە لەوێ کەس نامانبینێ.

کاتێ هەردووکیان گەیشتنە وێ، شەباب دیسان ویستی دلبەر لە باوەش کا، دلبەر ئەمجارەش هەر نەیهێشت، گوتی:

– پەلە مەکە، ئەمەش وەختی خۆی دێ. تۆ بەباوت بڵێ کەی بۆ خوازبێنیم دێ. باوکم دەڵێ: تا نانێ بە مێرد نەدەم خوازبێنیی کچی مەخسوود ناکەم. ئێمە گفتمان لە دەم مەخسوود وەرگرتووە و بڕاوەتەوە، تا کارێک جێبەجێ نەکەین دەست بە کارێکی دیکە ناکەین.

– حەی، جا نانێ کەی بەمێرد دەدەن؟

– دایکم پێی گوتم: کوڕم ئەم پایزە وا بڕیارە بێن و شیربایی بدەن، نانێ ببەن. بەڵام باوکت ناقایلە و دەڵێ نا، من چۆن دەتوانم بەم زستانە ئەم پەزە شیربایییانە بەخێوکەم. با شیربایییەکە بکەوێتە بەهارێ و ئەوسا بووکی خۆیان بگوێزنەوە.

دلبەر هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا، گوتی:

– کەوابوو ئەمە ساڵێکی تریش دەخایەنێ.

– دە کەوایە با هەر ئێستا ڕەدووت خەم و بۆ ماڵی خاڵەت بەرم، تۆ خۆت دەزانی خاڵەکانم هەموو قارەمان و مێرخاسن.

– نا، نا، تۆ چۆن شتی وا دەڵێی، ئێمە باوکمان دۆستی یەکن، شتی وا بۆ ئێمە ناڕەوا و دزێوە، ئەی نازانی خورشیدی بازاڕباشی چەند جارێ خوازبێنیی لە باوکم کرد و چەندین نیشانی بەنرخی بۆ نارد کەچی باوکم هەر قایل نەبوو؛ چونکە بەڵێنی بەباوکت دابوو...

کاتێ دلبەر بەم جۆرە ئامۆژگاریی شەبابی دەکرد، شەباب سەیری دلبەری دەکرد، بەرچاوکەیەکی زێڕی ڕۆمی بەسەر ناوچەوانیدا بەردابووەوە، فێستەکەی سەری هەمووی دراوی زێو بوون، ڕیشووی ڕەش کەوتبووە سەر ڕوخساری و بەلای ڕاستیدا شۆڕ بووبووەوە بەرچەنەکەی حەڵەبی بوو، بەلاجانگی ڕاست و چەپیدا توند کرابوو و دەهات دەکەوتە سەر خوبابی خاڵ خاڵی بەفرینی. لووتەوانەیەکی بچووکی نقێمداری بەغدایی بەلووتەوە بوو. شرکەکەی تا بەر پشتێنی شۆڕ بووبووەوە، متوموورووی ملی لەبەر هەتاوەکە دەبریقاوە. گوارەکانی گوێی بەزێڕ گۆپک کرابوون، ئەنگوستیلەیەکی قاش

سوور له پەنجەی دەستی چەپیدا بوو. دلبەر چاو و برۆی خۆی قەت بەکلی سوبحانی نەدەڕشت، چونکە قژ و چاو و برۆی هێندە ڕەش و جوان بوون، نەناس بیدیبا سەری لێ سوڕدەما و دەحەپەسا.

کە قسەی دەکرد لێوە ئاڵە تەنکەکانی بەحاڵ دەبزووتن و پیاو خواخوای بوو سەیری بکا. لە قسەکردندا جارجار چاوی لێک دەنا و دیسان دەیکردەوە، لووتی کەمێ قولینگانە هەڵکەوتبوو، دەتگوت دەنووکی قولینگە.. دیسان شەباب پەلاماری دلبەری دا ماچی بکا، بەڵام دلبەر خۆی ڕاپسکاند، خۆی بەدەستەوە نەدا و هەڵات. شەباب وەدووی کەوت. پاشان دلبەر وەستا، کاتێ لێی نێزیک بووەوە دلبەر گوتی:

– ئەگەر دەتەوێ هەمیشە یەکتر ببینین، ئیدی وەدووم، مەکەوە، ئەگەر جارێکی دیکەم وەدووکەوی سوێندم بە (داری مراز)ێ ئیتر جارێکی دی وەدووت ناکەوم بەڵام توخوا لێم گەڕێ با تێرت ماچ کەم.

– شەباب، بەڕاستی تۆ زۆر چاو قایمی و دەڵێی کەمێ ئەقڵیشت سووکە. کوڕە کەسێ لێرە بمانبینێ داخوا چ قسە و قسەڵۆکێکم وەدووخا، دەزانی؟

– باشە ئەی لە کاتی مازووچنیندا بۆچی باکت نەبوو.

– لە کاتی مازووچنیندا کەس لێمان ناگرێ و بەشوورەیی دانادرێ، چونکە بووە بەدەستووری هەموو لایەک. هەر بۆیەش جحێڵ و کوڕ و کاڵان بە سەربەستی بۆ مازووچنین دەچن لەوێ بەیەک بگرە. جگە لەوەش خۆ مازووچنین وەنەبێ تەنیا هەر کوڕێک و کچێک، بەڵکو سەدان کوڕ و کچی لێ کۆدەبنەوە و کەس لە کەس ناگرێ، نەک وەکو من و تۆ، ئێستا کەسێ چاوی لێمان بێ، ئاخۆ چیمان وەدووخا.

دلبەر ئەم قسانەی کرد و لێی دا ڕۆیی.

شەباب قەدەرێ لە بەژن و باڵای ڕوانی، تا لەبەرچاوی ون بوو. ئینجا بیری کردەوە، گوتی:

– قسەکانی دلبەر هەموو ڕاستن، بەڕاستی کەسێ چاوی لێمان بێ، ئاخۆ

چ ناو و ناتۆرەیەکی دزێو و پیسمان وەدوو خا، ئەوە بەش بەحاڵی من، کوڕم و قەی ناکا بەڵام بۆ ئەو، کچە و دەستە پاچەیە. هەندێکی تر وەستا، ئەویش لێی دا چوو بەڵام بەڕێگایەکی تردا ڕۆیشت.

***



بەشی هەشتەم

# قولیخان

پایز بوو، کۆچەر و ڕەوەندان، زوو لە زۆزان و کوێستانی سەر چیا بڵندەکان و ڕەشبەڵەکە بەفرەکانەوە بۆ گوندەکانیان گەڕابوونەوە و چووبوونە ئارانان تا بۆ پەزەکانیان ئاخەڵی زستان دروست کەن. هەندێ هۆڵی تازەیان بۆ پەزی نەخۆش دروست دەکرد، هەندێ جێگای حەسانەوەیان بۆ شوانان بە چەپەر و تەیمان دروست دەکرد، هەندێکیش کۆنە ئولکیان بۆ ئاژەڵ نوێ دەکردەوە تا سارد و سەرما و با و بۆرانی زستان زیانیان پێ نەگەیەنێ. هەندێ کۆزی بەرخیان پاک دەکردەوە، هەندێ هی نوێیان دروست دەکرد، بۆ ئەوەی کە بەهار هات و پەز بەزاوزێ کەوتن جێگای گەرم بۆ کار و بەرخی ساوا ئامادە بێ.

ئەو دەشتانە قەت بەفری لێ نابارێ، ئەگەر جار جار بشبارێ، دەستبەجێ دەتوێتەوە و لە پایزەوە تا بەهارێ پەز هەموو وا دەلەوەڕێ ئیدی دەڵێی گیا ناخۆن و هەموو ڕۆژێ تێرن؛ چونکە بەهارێ کە بەفر دەتوایەوە لە لاپاڵی چیاکاندا شینایی تازە دەڕوا و گەرماش لەو دەشتە هەڵی دەقرچاندن، ئیتر پەز ناتوانێ بلەوەڕێ، ئەوسا کورد پەزەکانیان بەرە بەرە بۆ نێزیک بەفر دەبەن و بەرەو جێگای فێنک و لەوەڕێ خۆش دەڕۆن. ئەو ئارانە لە بەهارەوە تاوەکو پایز هەروا بەچۆڵی دەمێنێتەوە و پێی ئاژەڵێکی تێ ناکەوێ، تا پایز لەوەڕی زۆری لێ شین دەبێ. سەردەمێ لەسەر ئەو ئاران و زۆزانانە گەلێ شەڕ و شۆڕ

دەقــەومــا ، تــەنانــەت پیــاویشــیــان تێــدا دەکــوژران و خـــوێنێکی زۆر دەڕژا .
هــەرکــەسێ پیــاوی زۆر بەدەســتــەڵات با لەوەڕگــە و پاوان و زۆزانی چاک ئەو
داگیـری دەکرد، ئەمـەش لەو سـەردەمـەدا بوو کـە شـای ئێران دەسـتی بەسـەر
ئێرەدا دەڕۆیشت. بەڵام لەوەتەی وڵات لە ژێر دەستی خاندا بوو هێشتا شتی
وا نەقاومابوو و نەشدەقەوما . ڕاستە، جاروبارێ قورتمی یەکیان دەگرت، بەڵام
نەک وەکـو جـاران سـەربشکێنن، مل بپـەڕێنن، یا پیـاو بکوژن و خـوێن بڕێژن.
شتـی وانەبـوو. خانۆ ڕێگای نەدەدا کەس دەست بۆ کەس ببا . کە ناو بەناویش
یەخەی یەکیان دەگرت، خانۆ زۆری پێ تێک دەچوو و پێی دەگوتن: «بەقوربان،
خـۆ ئێـوەش نـەبوون بە شـای ئێـرانێ، یا پادشـای ڕۆم بـەزۆری زەوی لە یەک
داگیر بکەن. من شتی وا قەبووڵ ناکـەم، شوکور زەوی زۆرە، ئێوە هـەر ئاگاتان
لە خۆتان بێ شای ئێران و پادشای ڕۆم لێتان داگیر نەکا . ئەوا پێتـان دەڵێم
هـەر کامێکتان دانەنیشێ لە نێو عەشیرەتی دەردەکەم و بۆ کوێ دەچێ بچێ.
خۆتان زۆر چاک دەزانن، هـەر کوردێ لە عەشیـرەت یا لە خێڵـەکەی دەرکرێ،
ئیتر جارێکی تر هیچ عـەشیرەت و خـێڵـێکی دیکەی کوردەواری قـوبووڵی ناکا ،
ئەوا پێتان دەڵێم: هەرکەسێ ڕەحەت دانەنیشێ خۆی پەشێمان دەبێتەوە.»

جا بەڕاستـی، هـەر کوردێ لە عـەشیـرەت دەرکـرێ ئیـتر عـەشیـرەتێکی تر
نایگرێتە خۆی.

هـەمـزە چاوەش پاش ئەوەی لـە شـەمـدینان گـەڕابووەوە جـحـێڵـەکـانی کـۆ
دەکردەوە و مـەشـقی سـەربازیی پێ دەکردن. خـۆی و جـەوزۆ چووبوونە ناوچە
دوورەکانـی قەڵا، دەسـتە دەسـتە جحێڵان ڕێک بـخـەن و فێرە مەشـقیـان بکەن.
ئەو لاوانەی کـە لە پێـشـدا لە کن هـەمـزە چاوەش فـێـرە مـەشق بـووبوون و لێ
بووبوونەوە، جحێڵانی قەزاکانیان مەشق دەدا .

جگە لەمـە ئـەو کـوڕە کوردەی کە لە شـەڕی شـەمدیناندا بـەدیل گیـرابوو و
ناوی نەبی بوو دەیاننارده ناوچەکان تا بزانێ ئەو لاوانە چۆن جحێڵان مـەشق
دەدەن و هـەر کوێیەک پێویستی بەمەشق با چەند ڕۆژێکی لێ دەماوە و خەڵکی
فـێـر دەکـرد و پاشـان دەگـەڕاوە قـەڵا، چونکە ئەو خـۆشی لـە نێـو سـەربازی

ڕۆمیدا فێره مەشق بووبوو و گەیشتبووه پلەی ئۆنباشی و سەربازی ناشیی فێره مەشق دەکرد.

ڕۆژێکیان خانۆ له ناوچەیەک تووشی نەبی هات، جحێلانی مەشق دەدا. مەشقێکی زۆر دڵسۆزانەی دەدان و خانۆ زۆری پێ خۆش بوو، گازی کرده پەنایەکەوه، گوتی:

– کوڕی خۆم، تۆ دەزانی هەموو کوردستان سوێند بەسەری هەمزه چاوەش دەخۆن، چونکه بۆ ئەوه هاتووه نەتەوه و نیشتمانی باو و باپیرانی بپارێزێ.

نەبی له پێش خانۆ ڕاوەستابوو، گوێی له ورد و درشتی ئامۆژگارییەکانی خانۆ بوو، له پاشان گوتی:

– گەورەم، ئەمن خەڵکی چیای مووسڵم، ڕاستت دەوێ ئەگەر گەوره کوردەکانی کنه مەش هەموو وەکو جەنابت بان و سوێندیان بەسەری گەلێ پیاوی وەکو ئێوه و هەمزه چاوەش خواردبا، ئێمەش وا دیل و یەخسیر نەدەبووین، بەڵام چ بڵێین، خوا ماڵی غایەن و خۆفرۆشان خرا کا.

خانۆ تێ گەیشت که ئەم کوڕه نا تێگەیشتوو نییه و وریایه، پرسی:

– چاکه، ئەدی چۆنت سەربازیی ڕۆمییان دەکرد؟

– چتان لێ وەشێرم، خوا خۆی ئاگاداره، بەر ڕەشبگر کەوتم، بەڵام پاشان هەڵاتم و چوومه دەشتی بشێریان، هەر هێندەم زانی قایمقامی ڕۆمی گرتمی و دیسان تەسلیمی کردم، نۆڕیم ئیدی بێ سووده، مامەوه تا بەدیل گیرام. بەڵام زۆر شادم بەوەی که پارێزگاریی نەتەوەکەی خۆم دەکەم.

– ئافەرین کوڕی خۆم. مادام حەز بەخزمەتی نەتەوەکەی خۆت دەکەی، خوا دەستی بەباڵتەوه بێ.

ئەوێساڵێ خەڵک نەحەسابووەوه، له نکاو زستانێ هات و سەرما و سۆڵه دەستی پێ کرد. نەختێ باران باری، بەڵام له پاشان بەفرێکی زۆر باری و شوێن نەما تێی نەکا و هەر نەشدەچووەوه.

گەلێ ساڵ ئەو چیایه تووشی زستانی وا سەخت و تووش دەهات.

هاوینی ڕابردوو دەغـڵـودانێکی چاک و مـشـە لە نێـو عـێلی بەرۆدارێ هەڵکەوتبوو. هەرکەسە خەرمانی خۆی کوتابوو و دان و زمێری خۆی لە چاڵ کـردبوو، زەخـیـرە و باراشی زسـتـانی هاڕیبـوو و کـەندوو و تێـڕیان لێ پڕ کردبوو.

پاش شـەڕی شـەمـدینانێ پادشـای ڕۆم بۆ شـای ئێـرانێ نووسی: «شـا عـەباس ئەتوو چ دەکـەی؟ ئەدی ئێـمـە کـوردسـتـانمان لە نێـوان خـۆمـاندا نەبەشـییەوە و بڕیارمـان نەدا کە ئێوە لە کن خۆتانەوە لێ دەن و ئێـمـەش لە قۆڵی خۆمانەوە، بەڵکە ئەم خێر و بەرەکەتە لە چەنگ ئەم بیانییانە دەرێنین؟ ئەوا من لەسـەر ئەوەی کـە بڕیارمـان دابوو لەشکری خـۆم هەناردە سـەر شەمدینان، بەڵام دەڵێن خانۆی لەپ زێڕین لە وڵاتی تۆدایە و لە چیای دمدمە، لەشکری کۆمـەکی میـری شـەمـدینانی کـردووە، نەیهـێـشت مـیـرنشـینەکـە بڕووخێنم. کوا تۆ چ دەکەی؟ بۆچی پەیمانەکە بەجێ ناهێنی؟»

شـا عـەباس کـە کـاغـەزی پادشـای ڕۆمی خـوێندەوە، تووڕە بوو، گـوتییـە خولامان:

– خێرا، قولی خانم بۆ بانگ کەن.

خـولامـان ڕاپەڕین، چوون، قـولی خـانیـان بانگ کـرد. قـولی خـان کـە وەژوورکـەوت نواڕیی شـا دیسـان فـێی لێ هـاتووە، سێ جـاران ئیکلامـی بۆ کێشا، گوتی:

– شا پایەدار بێ ئامادەم، چ دەفەرموون؟

شا عەباس بە بابنۆکەری گوت:

ئەو کاغەزەی پادشای ڕۆمیی بدەنێ، با بیخوێنێتەوە.

قولی خان کە کاغەزەکەی خوێندەوە، واقی وڕما و سەری بادا، گوتی:

– شا خۆش و پایەدار بێ، ئەوە چەند ساڵە نە خـەرج و باج و بێش داین و سـەرانە دەدا و نە بێگار و سوخرەکێشیش قـوبووڵ دەکا. فـەرمـانتـان چییە بەسـەری دا بدەم، هەر وێسـتـا بچم قـەڵاکەی وێران کـەم و بەدیلـی بگرم و بۆ

کوردەکانی دیکەشی بکەم بەپەندی زەمانە و ترسێکی وایان باوێمە دڵەوە ئیدی ورد و درشتیان چۆکانت لەبەر دادەن و ببنە دەستدات هەتا هەتایە.

شا عەباس پێ کەنی، گوتی:

– بەئیمامی عەلی قسەکانت ڕاست و بەجێن، دە تا زووە خۆت کۆکەوە بچۆ بەسەریدا بدە.

ڕاستە، قولی خان ئەم قسانەی کرد، بەڵام، پاش ئەوەی چووە دەرێ، پەشیمان بووەوە، نەچوو. نیزیکەی مانگێ خۆی پاش خست، تا ڕۆژێکیان شا عەباس دیسان بانگی کرد، بەتەوسەوە پێی گوت:

– کوا، خانی کوردانت بەدیل گرت؟ دە بیهێنە، بزانم گورگی کێهە چیایە. ئەدی قەڵاکەیت چ لێ کرد؟

قولی خان کە ئەم قسانە شای بیست، لە ترسان تەزوو بەلەشیدا هات و لەرزی، چونکە بۆی وەدەرکەوت کە شا عەباس گاڵتەی پێ دەکا و ئەم قسانەی بەتەوس و تیزەوە پێ دەڵێ. قولی خان زۆر چاک دەیزانی کە شا عەباس ئەم جۆرە قسانە بەخۆڕایی ناکا و سەری زۆر کەسی پەڕاندووە و ملی زۆری دیکەشی بە پەتی سێدارەوە کردووە. ئیدی دەستبەجێ بەرچاوی تاریک بوو، بەڵام گورجێ فریای خۆی کەوت، گوتی:

– شا پایەدار بی، ئەو دەمی ئەو چیایانە هەموو بەفر بوو، بەڵام وێستا ئامادەم سبەینێ زوو بەڕێ کەوم.

شا عەباس نەختێ ساردبووەوە، گوتی:

– دە کەوایە، سبەینێ زوو بەڕێ کەوە. بڕۆ قەڵاکە خاپوور و وێران کە و خانی کوردانیش یا خۆیم بە دیل، یا سەریم بۆ بێنە. بەڵام تۆش وەکو سلێمان خان نەکەی، کە ناردم، پاش بەینێ گەڕاوە، گوتی:

– خانی کورد دەڵێ: «پارچە زەوییەکمان لەسەر ئەو چیا ڕووتانە لە بۆ خۆمان ئاوەدان کردووەتەوە، چما شا عەباس عاردی کەمە؟ ئێمە هیچ زبانێکمان بۆی نییە». ئەویش ڕێ و ڕاست گەڕاوە و هیچی بەهیچ نەکرد.

ئەگەر ئەو دەمی کون و کەلێنی قەڵای بۆ پشکنیبایین و ڕێگای هەڵمەتبردن و داگیرکردنی بۆ کێشابایین، ئێستا لەمێژبوو خانمان لەناو بردبوو؛ چونکە ئەوسا قەڵاکەی هێشتا بەتەواوی دروست نەکردبوو، هێزیشی هێندە پەرەی نەستاندبوو. دەڵێن ئێستا لە هەر چوار کەنارەوە کوردی تێ ورووکاوە و زۆر بەهێز بووە. نابینی چ کەڵەوەکێشی و سەرکێشییەک دەکا؟ زۆر چاک ڕێگای لێ گرتووین و کێ دەوێرێ پێ باوێتە کوردستانەوە.

قولی خان دیسان ئیکلامی بۆ کێشا ڕۆیی، خۆی ئامادەکرد و بۆ سبەینێ زوو هێشتا خەڵکی تاران لە پرخەی خەویدا بوون دوو هەزار سەربازی وەدووی خۆی دا و بەرەو قەڵای دمدم بەڕێ کەوت.

چەندین ڕۆژ بوو قولی خان و لەشکرەکەی بەڕێوە بوون، سەرباز هەموو پڕچەک: بە شیر و مەتاڵ و تیر و کەوانەوە دەجمین. مەتاڵەکانیان وەکو تەشیی خڕ وابوون، بەڵام بێ کەوی بوون و جەنگاوەر کە خۆی پێ دەپاراست هێند گەورەبوون، دەتگوت خۆی لە پشت دەرکەیەکەوە دەشارێتەوە. ئیدی بەو ڕەنگە لە هەموو تیر و شیرێکی دەپاراست.

نیوەڕۆ بوو، کاتێکی گەینە چیاکان، ئیدی فێنکی کرد، شنە و کزەبای سارد و خۆش دەستی پێ کرد، ئیدی لە دەشتی ئێرانێ دەرچوو بوون، بەشوێنێکدا دەڕۆیشتن ناو بەناو دەشت و ناو بەناو زستانەوار و ئارانی کوردان و ناو بەناو چیا و نەواڵ و گەلی بوون.

کوردەکان کە چاویان بەم سەرباز و قۆشەنە کەوت، هەموو ڕەنگ پەڕیو وەکو نەخۆشی تێ لێهاتوو، بەپاپاخی قووچ و درێژەوە و دەست بەمەتاڵی گەورە و هەراوەوە، دەستبەجێ ناسییانەوە کە سەربازی ئێرانن، بەڵام بۆ کوێ دەچوون، کەس نەیدەزانی. پیاوێکی بە شان و شکۆ لە پێش لەشکرەوە دەڕۆیی، هێندەی خەنە و ڕەنگی لە ڕدێنی دابوو دەموچاوی ڕەش دەچووەوە.

ڕدێنی هێندە درێژ بوو تا سەر سینگی هاتبوو و گەیشتبووە قایشی پشتی. پاپاخەکەی سەری وەکو پاپاخی سەربازەکانی دی نەبوو، کوریشک و لۆچ و

لۆکـانـی تا بڵـێی جـوان و کـاو بوو، دەتگوت زێڕە و لەبەر تیـشکی هـەتاوێ دەچریسکێتەوە، شیرێکی بەشانەوە بوو، دوو پشتووشی بەبەر پشتێنەوە بوو، مشتووکانیـان سپی دەچوونەوە. وەکو سـەربازەکانی دیکە لەڕ و لاواز نەبوو، دەمـــــوچاوی چرچ و لۆچاوی بوو، ورگن بوو، سکی دەتگوت مـــــەشکەی هەڵمـساوە. کـەمێ بەسـەر زینی ئـەسپـەکـەیەوە سـەنگەلابوو. لەوە دەچوو سـەرلەشکر بێ. یەکی دی بەتەکیـیـەوە بوو نـەختێ لەو لاوتر و لاوازتر بوو، چاوی بچـووک بوو. کـاتێ لە پێشێی دەنۆڕی دەستی بە هەنیـیەوە دەگرت، ئەوجا تەماشای دەکرد دەتگوت سێبەر بۆ چاوی دەکا، کەچی نە هەتاو بوو و نە هیچ. لەشکر لە گـوژمی خـوارێ شـۆڕ بووەوە و نەبووەوە تووشی مـێگەل و ڕانەمەڕی کوردان هات. سەرلەشکر فەرمانی دا، سەرباز چوون مێگەلیان کۆ کردەوە، بیانبەن، سەگی دڕ و گورێزی شوانان نەیانکردە نامەردی، لە هەموو لاڕا گەمارۆیان دان، بەڵام سـەرباز دەستیان لێ کردنەوە کوشتنیان. شـوان تووڕە بوون، گوتیان:

– ئەو پەزانە بۆ دەبەن؟ نازانن هی ئێمەن و بێ خاوەن نین؟.

سـەربازەکانی هیچ گوێیان نەدانێ و پەزیان برد. شـوانێک ڕاپەڕی چوو لە کن سەرلەشکری شکایەتی کرد، گوتی:

– سەربازەکانت پەزەکانم دەبەن.

سەرلەشکر گوتی:

– پەزیش هی مەیە و زەویش هی مەیە.

شوان کە زانیی سەرلەشکر شکایەتی ناپرسێ، دەستی دا گۆچانێ، چوو پێشی لە پەزان گرت، نەیهێشت پەزان ببەن، قولی خان، فەرمانی دا: بڕۆن ئەو سەگە بکوژن، بنۆڕە، بنۆڕە چۆن پێشی پەزەکانی گرتووە.

دوو سـەربازی لێ ڕاپەڕین شوانیان وەبەر شیران دا و هەلاهەلایان کرد و پەزیان تالان کرد.

قولی خان هەندێکی دی بە لەشکرەوە چووە پێشتر، نواڕی ئەو گەلی و دۆڵ

و دەرانە لە قەرەباڵغییان ژاوەیان دێ، پڕن لە کورد و ئاژەڵ. فەرمانی دا:

– خێرا، ئەو پەزانە کۆکەنەوە، ئەوانە ئازووخەی لەشکرن.

خاوەن پەز و شوانان پەزیان نەدا، لەگەڵ سەربازی ئێرانیدا تێک چرژان، بوو بەشەڕ و هەڵلا.

بەڵام کوردەکان لە بەرانبەر ئەو لەشکرە گرانەدا چییان پێ دەکرا. قولی خان فەرمانی دا:

– هەر کەسێ پەزی نەدا، بێ سێ و دوو لێکردن بیکوژن.

زۆر کورد کوژران. دەنگی شەڕ بەنێو ئاران و زستانەوارەکاندا پەرت و بڵاو بووەوە. هەندێ هاواریان وەبەر خانۆ برد: کە لەشکرێکی گەورە و گرانی ئێران بەرەو قەڵا دێ و هەرچی تووش دێ تاڵان و بڕۆی دەکا و دەیبا، هەر کەسێکیشی وەگیر دەکەوێ دەیکوژێ. خانۆ بانگی جەوزۆی کرد، گوتی:

– دیسان هاواریان وەبەر هێناوم کە لەشکرێکی گەورە و گرانی ئێران بەرەو قەڵایێ دێ. گورجێ تا لەشکر کۆ دەکەیەوە، جارێ چەند سوارێ بۆ ئارانان بنێرە، بزانن چ باسە؟ شتۆ لەشکرە، بەکێهە ڕێیدا دەڕوا؟ زوو خەبەرمان بۆ بێنن. نابێ بهێڵین لە دەشت بەرەوژوورتر بێن و پێ باوێنە نێو چیاکانمانەوە.

خانۆ هەرکە لە دیوەخانێ وەدەرکەوت، غەڵبە غەڵبی جحێڵان لە پشت شوورەی قەڵاڕا دەهات، پێ دەکەنین، خانۆ بەرەو غەڵبەغەڵبێ چوو، کە لە شوورە سەرکەوت، لە قوللەیەکەوە تەماشای کرد، لە بەستی پشت شوورەکەدا جحێڵ سەرگەرمی مەشقێن، جووت جووت یەکدی وەبەر جریدان دەدەن و ڕکێفان لێک دەکەن و شیربازی دەکەن و زرینگەی شیر و مەتاڵانە، دەتگوت مەشق نییە، شەڕی ڕاستەقینەیە و هەر ئەوە نییە یەکدی ناکوژن، جار جاریش یەکدییان وەبەر شیران دەدا و بە مەتاڵان خۆیان دەپاراست و شیریان وێ نەدەکەوت. هەمزە چاوەشیش لە دوورەوە ڕاوەستابوو فەرمانی دەدا، هەندێ جاریش کەسانێکی بەنێوی خۆیانەوە گاس دەکرد:

– کەلەش، ڕۆستەم، وا نابێ.

خانۆ کە چاوی بەو مەشقە کەوت، جحێلان وا بە دڵ و بە گیان فێری دەبن، زۆری پێ خۆش بوو و لە دڵی خۆیدا گوتی:

– پێم وایە هەموو دەستتان دەخورێ و خوێنیشتان هێندە گەرمە هەر وەختە بکوڵێ و خوا خوای ئەوەتانە هەر ئێستا بچنە شەڕێ و هەریەکە چاوەنۆڕی وەیە کەنگێ گەڕناسی و بوێریی خۆی ئەزموون کا. خوا کارێکی وات کردبا لەو ڕۆژانەدا تووشی دوژمن هاتباین و هەنگینێ چاوم بەمێرخاسیی لاوی کورد کەوتبا.

خانۆ بەدەم ئەم بیرکردنانەوە لێی ڕاکشا و نوست. ئەوێ ڕۆژێ درەنگ وەخەبەر هات، تیشکی هەتاو لە پەنجەرەکانەوە کەوتبووە سەر نوێنەکانی، ژنەکەی مسینە و دەستشۆری هێنا، ئاوی بەدەستیدا کرد، گوتی: لە سبەینێوە سێ سوار لە دەرەوە هاتوون چاوەنۆڕتن، خانۆ لە ژنەکەی تووڕە بوو، گوتی:

– جا بۆچ زووت وەخەبەر نەهێنام، دە زوو ئاوم بەدەستیدا کە.

– جا گوناهی من چییە، تۆ بۆ خۆت کەم دەنووی، شەو و ڕۆژ سەرقاڵی و هەر بەسەر پێوەی، ماڵ ئاوەدان.

– کوا سوارەکان لە کوێن؟

– لە دیوەخانن، لە کن سەرۆک دیوەخانن.

خانۆ گورجێ سەر و چاوی سڕییەوە، چوو بۆ دیوەخان، کە گەیشتە وێندەرێ، هەموو لەبەری هەڵستان، خانۆ سڵاوی کرد، گوتی:

– سەلامون عەلەیکوم.

– عەلەیکومە سەلام.

– ئێوە لەمێژە هاتوون؟

– قوربان، ماوەیەک دەبێ هاتووین.

– ڕاستتان دەوێ خەتای گەورێ بوو، زوو وەخەبەری نەهێنام.

– دە بڵێن، دەی چتان دیت، هەستتان بە چ کرد؟

– قوربان، کەس نازانێ ژمارەیان چەندە، بەڵام وێ دەچێ چەند هەزارێک بن، هەندێکیان بەڕێوەن و هەندێکیان لە دۆڵ و دەران و هەندێکیشیان لە کن کانی ترشێ و شوێنانی دیکەن. کە چاویان پێمان کەوت، وەدوومان کەوتن، بەڵام ئەسپەکانیان وەکو هینەکانی ئێمە توندوتۆڵ نەبوون، نەمانگەیشتنێ.

– هەموو سوارەن، یا پیادەشن؟

– ئێمە هەر سوارەمان دیتن، پیادەمان نەدیت، وا دیارە هەموو سوارەن؟ چونکە ئێمە چاومان بەکوردی قشلاخەکان کەوت، دەیانگوت: کوردی گوندەکانی خوارێمان شەڕ دەکەن، بەڵام چییان پێ دەکرێ، لەشکرەکە زۆرە و لە کێشەدا نییە، دوو بەشی قشلاخەکانیان تاڵان و بڕۆ کردووە و ئەوەی ماویشن ئەوانەن کە هەڵاتوون و ڕووی لە چیا و جێگەی تووش و سەخت و ئاسێ کردووە.

خانۆ سەیرێکی مەجلیسەکەی کرد، گوتی:

– ئێوە چ دەڵێن؟ شا عەباس لەشکری لێ کردووین. پیاومان دەکوژێ، تاڵان و بڕۆمان دەکا.

هەموو کڕبوون، ورتە لە دەمی کەسەوە نەهات، ئەوجا جەلال مەزنی هۆزی ماسیخۆران گوتی:

– با لێیان گەڕێین، تا دەگەنە نێو چیاکان، پاشان تێیان دەکەوین، قەڵاچۆیان دەکەین، خانۆ قسەی جەلالی پێ خۆش نەبوو.

ڕاستە جەلال پیاوێکی دەوڵەمەند بوو و لەبەر دەوڵەمەندییەکەی بووبوو بەمەزنی خێڵەکەی، بەڵام نە پیاوێکی ئازا و مێرخاس بوو و نە شەڕیشی پێ دەکرا. هەمیشە خۆی لە شەڕێ دەدزییەوە و زەغەلیی دەکرد. خانۆش لەمێژەوە هەستی بەوە کردبوو و هیچ دەنگی لەگەڵ نەدەکرد، لەبەروەی هیچ گومانێکی لەوەدا نەبوو کە بۆ ڕۆژی تەنگانە بەکار نایە و لە شەڕدا مەردانە

خۆی ناگرێ.

لە پاشان پۆستۆ ناوێکی سەر بەهۆزی مالەرەند هەڵی دایە، گوتی:

– قوربان، لەو قسانەی جەلالم سەر سوڕماوە، دوژمن وا عەشیرەتەکەمان قەلاچۆ دەکا، تالان دەکا، کەچی ئەو دەڵێ: «با لێیان گەڕێین تا دەگەنە نێو چیا». ئەگەر بەقسەی ئەو بێ، خۆ تا دەگەنە ئێرە نیوەی خەڵکەکە قڕ دەکەن. کە نیوەی ئەو خەڵکەش قڕ کرا، هەنگێ ئێمە بچین چ بکەین؟ ئەوە چەند ساڵە شا عەباس لەشکرمان لێ دەکا، بەلام ئێمە پیاوانە نەمانهێشتووە پێ باوێنە خاکمانەوە. وێستاش دەبێ سێ و دووی لێ نەکەین و بچین لەو دەشتە تێیان کەوین.

خانۆ ئیدی ڕێگای ئاخاوتنی کەسی دیی نەدا، گوتی:

– ئەمن بەقسەکانی پۆستۆ قایلم، ئێوە چ دەڵێن؟ کەس دەنگی نەکرد، ڕیش سپییەک نەبێ، گوتی:

– گەورەم، تا ئێستا هەر خۆت پاراستووتین و ڕێگات پیشان داوین، تۆ چ بکەی، ئێمە ناتوانین بڵێین نا؛ چونکە بۆ ئێمەی دەکەی.

مەجلیسەکە هەموو بەیەک دەنگ گوتیان:

– وەڵڵا ڕدێن سپی ڕاست دەڵێ، ئەشەدوبیللا تۆ پاراستووتین، چۆنت دەوێ وا بکە، لە تۆ فەرمان و لە مە بەجێهێنان.

– دە کە ئێوە قایل بن، وەڵڵا منیش قایلم، ئەوجا بە جەوزۆی گوت:

– پێنج سەد سوارم لە بۆ ئامادە بکە، سبەینێ زوو بەڕێ کەوم.

هەندێ لە مەجلیسەکە گوتیان:

– تۆ چ دەکەی؟

– چۆن چ دەکەم؟ خۆم ئامادە دەکەم، بۆ شەڕ بچم.

– ئەدی نالێن: لەشکری ئێران چەندین هەزارە؟ تۆ بە پێنج سەد سوارەوە چت پێ دەکرێ؟

- پێنج سەد سوارم بەسە.

پاشان دیسان بەجەوزۆی گوت:

- مرازی چاوەشم بەدەهۆڵ و زوڕنا و تووڵوومەوە ڕەگەڵ خە. لە سەرۆک هۆزان با ئەسۆی لاکانم دەگەڵ بێ.

وەختێ کۆڕی خانۆ کۆدەبووەوە، دەستوور وابوو لە دیوەخان نان دەدرا و میوانداری دەکرا. ئەوێ ڕۆژێ چەند مەڕێکیان سەر بڕیبوو، لە پێشان گۆشتی برژاو، پاشان تاس کەباب، بەدووی ئەودا قلیانیی سەر سێڵیان بە سیر و ماستەوە بە سینی دابەشییەوە. نۆکەر بەسووراحی شەربەتیان دەبەشییەوە.

پاش نانخواردنێ خانۆ فەرمانی دا، کێشکچیی سەر قوللان پترکەن و وریابن. بەفەرمانی خانۆ بانگی تۆپسازیان کرد، ناوی خاچۆ بوو، بەلام خانۆ پێی دەگوت: خێچۆ. کە هات لێی پرسی:

- خێچۆ، بیستووتە شا عەباس دیسان لەشکری لێ کردووین. ئەو دەمی کە هێشتا تۆپت بۆ ساز نەکردبووین، بەزاندمانن و هەلاتن بەلام لەو بڕوایەدام ئێستا پتریان دەڕۆست دێن، دە تۆپمان هەن.

- نەخێر، قوربان هەر نۆ تۆپمان ئامادەن.

- چاکە تۆپی دەیەم چۆن بوو، ئەدی ئەوێ ڕۆژێ تاقیمان نەکردەوە؟.

- بەڵێ، ئەوێ ڕۆژێ لە پاش ئەوەی جەنابت ڕۆیشتی نۆڕیم هەندێ کەموکورتیی هەیە، پێویستە چاکی کەم.

- کەموکورتیی چی؟

- جێگا پلێتی ئاگردانەی ساز نییە، خەمت نەبێ، چاری دەکەم.

خانۆ فەرمانی دا تۆپەکانیش ئامادە کەن. پاشان ئامۆژگاریی مەجلیسەکەی کرد، گوتی: «ئێوە خۆتان زۆر چاک دەزانن کە شای ئێران زۆر جاران کوردی غەیانی بەجاسووسی بۆ نێو ناردووین، تا لە هەموو ڕاز و نیازێکمان بگا. بەلام ئەوە چەند جارە خەڵکەکە زوو هەستیان پێ دەکەن و

ئاشکرایان دەکەن.»

دوو ڕۆژ بوو ئەو پیاوانەی خانۆ ناردبوونی، هێشتا نەگەڕابوونەوە. ڕۆژێکیان خانۆ دوو سواری وەدووی خۆی دا و لە قەڵا وەدەرکەوت. لە ڕێگا کە لای دا و دابەزی، چەند هەنگاوێکی بەنێو بەفردا هەڵێناوە و لەپاشان گەڕاوە، ئەوجا سواری ئەسپەکەی بووەوە، گوتی:

– من وام دەزانی هێند بەفر باریوە ئەسپ لە شەڕێدا دەرناچێ، بەڵام وا نییە، دەردەچێ.

خانۆ کاتێ گەڕاوە، پیاوەکانی هاتبوونەوە، چاوەنۆڕی بوون. خانۆ لێی پرسین:

– بڵێن، چ باسە؟

– قوربان، چ باس بێ، لەشکرێکی گەورە و گرانە. کەوتوونە نێو ئەو گوند و قشڵاخانە، پیاو دەکوژن و تاڵان دەکەن. گوندییەکانیش وردە و موردە و شڕ و شیتاڵی خۆیان کۆ دەکەنەوە و ژن و منداڵان دەگوێزنەوە لێڕەواران، مرۆ بەهەر لایەکیدا دەچوو گوێی لە گریان و واقی منداڵانە، هەندێکیشیان هەڵاتوون و خۆیان لە گەلی و ئەشکەوتان شاردووەتەوە.

– زۆر بەرەو ئێرەوە هاتوون؟

– نا هێشتا تازە گەیشتوونە گوندەکانی خوارێ.

– ئیدی نابێ ڕاوەستین، دەبێ هەر ئەم شەو بەڕێ کەوین.

ڕۆژ لە پشت چیای لە ئاوابوونێدا بوو، تاریکی وەکو دز هێدی هێدی و لە سەرەخۆ زەویی دەشێردەوە، کۆڕ بڵاوەی لێ کرد و هەر کەسە گەڕاوە ماڵە خۆی. تەنیا خانۆ و ئەسۆی لاکان نەبێ، ئیدی کەسی دی نەماوە. ئەوێ شەوێ بەدوورودرێژی خەریکی تەگبیر و ڕا بوون: چۆن و بە چ ڕەنگێ پێش لە دوژمن بگرن. ئیدی دەنگی کەڵەشێری نیوەشەوێ دەهات، خانۆ وەدەرکەوت، ستێر بەئاسمانەوە جریوە جریویان بوو. دنیا هێندە کپ و خامۆش بوو، دەتگوت کەس بەخەبەر نییە و هەموو لە شیرنی خەوێدان بەڵام وا نەبوو، کەس

نەنووستبوو. خەڵکی قەڵا هەستیان بە هاتنی ئێران کردبوو، جگە لە منداڵی بچووک و ساوای بەرمەمکان، کەس خەوی لێ نەکەوتبوو. وەختێ پێنج سەد سوار بە سەرۆکایەتیی خانۆ ڕێکوپێک و لەسەرەخۆ بەڕێ کەوتن و ڕۆیشتن، خەڵکی قەڵا هەموو هاتبوونە دەرێ لە کووچە و کۆڵان و سەربانان وەستابوون، دەیانگوت:

– شای ئێران خوا بکا تەختت وەرگەڕێ.

سەربازەکان هێند بێدەنگ و جوان دەڕۆشتن، کەس دەنگی لێوە نەدەهات، دەتگوت هەر کەس بەو ڕێگاشدا نارِوا، جار جار پرمەی ئەسپ نەبێ، ئیدی سرتە لە هیچی دیکەوە نەدەهات. خانۆ کە لە قەڵا دوورکەوتەوە فەرمانی دا ئاوەزەنگی تەقێن وەسەڵەف کەون. خانۆ هێند خێرا دەڕۆیی بەڕۆژ و تاقێکی گەییە ئەو جێی کە دوژمن سنووری کوردیان لێ شکاندبوو و بەم دیودا هاتبوون.

لە خوارێ شەڕێکی گەرم بوو. خەڵکی قشلاخان چەند سەربازێکیان لە جێگەیەک ئاسێ کردبوو، گاشە بەردیان بەسەردا غلۆر دەکردنەوە. کاتێکی خانۆ چاوی بەم پەرێشانییە کەوت کە بەسەر هۆزەکەی هاتووە، کزە لە هەناوییەوە هات و لە دڵی خۆیدا، گوتی:

– ئەمانە چییان بەسەر هۆزەکەم هێناوە؟ خانۆ بیری کردەوە لە کوێرا دوژمن داپڵۆسێ. پاشان هاتە خوارێ و سەرلکەکانی کۆ کردنەوە، گوتی:

– ئێمە دەبێ لە سێ لاوە لە دوژمن وەرێین. لە لای ڕاست و لە لای چەپ و لە پێشەوە. لە چەپەوە سەد پیاو و لە ڕاستەوە سەد، بەڵام لە پێشەوە سێ سەد پیاو؛ چونکە هێزی گەورەی دوژمن وا لە پێشەوە. عەزیز تۆ لەگەڵ سەد سەربازدا لە ڕاستەوە برایم ئەتۆش لەگەڵ سەد سەربازدا لە چەپەوە، منیش لە پێشەوە، دەبا جاحێڵان جگە لە شیر و مەتاڵ و ڕمبان، کەمەندانیش ئامادە بکەن و کەمەند لە ملی دوژمن بخەن و کەمەندکێشیان بکەن. هەمزە چاوەش کەمەندکێشکردنی چاک فێرکردبوون، دەبێ ئەوە بزانن کە بە زیندوویێتی

کەمەند کێشکردن ترسێکی گەورە داوێتە دڵی دوژمنان و بەجارێ ورەیان پێ بەر دەدا.

لە نێو سەربازەکانەوە دەنگی پێکەنین هات، یەکێ گوتی:

– لە شەڕی شەمدینانـدا بەو کـەمەندانە ترسێکی وامان خستە دڵی سەربازی ڕۆمییەوە زۆرجار ئەسپەکانیان بەجێ دەهێشت و هەڵدەهاتن.

جگە لەوە خانۆ گوتی:

– کەس هەڵنەکوتێتە سەر دوژمن تا گوێتان لە دەنگی تەپڵ و زوڕنای میرزا دەبێ، هەرکە دەنگی تەپڵ و زوڕناتان بیست، تێیان وەرێن و بستێ دەرفەتیان مەدەن. دەبێ واش بڕۆن کە کەس هەستتان پێ نەکا. دە بڕۆن ئۆغرتان خێر بێ.

کاتێکی عەزیز و برایم ڕۆیشتن، خانۆی نیزیکی ئەسۆی لاکانەوە بوو، گوتی:

– نازانم چ بڵێم، ئەوە چەند جارە ڕۆژانی زۆر سەخت و دژوارمان دیون، زۆرت پێ پشت ئەستوورم. من وا لێرەوە هێرش دەبەم.

– قوربان، تۆ لێرە بمێنەوە، من هێرش دەبەم.

– نا، ئەسۆ گیان، من هێرش دەبەم، تۆ لەگەڵ سێ سەد سوارەکەدا لێرە بمێنەوە، بۆ خۆت لەسەر ئەو لووتکەیە ڕاوەستێ، بنۆڕە، لە هەر لایەکی دوژمن زۆری بۆ هێناین و دەرۆست نەهاتین، گورجێ پەنجا سواران بنێرە و خۆشت لە جێگەی خۆت مەبزوو، هەمیشە بنواڕە و وریا بە. بەڵام هەر کاتێ زانیت لە تەنگانەداین و کارمان شڵۆقە، هەنگێ خۆشت وەرە. من لەو بڕوایەدام کە بەشەرەف و نامووسەوە دوژمن دەبەزێنن.

پاش ئەوەی کە خانۆ لە قسەکانی بووەوە، سەد و پەنجا سواری وەدووی خۆی دا و لێی دا بەڕێ کەوت، نەختێ نێزیک بووەوە. سازبەندیشیان لەگەڵ خۆدا بردبوو، خانۆ هێدی، هێدی، هێدی بەرەو لەشکری دوژمن وەستا، چادری قولی خان دەوروبەری تەیمان کرابوو.

ئێـواره بوو، هەتاو هـێشـتـا بەتین بوو، بەڵام دار و درەخـتی لێـڕەوارەکـانی سنگی چیاکان کە بەرەو ڕۆژ بوون سێبەر بوون. خانۆ بەمیرزای گوت: «ئینجا لێ دە». لەپڕ دەنگی دەهـۆڵ و زوڕناکـــەی مـــیـــرزا هـات. بەڵام چ دەهـۆڵ و زوڕنایەک، کە لە نێو ئەو گەلی و قـات قـاتانەدا دەنگیان دەداوە دەتگوت یەک دەهۆڵ و زوڕنا نـیـیـە، بگرە سـەد دوو سـەد دەهـۆڵ و زوڕنان. قـولی خـان لەو کاتەدا گرتکە گۆشـتێکی بـەرخی بەدەسـتـەوە بوو دەیخـوارد، کە گـرم و هـۆڕی دەهۆڵ و زوڕنای بیست واقی وڕما گوتی:

– وا دیاره ئـەم کـورده بیـانیـانـه شـایی دەکـەن، ئەم هـەمـوو دەهۆڵ و زوڕنایەیان لە کوێ پەیداکردووه.

میرزا نقامی زەلوولی گۆڕی و کردی بەنقامی هاوار و هەندێ دەنگی بڵندتر کردەوه.

سـەربازه پاسـەوانەکـانی قـولی خـان هاتن خـەبـەریان بە قـولی خـان دا، گوتیـان: «خـانۆ پایەدار بێ، لەشـکر لەلای ڕاسـتـەوه شکاوه و هـەر سـەربازه و هەڵدێ...» خـان دیسـان پارده گـۆشـتـێکی ناسـکی دیکەشی لە دەمـی ئاخنی، دووباره خـەبەریان هێنا کە لای چەپێش پەرێشـانه و سـەرباز هـەرچەند دەکا خۆی پێ ڕاناگیرێ، ئینجا تێ گـەیشت کە شـتێ قەومـاوه. گرتکە گـۆشـتـەکەی داناو لە چادرەکـەی وەدەرکـەوت خـانۆی لـەپ زێڕین لەشکری عـەجـەمی چنگ لەسەرشان ڕاپێچا و قولی خانی لەنێو چادردا وەگیر هێنا.

قـولی خـان هـەر هێندەی پێ کرا سـواری ئەسـپەکـەی ببێ. ئەم هـەڵمـەتەی خـانۆ بەجـارێ پەرگـاڵی لەشکری ئێـرانی شکـاند و ترسـێکی وای لە دڵیـان هـاوێشت کـە زۆریان ئەسـپـەکـانیـان بەرەڵڵا دەکـرد و هـەڵدەهـاتن. کـوردی گوندەکـانی خـوارێ و ئاران و گـەرمـەسـێرەکان کە بیـسـتـیـان خـانۆ لەشکری قـولی خـانی وەگیـر هێناوه، ئەوانیش نێرانـه لای خـۆیانەوه لێیـان دان بەڵام لێدان نەگ گاڵتە.

دوو ڕۆژ بوو، لە لاپاڵی چیاکانی دمدم و لە نێو بێشه و چڕستانەکاندا خانۆ

و لەشکری ئێران شەڕێکی گەرمیان کرد. ڕۆژی سێیەم خانۆ و قولی خان ڕووبەڕووی یەک هاتن. خانۆ کە چاوی بەجلوبەرگ و چەک و ڕیحالی قولی خان کەوت، دەستبەجێ گوتی. ئەمە سەرۆکی لەشکرە و تێی خوڕی:

– تۆ بۆچی تالان و کوشتار دەکەی؟ چما نازانی ئەمە خێڵی بەرۆدارە و مەڵبەندی کوردانە؟

قولی خان کە چاوی بە شان و باهۆی خانۆی کەوت بەجارێ قەڵەمی دەست و پێی شکاو لە دڵی خۆیدا گوتی: «من بەدەستی ئەم پیاوە دەکوژرێم» خانۆ ڕووی جڵەوی تێ کرد و شیرێکی تێ سرەواند، بەڵام شیر هیچی لە قولی خان نەکرد. ئینجا پاشە و پاش کشاوە و ئاوزەنگی لە ئەسپ توند کرد و بەتاو هەڵی کوتایە سەری و شیرێکی بەهەموو هێزێکیەوە لێ دا. شیر بەرشانی کەوت و دیسان هیچی لێ نەهات. ئینجا قولی خان گورج دەمانچەیەکی لەبەر پشتێنەکەی هەڵکێشا و لە نێوچاوانی خانۆی توند کرد، بەڵام ئەسۆی لاکان پێش ئەوەی قولی خان پەنجە بە پەلە پیتکەکەیدا بنێ نووکی ڕمبی لە قورقوڕاگەی گیر کرد. دەمانچە لە دەستی قولی خان بەربووەوە و لەسەر عەردەکە دەرچوو. کاتێ لەسەر عەردەکە سەیری لەشی قولی خانیان کرد، تەماشا دەکەن زرێی لەبەردایە و تومەس بۆیە شیری خانۆ کاری تێ نەدەکرد.

حەوتوویێک پتر بوو، خانۆ لەگەڵ سەربازەکانی خۆی و کوردی قشڵاخەکاندا لەشکری قولی خانیان لەو بێشە و گەلییانەدا بڕ بڕ کردبوو، تێیان کەوتبوون و قڕیان دەکردن، بەڵام پاش شەڕ بڕانەوە، خانۆ یازدە سەربازی کوژران و پێنجیش بریندابوون. مانگێ پتربوو قولی خان بەدوو هەزار سەربازەوە هاتبوونە سەر قەڵای دمدم. شا عەباس هەر ڕۆژی دەژمارد و لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

– ئێستا قولی خان گەیشتووەتە چیای دمدم و خاپووری کردووە و ئەو کوردانەشی بەدیل گرتوون و دەیانهێنێ. ئیدی بەجارێ ڕێگامان بۆ کوردستان سانا دەبێ.

ئەو بۆیە باوەڕی وابوو، چونکە قولی خان کەڵەمێردێکی بەناوبانگ بوو. لە زۆر شەڕی گەورەدا هەمیشە زاڵ و سەرکەوتوو بوو و هیچ شەڕێ نەبوو قولی خانی تێدا سەرنەکەوێ. بەڵام هەندێ جاریش شا بیری دەکردەوە کە خانی کوردانیش پیاوێکی دڕە و لە شەڕیشدا زۆر لێزان و چازان و پسپۆڕ و شارەزایە و لەوانەیە شتێک بەسەر قولی خان و لەشکرەکەی بهێنێ. بیری لەوە دەکردەوە چۆنی کۆمەک بکا. کۆمەک بۆ چ لایەکی بنێرێ، قولی خان بە چ ڕێگایەکدا چووە، هەرچەندی کرد، هیچی بۆ نەکرا و نەیتوانی کۆمەکی بۆ بنێرێ و فریای کەوێ. لەو ڕۆژانەدا مزگێنییان بە شا عەباس دا، کە کوڕی بووە. شا وەجاخ کوێر و ئەستیور بوو هەر سەبارەت بەو وەجاخ کوێرییەشی بوو کە کچی شای ئەفغانستانێی هێنابوو. کەچی هەر منداڵی نەدەبوو، بەڵام ئەم مزگێنییە شادمانییەکی بێ سنووری خستە دڵییەوە. چەند ڕۆژ بوو لە خۆشی و شادیدا بوو.

وەزیرەکانی خانۆ، مەزنەکانی، دەوڵەمەند و بازرگانەکان بەپیرۆزباییەوە دەهاتن و ئەم دەهات و ئەو دەچوو. بازرگانێکی دەوڵەمەند هێشتا (فەیزە) خانم سکی دوو مانگان بوو لانکێکی زێڕی لە شاری بەغدا بۆ بەڕادان دابوو، کاتێ دەنگ بڵاوبووەوە کە شاژن کوڕی بووە، لانکەکەی بەدیاری بۆ شا هێنا. شا خۆی و میوانەکانی لە لانکەکەیان دەڕوانی و لە جوانی و نایابییەکەی سەریان سوڕ مابوو. نۆکەر و کوێخادەرکان خەبەریان بە شاعەباس دا، کە سێ سواری قولی خان گەڕانەوە و داوا دەکەن بە خزمەتی شا بگەن.

شا عەباس بەو بۆنەوە کە خوا کوڕی پێ بەخشیوە و وەجاخی شاهنشایەتیی ئێرانێی پێ ڕوون کردووەتەوە خەم و خەفەتی دنیای لە بیر چووبووەوە و بەگەڕانەوەی سێ سوارەکەی قولی خانیش دڵی هێندەی دی خۆشتر بوو. ماڵی وەکو پوورەی هەنگ میوانی تێ ڕژابوو، شەو و ڕۆژ بەزم و ڕابواردن بوو. بەردەرگای خۆشی و ئاوەدانیی وای بەخۆیەوە نەدیتبوو. چەندین ڕۆژ بوو میوان دەستە دەستە لە هەموو شار و ناوچەکانی چوار کەناری وڵاتەوە دەهاتن و دەچوون.

شا بە بەردەستانی گوت:

– بە سوارەکانی قولی خان بڵێن سبەی نا دوو سبەی بێن. سوارەکان لێیان دا ڕۆیشتن. بۆ دوو بەیانی سوارەکان بەفەرمایشتی شا هاتنە بەردەرگا.

ماڵی شا ئەوێ ڕۆژێش لە ڕۆژانی پێشوو گەلێ ئاپۆرەتر بوو، هەموو بەئالا و والا ڕازابووەوە و کەیف و ڕابواردن و عەیش و نۆش بوو. شا دیسان ڕێگای بەسوارەکان نەدا بیبینن.

لەو ڕۆژانەدا لەشکری کورد لە ژێر فەرماندەی خانۆی لەپ زێڕین، لەشکری ئێرانی لە دۆڵ و لێڕەوار و لاپاڵی چیاکاندا لەتوپەت کرد و قڕی کردن، کوردی قشلاخ و گوندەکانی خوارێ وەکو نێچیروان وەدووی سەربازی ئێرانی کەوتبوون و دەیانگرتن و دەیانکوشتن. پاش ئەوەی میوانەکان ڕۆیشتن و بەزم و ڕابواردن کەمێ سووک بوو. شا ڕێگای بە سێ سەربازەکە دا کە بێنە خزمەتی. هەرکە سەربازەکان هاتنە ژوورەوە پێش ئەوەی ئیکلام بکێشن، شا پرسی:

– چتان کرد، قەلاتان وێران کرد؟ ئەو کوردە بیانییەتان گرت، سەرەکەتان هێناوە؟

– شا پایەدار بێ، خانۆی لەپ زێڕین لەشکرەکەمانی بەجارێ قڕکرد، سەربازەکانی وەکو پڵینگ خۆیان پێدا دەداین و تێک و پێکیان دەشکاندین و سەیر ئەوە بوو پیاو نەیدەزانی لە بن کام بەرد، یا کام درەخت خۆیان مات دابوو. لەشکرەکەمان لە نێو ئەو گەلی و بێشە و دار و بەردانەدا پرش و بڵاو بوونەوە و خۆشیان نەیاندەزانی ڕوو لە کوێ بکەن.

– ئەی قولی خان کوا؟

– لە شەڕدا کوژرا.

ئەم خەبەرە کارێکی وای لە شا عەباس کرد لە داخان دەموچاوی کەمێ خوار بوو، ویستی شتێک بڵێ، لە پڕ پاسەوانەکان خەبەریان هێنا:

– شای ئەفغان هاتووە و چاوەڕێی دیدەنییەتی.

– با بێنە ژوورەوە، دەی ئێوە ملتان بشکێن بڕۆن. هەر بە کەس نەوێرن بەکوردی بیانیش نەوێرن. دەک خوا لەوە خراپترتان بەسەر بێنێ. هەرسێ سەرباز بە شەرمەزارییەوە هاتنە دەرەوە و ڕۆیشتن. شا عەباس بەبۆنەی میوانداریی خەزوورییەوە دیسان کەوتە شادی و بەزم و ڕابواردنەوە؛ چونکە خەزووریشی شای دەوڵەتێک بوو. خێرا ئەمری کرد چەند کار مامزێکی لەنێو باخدا بەخێو کردبوو، سەریان بڕین. ئیتر شا عەباس هەر لە کەیف و ڕابواردندا بوو تا چلووی زستانێ بەسەرچوو.

***



بەشی نۆیەم

# حوسێن خان

پاش ئەوەی کە چلوان بەسەر چوو، ژنەکەشی بەداو و دەستوور لە چلوان دەرچوو ئێدی بەزم و شایی و ڕابواردنیش تەواو بوو. شا هەمیشە بیری دەکردەوە چۆن تۆڵەی خۆی لە خانی کوردان بکاتەوە. لەدووی حوسێن خانی هەنارد، خێرا پێیان گوت بێت:

حوسێن خان خەزووری شا عەباس بوو، بەڵام شا خۆشی بەچارەیدا نەدەهاتەوە و زۆری ڕک لێ دەبووەوە و کەم بانگی دەکرد. جارێکیان، وەکو لە دواییدا ئاشکرا بوو، شا ویستبووی خەزووری لە سێدارە بدا. کەس نەیزانی لەسەر چ بوو. فەیزە خانی ژنی دەڵێ شتێک بەسەر باوم بێنی یا خۆم دەرمانداو دەکەم، یا خۆم دەخنکێنم، ئیدی بەمە ڕزگاری بووبوو.

بەڵام ئەم جارە کە خەبەریان دایە شا و بانگی کرد، دڵی وە پەژارە کەوت و لە ڕێگا هەر بیری دەکردەوە:

– کوڕینە، خێرە، دەبێ بۆچی لە دووی ناردبم؟ من نازانم ئەم پیاوە بۆچی حەزم لێ ناکا؟ خوا نەخواستە خۆ هیچ خراپەیەکم بۆی نەبووە و ناشبێ ئەی باشە، ئەو هەموو بێ چارە و کۆڵۆڵانە گوناه و تاوانیان چ بوو کە لە خوتو خۆڕایی سەری پەڕاندن.

حوسێن خان بەدەم بیرکردنەوەوە هۆشی لەبەر بڕابوو، خۆشی نەیدەزانی چۆن گەیشتە بەردەرگای ماڵی شای دەرکەوانان دەرکەیان لێ کردەوە و بەبێ

خـەبەردان حـوسـێن خـان چووە ژووریٚ بۆ خـزمـەت شـای. چونکە هەمـوو دەیانناسی کە باوی فەیزە خانە و خەزووری شا عەباسە. حوسێن خان کە گەیشتە بەر دوێری دیوەخانی شا، بەپێی ڕێورەسم، ئیکلامی کێشا. شا ئەم جارە بەڕووخۆشییەوە جێگەی پیشان دا و لە تەنیشت خۆیەوە داینا، گوتی:

– بیستووتە، ئەو کوردە بیانییانە چییان بەسەر لەشکرەکەم هێناوە؟ حوسێن خان کە ئەوەی بیست گورج تێ گەیشت کە بۆچی لە دووی ناردووە.

– پرشنگی شاهانەتان هەمیشە چەتری سەر سەرمان بێ، بیستوومە.

ئێمە نابێ لەمە بێدەنگ بین، کوردێکی بیانی وا چۆن دەبێ لە ڕووی شاهەنشا چەک هەڵگرێ و سەرکێشی و کەڵەوەکێشی بکا.

وەختێ قولی خانم نارد، گوتی: «دەبێ لە زستاندا قەڵاکەی وێران بکەی چونکە کورد ئەو دەمی باوەڕ ناکەن کەس هێرشیان بۆ ببا»، تۆ دەزانی قولی خان چ شەڕێکەرێکی زۆرهان و شارەزا بوو.

– بەڕاستی، قسەکەی قولی خان ڕاست بوو، وا چاکە پیاو لەم ڕۆژانەدا بەسەریدا بدا؛ چونکە ئەو ئێستا پاش بەزاندنی لەشکری قولی خان دڵنیا و ئەرخاینە و پێدەشت و چیاکانیش بەجارێ بەفر و سەهۆڵبەندانە.

– دە مادەم ئەتۆش باوەڕت وایە، وەرە تۆش لەشکرێ لەگەڵ خۆت بخە و بچۆ سەری، خۆ تۆ لە قولی خان کەمتر نی و گەلێ شەڕیشت بردووەتەوە.

– تکام وایە چەند ڕۆژێکم مۆڵەت بفەرموون، خۆم خەبەرتان لێ دەگێڕمەوە. کاتێ حوسێن خان ئەمەی گوت، شا عەباس کەمێ ڕاما. پاشان ئیزنی دا، کە دوای چەند ڕۆژێ خەبەری لێ بگێڕێتەوە. حوسێن خان دیسان ئیکلامی کێشا هاتە دەرێ، لە هاتنەدەرێدا لەبەر سڤدەرێ تووشی فەیزە خانی کچی هات. فەیزە خان کە چاوی بە باوکی کەوت خۆی هاوێشتە ئامێزی ماچی کرد، گوتی:

– باوە گیان، ئەوە لێرەی، ئەی ناتەوێ چاوت بەنەوەی خۆت بکەوێ کچە لە ڕەنگی باوی نۆڕی، سەیری کرد ڕەنگی پەڕیوە. پرسی:

– ئەیەڕۆ، چت لێ قەوماوە باوە گیان؟ ئەوە بۆچی وا ڕەنگت پڕووکاوە؟ تو حەزرەتی عەلی ڕاستیم پێ بڵێ کێ؟

– کچم هیچ نەبووە.

حوسێن خان حەزی نەدەکرد هیچ لە کن کچەکەی بدرکێنێ.

– نا، باوە گیان، بێ سرِ نییە و لێم دەشێرییەوە، بۆچی بانگی کردی؛ ڕاستم پێ بڵێ؟

حوسێن خان کڕبوو، ورتەی لێوە نەهات، فەیزە خان دەستی بەگریان کرد و گوتی:

– باوە گیان، خوا لە نێرینەی بێ بەشی کردووی و منت بە کوڕی خۆت داناوە و زۆرت خۆش دەوێم، کەچی قسەی دڵی خۆتم پێ ناڵێی، ئەو ناپاکە بۆچی بانگی کردووی و بۆ وا ڕەنگت هەڵپڕووکاوە؟

باو، دیسان وەڵامی کچەی نەداوە، دەستی گرت و بەرەو حەرەم سەراکەی چوون لەوێ باوەشی بەکچەکەیدا کرد و بەسنگی خۆیەوە گوشی و ماچی کرد، پاشان بەرەو لای لانکە زێڕینەکەی نەوەکەی چوو. نەوەکەی نووستبوو، دەموچاوی بەدەرەوە بوو، جوانییەکەی چووبووەوە سەر دایکی.

حوسێن خان بەسەر نەوەکەیدا شۆڕ بووەوە و بەهێواشی، بۆ ئەوەی لە خەوی نەکا، گوتی:

– خوا بەساغ و سەلامەتی گەورەت بکا، بەڵکو تۆ ببی بە شای ئێران، بەڵام قسەکەی تەواو نەکرد، فەیزە خان تێ گەیشت، گوتی:

– بەڵام نەک وەکو باوکت بی.

حوسێن خان بەترسەوە سەیری چاوی کچەکەی کرد و گورج زانی کە تێی گەیشتووە، پێی گوت:

– نازدارێی باوی، وا دیارە هەڵت هێنا.

حوسێن خان لە کچە نێزیک بووەوە و جارێکی دیکەشی لە ئامێز کرد، گوتی:

– کچی خۆم لە تۆ زیاتر منداڵی دیم نییە چ لە تۆ وەشێرم و چ لە خوا:

شا بانگی کردم کە لەشکر هەڵگرم و بۆ شەڕی کوردان بچم. خۆت بیستووتە کە لەشکرەکەی قولی خان ئەو کوردە قڕی کردن و لە بنی هێنان و قولی خانیشیان کوشت. ئێستا زستانێکی سەختە و سەرمای ئەوێ ئەندازەی نییە. ئیتر و ئیدی چۆن ڕەنگ و ڕووم پێ بمێنێ کچم؟

حوسێن خان بەوەی زانیبوو کە ئەگەر کچەکەی نەبوایە شا عەباس لەمێژبوو لە سێدارەی دابوو، هەروەها ئەوەشی باش زانیبوو کە لەو ڕۆژەوە شا عەباس کچە چواردە ساڵانەکەی شای ئەفغانستانی بەسەر فەیزە خان هێنابوو، فەیزە خان وەکو جاران حەزی لە شا عەباس نەدەکرد.

فەیزە خان دەستی بەگریانێ کرد و خۆی هاوێشتە باوەشی باوکییەوە، گوتی:

– چارەڕەشی من و کلۆڵی تۆ نەبوایە، ئێستا کوڕێکت دەبوو لەم تەنگانەیە فریات دەکەوت و لە جیاتی خۆت بۆ شەڕ دەچوو، یا لە پشتت بوو، بەڵام ڕووی بێ بەختی ڕەش بێ.

فەیزە خان سەری لەسەر سنگی باوکی دانابوو فرمێسک وەکو بارانی بەهار لە چاوانی دەباری و باوکیشی توند بەخۆیەوەی گوشیبوو، لە پاشان گوتی:

– باوە گیان، وا دەچم لێی دەپاڕێمەوە بەڵکو تۆ نەنێرێ.

– بۆ خاتری خوا و حەزرەتی عەلی شتی وا نەکەی کچم، تۆ بەمە کارم خراپتر دەکەی؛ چونکە وا دەزانێ من پێم گوتووی، جا نۆرەی ئەوەمە بیانووێکی دیکەم پێ بگرێ و بمکوژێ.

– کچی خۆم شتی وا نەکەی دەخیلت بم، بڕۆم چاکترە، بەڵکو خوا دەرووی بەزەییم لێ بکاتەوە، بە ساغ و سەلامەتی بۆ ماڵی خۆم بگەڕێمەوە.

حوسێن خان لە کن کچەکەی هاتە دەرێ، ئیتر سەرلەئێوارە بوو بۆ ماڵێ دەچووەوە.

چیای دمدم چیایەکی ئێجگار گەورە و بەر فراوانە، لە نێو چیاکانی کوردستاندا چیایەکی دیکەی وا کەمە.

ئەو چیایە سەرانسەری جەنگەڵ و بێشەڵانە. پڕە لە گەلیی قووڵ قووڵ، گەلێ جێگەی پێدەشت و ڕاستانیشی هەیە، بەهەر لایەکدا بچی کانی و کانیاو و مێرگ و چیمەن و سەوزە. شوێن شوێن، باخ و باخاتی میوەجاتی هەمەڕەنگە، جێ جێ گۆلاوی پان و بەرینە. گوێ گۆلاوەکان و نێو دۆڕگەکانیان پڕن لە قاز و مراوی و قولینگ و هەوێردە و تەیر و تووی دیکە. پیاو کە دەچێتە ئەو گوێ گۆلاوانە، مەستی دەنگیان دەبێ. ئەگەر زۆریان لێ نێزیک دەبییەوە لە ترسان خۆیان لە گۆل داوێن و بێچووەکانیان دوایان دەکەون.

خێڵی بەرۆدار دەغڵودانیان هەر هێندە دەچاند بەشی خواردنی خۆیان بکا، بەڵام پەز و گا و گۆتاڵ و وڵساتی زۆریان بەخێو دەکرد؛ چونکە ئەو چیا و چۆڵانە لەوەڕی زۆر خۆش بوو، بەهەر لایەکدا دەچووی مێرگ و چیمەن بوو.

پەز لە پایزێڕا تا بەهارێ لە قشلاخاندا دەماوە، بۆ ڕەشەوڵاخ و ماین و ئەسپیش هێندیان گژوگیا دەدوورییەوە تا پاش بەهاریش هەر تەواو نەدەبوو.

کورد پەزیان تەنیا بۆ گۆشت و شیر و ڕۆن نەبوو، بگرە لە خورییەکەشی گەلێ سوودیان وەردەگرت: دەیانفرۆشت، مافوور و قالیچەیان لێ دروست دەکرد، بەڕە و لباد و جاجم و پۆپەژمیان لێ دروست دەکرد، خورج و تێڕ و جەواڵ و گوریس و کەژوو و گەلێ شتی دیکەیان لێ دەچنی.

قالیچە و مافووری کوردستان لە تاران و بەغدا و شام و بێرووت و ئەستەمبۆڵ زۆر بەنرخ بوو و بەدەست نەدەکەوت. بازرگانانی ئەو وڵاتانە هەموو ساڵێ دەهاتن، خورییان دەکڕی، مافووریان دەکڕی، بەڕە و جاجم و شتی تریان دەکڕی و بەکاروانە وشتر و هێستر بۆ وڵاتی خۆیان دەگواستەوە.

پایز بوو، سەرچیا بڵندەکان لەمێژ بوو بەفر گرتبوونی، بەڵام لە پێدەشتی ئێرانێ دەتگوت تازە بەهارە. لەم وڵاتە زەوی دووجار دەخەملێ: جارێ لە سەرەتای بەهارێدا کە دار و درەختی نێو باخ و باخات و بێستانان گوڵیان

دەکرد و تارای ڕەنگاوڕەنگیان دەپۆشی، جارێکیش پایزێکی درەنگ وەختێ دار و درەختی باخ و باخاتی دەشتی ئێران گەڵای هاوینانی دەوەری و سەرلەنوێ گەڵای تازە وەچی دەکردەوە و لە هەمەڕەنگە گوڵیان دەپشکوت پیاو خواخوای بوو سەیریان بکا.

لێرە. لە قەڵای دمدم، لە زووەوە بەفر باریبوو، سەرما و سۆڵە بوو، ڕۆژگار تا دەهات لە کورتیی دەدا و شەوگار دەیدایە درێژی، خێڵی بەرۆدار لە قەڵا و گوندەکاندا هەرەوەزی زبارە و دەسەوای خوری پشکنین و خوری شووشتنەوە و خوری شیکردنەوە و خوری ڕستنیان دەکرد، ماڵی وا لە قەڵادا هەبوو، هەر دوو حەوتوو یا سێ حەوتوو هەرەوەزی تێدا دەکرا. ماڵی عەدیش داوای هەرەوەزییان دەکرد. نانێی خوشکی شەباب بەشوێن دلبەر چووبوو. گوتبووی:

– دێم، تۆ بڕۆ.

شەبابی کوڕی عەدی لە خۆشییاندا پێی بە زەوی نەدەکەوت و ئارامی لەبەر بڕابوو لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

– کوڕینە، کەی ئێوارێ دادێ، چاوم بەدلبەری خۆشەویستم بکەوێ؟

بەجارێ ئارامی لەبەر بڕابوو هەرچەندی دەکرد نەدەسرەوت، جاروبار لە خوشکی نیزیک دەبووەوە، دەیگوت:

– نانێ، تۆ نەتگوت، دلبەر گوتوویە: «تۆ بڕۆ، من ئێوارێ دێم» ئەدی کوانێ بۆ نەهات؟

نانێ پێ دەکەنی، دەیگوت:

– برا بۆچی تۆ تازە زبارە و هەرەوەزی دەبینی، هێشتا دنیا ڕووناکە، با تاریک دابێت ئینجا کچان بەرە بەرە دێن.

– جا بۆچی دەبێ ئێوارێ کۆ بنەوە، ئەی پار بۆچی لە بەیانییەوە کۆ دەبوونەوە تا نیوەشەوێ لە ماڵی ئێمە دەمانەوە.

نانێ تووڕە بوو، گوتی:

– برا تۆ بەڕاستی پیاوێکی سەیری، ئەی نازانی ئەمڕۆ یەکەم ڕۆژی

هەرەوەزییە و کچان لە یەکەم ڕۆژدا تۆزێ درەنگ دێن، چونکە ئەم ئێوارەیە کابانی ماڵ، یەعنی دایکی من و تۆ، کاریان بەسەردا بەش دەکا: چەند کچ لە خوری پشکنین بن، چەند کچ لەسەر خوری شیکردنەوە بن و چەند کچ خەریکی ڕستن بن، بەڵام ڕۆژی دوایی ئیتر هەموو ڕۆژێ بەیانیان دێن. تێ گەیشتی؟ دە بڕۆ ئیتر، لێم دوورکەوە، با خەریکی کاری خۆم بم.

هێشتا دونیا ڕووناک بوو. شەباب چوو بۆ دەلاکخانە سەری خۆی تاشی، بەڵام هێشتا ڕیشی گوێزانی نەدیتبوو. کاتێ لە دەلاکخانە گەڕاوە دایکی و خوشکی لە نێزیکەوە پێ دەکەنین و دایکی لە خۆشی کوڕە تاقانەکەی گەز گەز باڵای دەکرد و شاگەشکە دەبوو. دایک و باوکی شەباب نەک تەنیا لەبەرئەوە خۆشیان دەویست، چونکە جگەرگۆشەی تاقانەیان بوو، بگرە لەبەرئەوەش، چونکە لە نێو هاوزا و هۆگری خۆیدا چ لە نێچیروانی و چ لە کار و خەبات و چ لە شەڕدا هەمیشە خاوەنی پایەی هەرە بڵند بوو و گۆی گرەو ئەو دەیبردەوە. چەندین جار خانۆ خۆی لە پێش هەموو جحێڵەکان بە مێرخاسی و ئازایەتیی شەبابیدا هەڵ دەدا و پەسنی دەدا.

ئیتر دنیا تاریک داهات، چراش هەڵکران. کچان بەرە بەرە هاتن، بەڵام دلبەر هێشتا نەهاتبوو. شەباب ئارامی لەبەر بڕابوو، دەهاتە کن کچەکان، دەیڕوانی هێشتا دلبەر نەهاتووە و ڕاست دەگەڕاوە و دەڕۆیشت. پاشان دیسان دەهاتەوە کن کچەکان دادەنیشت. دلبەر پاش هەمووان هات. جوانی وەکو دلبەر، نەک هەر لە قەڵا، بگرە لە نێو هەموو خێڵی بەرۆداریشدا هاوتای نەبوو. ڕوخساری وەکو بەفری یەک شەوە پاک و ڕوون بوو. برۆی ڕەشی قەیتانی بوو، قەتی کل لە چاو نەدەکرد، ناوچاوانی پان و خشت بوو، لێوی کەمێ گۆشتن و ئاڵ بوو، لووتی تۆزێ بەرانی هەڵکەوتبوو، بەڵام ڕێک و ڕاست بوو، گۆناکانی وەکو گوڵاڵەسوورە وابوون. خاڵێکی بەگەردنەوە بوو، هێندەی دیکەی جوان کردبوو. جلوبەرگی پۆشتە و نوێ و گرانبایی بوو، بازنی دەست و مەچەکی لەو بازنانە نەبوون کە لە کن وەستای قەڵا دروست دەکران، هی شاری بەغدا بوون، پێڵاوەکانیشی هەر دەستکردی بەغدا بوون.

کاتێ دلبەر بەدەرکەوت، شەباب لە ناو کچەکان دانیشبوو، هەستا ڕۆیشت. کچەکان تێ گەیشتن، بووبە پرمەی پێکەنین. دلبەر لە پێکەنینەکەیان گەیشت و ئەویش سووکە زەردەخەنەیەکی ناسکی بەلێودا هات.

وەختێ شەباب چووە دەرێ کچێکی دەم هەراش بەقەستی بەدەنگێکی بڵند بۆ ئەوەی گوێی لێ بێ گوتی:

– شەباب لێی دا ڕۆیشت، وا دیارە کوڕێکی چاو تێر نییە وەکو کوڕانی دیکە ناچێ پستە بۆ کچانی زبارە بکڕێ بۆیە ڕۆیشت؟

شەباب هێشتا لەبەر دەرگا بوو، کە ئەم توانجەی بیست، دەستبەجێ بەفرکان چوو بۆ دووکانی (قیریاقۆس) سێ هۆقە کشمیش و نۆکی برژاوی کڕی و هێنایەوە دای بە نانێی خوشکی. نانێ پستەکەی لەبەردەمی کچەکان دانا و گوتی:

ئێوە لە ناهەق ئەم قسانەتان بە برای من گوت، ها فەرموون ئەوە پستەی بۆ کڕیون تا دەتوانن بخۆن.

کچە دەم هەراشەکە کاتێ دەمی کیسە پستەکەی کردەوە و چاوی بەنۆکەکە کەوت دیسان دایە تریقەی پێکەنین، کچەکانی تر نەیاندەزانی بۆچی پێ دەکەنێ، بەڵام ئەوانیش ئاخرێکەی دایانە تریقەی پێکەنین، پاشان کچە گوتی:

– هەی، ئەمە چییە؟ خۆ ئێمە منداڵی حەوتساڵە نین بەنۆک دڵمان خۆش کرێ، بریا خورمای بۆ کڕیبایین.

دلبەر کە ئەم توانجە درێو و قسە کاڵ و کرچانەی بیست خۆی پێ نەگیرا گوتی:

– کنا، باوانتان نەشێوێ، ئێوە بۆ ئەوەندە سەیرن، چما نۆک لە خورما و کشمیش چاکتر و خۆشتر نییە. ئەی تۆ نازانی نۆک بابەتی پستەیە و کشمیش و خورما شیرینییە. خۆ هەرچی ماڵە گەورەکان هەن بۆ شەوبوێری نۆک دادەنێن، وەڵڵا من حەز لە نۆک دەکەم.

کچەکان سەرگەرمی لاقرتی و دەمەتەقێ بوون، کابانی ماڵ هات بۆ لایان و

سڵاوی لێ کردن و گوتی:

– بەخێر هاتن کچە خۆشەویستەکانم، بەسەر هەردوو چاوان، ئەم شەو هەمـوو پێکـەوە خـوری بپـشکنن و لە پێکوڵە و کـونجـڕکی پاک بکەنەوە. بەڵام سبەینێ ئەو کچانە – کابان دەستی بۆ درێژ کردن – هەر خەریکی خوری پاککردنەوە بن، هۆ وانەش خـوری شی بکەنەوە و ئەمانیش خەریکی خـوری ڕستن بن. کابان ئەم قسانەی گوت و ڕۆیشت.

ڕۆژ و تاقێ بوو کچان لە ماڵ عەدی خەریکی زبارە بوون ئیتر کار لە تەواوبووندا بوو. وا باو بوو، زبارەی هەر ماڵێکیان تەواو دەکرد، ماڵەکە خواردنیان دروست دەکرد و سازبەندیان بانگ دەکرد، دەهۆڵ دەکوترا و زوڕنا دەژەندرا، کوڕوکاڵ دەستیان بە شایی و زەماوەند دەکرد و تا نیوەشەوێ بە شادی ڕایان دەبوارد و پاشان ماڵئاواییان لە کابانی ماڵ دەکرد و بە دەهۆڵ و زوڕناوە بەکۆڵانەکاندا بۆ ماڵی خۆیان دەگەڕانەوە.

ئەو ڕۆژەی کە کاری ماڵی عەدیش تەواو بووبوو، سازبەندێکی بەناوبانگیان بانگ کردبوو، ناوی (مراز) بوو، مراز جگە لە زوڕنا، تۆڵومیشی دەژەند. جحێڵ و کوڕوکاڵ کە بیستیان: مرازی سازبەندیان بانگ کردووە، هەر هێندە نەبوو گەشکە نەیانگرێ، چونکە لەو ناو خێڵانەدا سازبەندێکی دیکەی وەکو مراز نەبوو. لە کۆڕ و مەجلیساندا دەیانگوت:

– زوڕناکەی مراز، وشکە سۆفیش وەسەمایە دێنێ.

جا بەڕاستی مراز، زوڕنا و تۆڵۆمێکی وا چاکی دەژەنی، ئەوەی کە قەتی شاییش نەکردبوو هەرکە گوێی لە زوڕنا و تۆڵومەکەی دەبوو ئیتر لە خۆیەوە فێر دەبوو بەو با دەستی بەرنەدابا.

هێشتا ڕۆژ تەواوێ بڵند بوو، کەچی لە ماڵی عەدی هەر دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا دەهات. ماوەیەکی دووردرێژ بوو کوڕوکاڵ سەرگەرمی چەندین جۆرە هەڵپەڕکێ و شایی بوون. ناوبەناو زوڕنا بێدەنگ دەبوو، مراز فووی بەتۆڵومدا دەکرد و سووک سووک نقامی «گوڵێ نێریمێ»ی دەژەند و چوارقۆڵی دوو کچ و

دوو کوڕ بۆیان بەگۆرانی دەگێڕاوە:

گوڵێ نێریمێ های نێریمە، گوڵێ نێریمێ های نێریمە.

گوڵێ نێرییان خنکە خنکە، گیانی نێرییان خنکە.

کچ و کوڕەکان بەنۆرە چەند جارێک ئەم نقامەیان گوت. لە پڕ دیسان تۆڵومی مراز بێدەنگ بوو، ئنجا دەستی لە بناگوێی نا و دایە چریکەی گۆرانی:

کوردستانە، کوردستانە، کوردستانە.

پڕت چیا و لێڕ و دەشت و مێرگ و چیمەن و گوڵانە»

جێگای ژیانی خۆش و شادیی و کەیفانە

جێگای شایی جحێڵ و کیژ و کوڕانە

خوا وەرگەڕێ تەختی پادشای ڕۆمی و شای ئێرانە

هەموو ساڵێ بەسەرماندا دەدەن بەقۆشەن و لەشکرانە

هەر شینگەی شیر و مەتاڵ و کۆسە میسرییانە،

هەر بۆ وەی مە لەبن چەنگاڵی خۆ ئاوێن ئەو زۆردارانە

(بەڵام هەیها، ئەوە خەونە و قەت بەدی نایە بۆیانە)

ئەگەر لە جێگەیەک شایی و زەماوەند با و مرازی سازبەند نەیگێڕا با - با خاوەن شاییەکەش زۆر بەدەست و خزمەتیش با - خەڵکەکە دەیانگوت:

- ئەمە چ شایی و زەماوەندێکە مرازی سازبەند بەتۆڵوم و دەهۆڵ و زوڕناکەوەی نەیگێڕێ.

جا سەبارەت بەوە کە، مراز شایی و هەڵپەرکێی دەگێڕا کوڕوکاڵ و هەرزەکاران لە خۆشییان پێیان بەزەوی نەدەکەوت و کەیف کەیفی وان بوو. شەوگار ڕاشکا جحێڵان تازە لە ماڵی عەدی دەهاتنە دەرێ، لە بەردەرگاش بەینێ کۆچەریانە* دایان مەزراندەوە و تێروپڕ هەڵپەڕین، ئینجا بڵاوەیان لێ

* کۆچەری: جۆرە شاییەکە.

کرد و هەرکەسە بۆ ماڵی خۆی گەڕاوە.

ڕاستە خێڵی بەرۆدار، لەو ڕۆژانەی زستاندا، سەربەستانە شایی و بەزم و ئاهەنگیان دەگێڕا، بەڵام خانۆ زۆر چاکی دەزانی کە شا عەباس لە کوشتنی قولی خان و لەتوپەتکردنی لەشکری ئێران خۆش نابێ و هەروا بەبێدەنگی نایبڕێتەوە و هەر ڕۆژێ بێ، ئاخرییەکەی، لەشکرێکی گەورە و گرانی دیکەش دەکاتە سەر قەڵای دمدم. لەبەر هەندێ خانۆ چوار سەد پیاوی لە ژێر فەرماندەی لاکاندا بۆ گوندەکانی خواریێ ناردبوو، شەو و ڕۆژ بەسەر ڕێگاکانەوە بوون، کێشکیان دەگرت و ئەگەر شتێک ڕووی دا لێی ڕاپەڕن و گورجێ خەبەر بە خانۆ بدەن.

هەر لەو ڕۆژانەدا حسێن خان لە شاری تاران خۆی تەیار و ئامادە دەکرد بەسەر قەڵای دمدمدا بدا. حوسێن خان بیری لەوە دەکردەوە کە سوتۆ بەگی کوردیش لەگەڵ خۆیدا ببا، چونکە سوتۆ بەگ شارەزای هەموو ڕێگاوبان و کون و کەلێنێکی بوو. حوسێن خان چەند خولامێکی بەدوایدا نارد. سوتۆ بەگ هات و ئیکلامی بۆ حوسێن خان کێشا. حوسێن خان گوتی:

– سوتۆ بەگ، ئێمە زۆر چاک دەزانین کە چەند دڵسۆزی شاهەنشای و بەئەمری شا دەبێ بۆ سەر قەڵای دمدم بچین و تۆش دەبێ لەگەڵمان بێی ڕابەریمان بکەی، ئێمە بەڵەد نین.

سوتۆ بەگ گوتی:

– وەی بەسەر هەردوو چاوم، قوربان من ئەو چیا و چۆڵانە بست بەبستی بەڵەدم و خوا یار بێ و شا خۆش بێ دەبێ ڕێ بەڵەدییەکی واتان بکەم بەداستان بگێڕدرێتەوە.

حوسێن خان هەر ئەوێ ڕۆژێ لە تاران بەڕێ کەوت، دنیا زۆر خۆش بوو، دار و درەختی باخ و باخاتەکان گەڵایان کردبوو، دەتگوت سەرەتای بەهارە.

حوسێن خان چەند ڕۆژ بوو لەگەڵ لەشکردا بەرەو قەڵای دمدم بەڕێوە بوون، تا گەیشتنە جێگایەک بەفر گرتبووی.

حوسێن خان زۆر بەترس و پارێزەوە بەرەو قەڵا دەهات، چونکە لە چەند سەربازێکی قولی خان، لەوانەی کە هەڵاتبوون و بەسەلامەتی گەڕابوونەوە، بیستبووی، کە کورد چ پەت پەتی و چەرمە سەرێیەکیان بەسەر لەشکری قولی خان هێنابوو. ئێوارەیەک حوسێن خان بانگی سوتۆ بەگی کرد، گوتی:

– سوتۆ بەگ، تۆ ناتوانی لە شارێمان لادەی و بەرێگایەکی قەدبڕماندا ببەی؟

– چۆن ناتوانم گەورەم. سبەینێ بە چەپە ڕێگایەکی قەدبڕتدا دەبەم. بۆ سبەینێ سوتۆ بەگ لەشکری حوسێن خانی لە ڕاستە شارێ لادا و بەرێگای ڕەوەند و کۆچەرانیدا بردن، ئەم ڕێیە، لە ڕاستە شەقام و شارێ نزیکتر بوو، سوتۆ بەگیش خۆشی لە ڕاستە شارێ دەترسا، چونکە زۆر چاک دەیزانی: هەر کە بگەنە قشلاخی کوردەکان دەستبەجێ قەرەوڵ و پاسەوانان هاوار بۆ خانۆ دەبەن و هەر لەو ڕێگایانە قڕیان دەکەن و تەفر و توونایان دەکەن و هەرگیز نایەڵن بەگوندەکان بگەن و هیچیان بەساغی دەربچن. بەڵام ئەگەر ئێمە کوتوپڕ بەسەر قەڵادا بدەین خان ئاگای لە هیچ نابێ و بەئاسانی قەڵا داگیر دەکەن. ئیتر لەسەر ئەم پیلانە سوتۆ بەگ ملی ڕێگایەکی قەدبڕی گرت و لەشکرەکەی بەو ڕێگایەدا هێنا. دوو ڕۆژ بوو سوتۆ بەگ لە پێش لەشکرەوە بەو ڕێگا قەدبڕەدا دەهاتن. ڕێگاکە بەفر و بەستەڵەک بوو، بەڵام سواری لێ دەردەچوو، هەندێ جار سوتۆ بەگ ڕێی هەڵە دەکرد و لەپڕ دەکەوتە گەلییەکی قووڵەوە، پاشان بەهەزار شەڕەشەق ڕزگاری دەبوو، چونکە بەفر هەموو ڕێگاوبانی داپۆشیبوو بە تەمومژێکی وا ڕێگای کۆچەرانیش بەدی نەدەکرا. جارێکیان لەشکرەکەی گەیاندە سەر گەلییەکی قووڵی هەزار بەهەزاری وا، پیاو کە لە سەرەوە تەماشای خوارەوەی دەکرد بن گەلییەکە بەچاو نەدەبینرا. پێشەنگی لەشکرەکە خەبەریان بەحوسێن خان دا و گوتیان:

– کەس لەم گەلییە بەساغی دەرناچێ. چونکە هیچ جێگەیەکی وا نییە کە ئەسپ بەحاڵ سمی لێ گیر بکات.

حوسێن خان بەپەژارە کەوت و لە دڵی خۆیدا گوتی: «تۆ بڵێی سوتۆ بەگ

ئێمەی بە غایەنەتی بەم ڕێگایەدا هێنابێ و مەبەستی قڕکردنمان بێت؟» گورج سوارێکی بەدوای سوتۆ بەگدا نارد، سوتۆ بەگ پێشەنگ بوو، خێرا هات بۆ لای حوسێن خان و کەمێ سەری بۆ کەچ کرد و حوسێن خان گوتی:

– کەواتە تۆ بەم ئەقڵە کوردەوارییانەی خۆتەوە بەتەمای فریوم بدەی و بەلەشکرەکەمەوە لەم گەلییەدا نوقمم بکەی؟

ئەم قسانەی حوسێن خان سوتۆ بەگی ترسان و لە دڵی خۆیدا گوتی: «کابرا لە خوتو خۆڕایی نەمکوژێ».

سوتۆ بەگ یەکسەر لە نێو ئەو بەفرەوە بازێکی بۆ دا، گوتی:

– حوسێن خان، ئەوە زەوی و ئەوە ئاسمانە، لێرەدا هیچ پێچ و پەنا و فریوێک نییە، خان بەرقەرار بێ، خۆت دەزانی ئەوە چەند ساڵە بەندە خێڵەکەی خۆمم بەجێ هێشتووە و هاتووم بەو پەڕی دڵسۆزییەوە خزمەتی شاهەنشا دەکەم، ئێستا تۆ لە خۆڕایی بۆچی تاوانبارم دەکەی؟ حوسێن خان گوتی:

– دە کە پیاوێکی وا دڵسۆزی، وەپێش لەشکر کەوە و زوو لەم گەلییەمان ڕزگار بکە و بمانبە سەر ڕێگایەکی کورت، زوو بگەینە قەڵا. سوتۆ بەگ دیسان وەپێش لەشکر کەوت، لەشکر هەمدیس دای کێشا بەڕێ کەوت. تەمومژ دنیای وا تاریک کردبوو، سوتۆ بەگ خۆشی نەیدەزانی لەشکرەکە بەرەو کوێ دەبا، گەیشتە جێگایەکی هێند تووش و سەخت ئیتر نەیتوانی هەنگاوێک بەرەو پێشەوە بڕوا. جێگاکە چیایەکی هێند بڵند بوو، پیاو کە سەری هەڵدەبڕی سەیری بکا، کڵاوەکەی سەری دەکەوتە خوارێ، کە سەیری لای چەپیشت دەکرد گەلییەکە هێندە قووڵ و هەزار بەهەزار بوو خوارەوەی بەچاو نەدەبینرا و چۆمەکەی هەر خوڕە خوڕ و هاژەی دەهات و دەڕۆیشت، سوتۆ بەگ سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد، وەخت بوو لە ترسان بتۆقێ و ئیتر چاوی دەستی بەڕەشکە و پێشکە کرد و تەمومژ هێندەی دیکە دنیای لە بەرچاو تاریک کرد و سەربازەکانی دەوروبەری خۆی نەدەبینی، سوتۆ بەگ

زۆر چاکی دەزانی کە خانەکانی ئێران گەلی کوردیان هەروا بەخوتو خۆڕایی کوشتووە.

پێشەنگی لەشکرەکە دیسان هاواریان بۆ حوسێن خان هێنا، کە سوتۆ بەگ بەجێگایەکی وایدا هێناون. نە بەلای ڕاستدا دەتوانن بڕۆن و نە بەلای چەپدا، پێشەوەش شاخێکی هێندە بڵندە لووتکەکەی بەچاو نابیندرێ. ئینجا حوسێن خان هیچ گومانێکی لەوەدا نەما کە: «ئەم کوردە غایەنە» ئەمری کرد:

– زوو، ئەو بەرازەم بۆ بێنن.

وەختێ سەرباز بەشوێن سوتۆ بەگیدا چوون، حوسێن خان بەپاسەوانەکانی خۆی گوت:

– کاتێ قسەی لەگەڵ دەکەم، چاوتان لێ هەڵدەتەکێنم، لەپڕ لێی دەن بیکوژن ئەم سەگە. پێشینان دەڵێن: «گورگ ڕۆحی خۆتی بدەیێ هەر چاوی لە بێشەلانە».

سوتۆ بەگ کە هاتە بەردەمی حوسێن خان، پاسەوانەکانی چواردەوریان تەنی. سوتۆ بەگ گورج تێ گەیشت چواردەوریان بۆچی گرت، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و دڵی دەستی بە تەپە تەپ کرد و دەلەرزی و ئاوڕی دەوروبەری خۆی داوە.

حوسێن خان گوتی:

– ئەگەر تۆ، وەکو خۆت دەڵێی، پیاوێکی دڵسۆزی، کوا ڕێگا؟ تۆ ئێمەت بۆچی هێنا لێرەدا ئاسێت کردین؟ ئەی ئەمە خاکی وڵاتی خۆت نییە؟ خۆ تۆ بەناخێری خۆت لێرە گەورە بووی و بەهەموو بن بەرد و کەندەڵان و گەلییەکی ئاشنای.

سوتۆ بەگ زمانی چووە کلیلە و هەرچەندی کرد نەیتوانی وەڵامی حوسێن خانی بداتەوە، زمانی بەیەکدا ئالا و گوتی:

– ر، ر، ر...

ئیتر هەرچەندی کرد نەیتوانی قسەکەی تەواو بکا. لە ئەسپەکەی دابەزی و

خۆی بەسەر ئاوزەنگییەکەی حوسێن خاندا دا و دەستی بەپاڕانەوە و ئاوزەنگی ماچ کرد و گوتی:

– خوا هەڵناگرێ، بۆچی لە خۆڕایی دەمکوژن. من دەسەڵاتم چییە، پیاوی چاک بە، وەڵڵاهی نیهادم خراپ نییە و بەقەستی ئەمەم نەکردووە. وا بەچاوی خۆت دەبینی: چ تەمومژێکە؟.

حوسێن خان یەک دوو ئاوزەنگی لە دەم و قەپۆزی دا و یەک دوو ددانی شکاند و خوێن فیچقەی کرد، بەڵام سوتۆ بەگ ئاوزەنگییەکەی هەر بەر نەدەدا.

پاسەوانەکانی حوسێن خان پڕیان دایێ، سوتۆ بەگ شیری هەڵکێشا و بەدەستی چەپی مەتاڵەکەی گرت و بەدەوروبەری خۆیدا نواڕی. حوسێن خان لە پاسەوانەکانی خوڕی:

– بۆ بەرانبەر ئەم سەگە وەستاون؟ نابینن شیری هەڵکێشاوە، لێی دەن.

پاسەوانەکان بەبێ سێ و دوو بە شیر دایان پڵۆست، بەڵام سوتۆ بەگ هێندە بەدەستوبرد خۆی بەمەتاڵەکەی دەپاراست هیچ شیرێکی بەر نەدەکەوت. ئەو لایەی کە لە حوسێن خان بوو دەستیان بۆ نەدەوەشاند نەبادا بەر خان بکەوێ، حوسێن خان هەستی بەمە کرد و گورج لێی دوور کەوتەوە، بەڵام پاسەوانەکان دیسان هەر نەیانوێرا داپپاچن. سوتۆ بەگ شیرێکی لە شیری یەکیان دا و شیرەکەی لە دەستی پەڕاند. ئینجا کەمێ بزووت، دەیویست بەرەو گەلییێ بڕوا، بەڵام پێی لە بەردێک هەڵکەوت، لەپڕ لێیان دا و کوشتیان.

حوسێن خان ئەمری کرد:

– سەری ئەم سەگە ببڕن، دە تا خورجێکی باوێن پیشانی شای بدەین. لەشکری حوسێن خان ناچار هەر بەو ڕچەیەدا پێیدا هاتبوون ڕێوڕاست گەڕانەوە سەر شاڕێیێ.

ئەو سەربازانەی کە خانۆ بۆ سەر سنوورەکانی ناردبوون، شەو و ڕۆژ

بەلاکانەوە بەسەر بەفردا دەخلیسکان و بەهەموو لایەکدا دەهاتن و دەچوون.

لەشکرە ماندووەکەی حوسێن خان، لۆژە لۆژ وەکو قەتار بەڕێگاکەدا دەکشا. سەربازەکانی خان لەپڕ تووشی پێشەنگی لەشکرەکەی حوسێن خان بوون، دەستبەجێ چەند سوارێکیان بە بەر تیران دا و کوشتنیان. ئیتر شەڕ لە نێوان کورد و لەشکری حوسێن خاندا دەستی پێ کرد. سەربازی حوسێن خان ڕووی رکێفیان لە کوردان کرد. بەڵام هەرکە لە ڕاستە ڕێگاکە دەرچوون لە بەفردا نوقم دەبوون نەیاندەتوانی پێشتر کەون، هەرچی لاکانچییەکانی خانۆ بوون بەسەر بەفرەکەدا فڕکەیان دەهات و خەمی نوقم بوونیان نەبوو. کوردەکان نێزیکەی پەنجا کەسێکیان لە لەشکری دوژمن داپاچی.

حوسێن خان بیری لەوە کردەوە چۆن بگەڕێتەوە؛ چونکە سەربازەکانی هیچیان پێ نەدەکرا و نەشیاندەتوانی خۆیان لە شیر و نووکە نێزەی کوردان بپارێزن کە وەکو کەرمۆزی هاوینان لەپڕ بەپیاوەوە دەدەن ون دەبن. شەباب لەم شەڕەدا مێرخاسییەکی نێرانەی نواند، ئاڵقەی کەمەندی لە ملی ئەفسەرێک توند کرد و ڕای پێچا. ئەو کوردانەی کە چەند مانگێ لەوەپێش لەشکری ئێرانی ئازار و چەرمەسەرێیەکی زۆریان دابوونێ، بەشەڕەکەیان زانی و هەموو دەستیان دا چەک و لە لەشکری حوسێن خان وەربوون. لەشکری حوسێن خان بەهەڵاتن و هەزار ئەملا و ئەولا ئینجا لە دەستی کوردان ڕزگاری بوو؛ چونکە کوردەکان لە پەنا و پاسار و بن بەرد و نێو بێشەڵانەکانەوە لەپڕ لێیان ڕادەپەڕین و دەیانکوشتن. ئیدی حوسێن خان لە نێو ئەو بەفر و بەستەڵەکانەدا هیچی پێ نەدەکرا، سەربازی کورد وەدوویان دەکەوتن و چنگ لەسەر شان ڕاویان دەنان و نێرانە دەستی خۆیانیان لێ دەوەشاندن تا گەیاندیاننە ڕەشایی و پاشان گەڕانەوە.

وەختێ حوسێن خان گەیشتە نێو شار هێشتا زەردەپەڕ مابوو، هەتاو پەنجەی لە گومەز و منارەی مزگەوتەکان دەدا و وەکو زێڕ دەبریقانەوە.

حوسێن خان بەخۆی و چەند سوارێکییەوە بەرەو دەرگای ماڵی شای ئاژۆت و بەردەستییەکانی خەبەریان بە شا عەباس دا، کە حوسێن خان لە

شەڕ گەڕاوە.

شا عەباس لە بەردەسییەکانی پرسی:

– حوسێن خان بەتەنیایە؟ یا دیلیشی پێیە؟

– نەخێر، تەنیا حوسێن خان خۆی و پاسەوانەکانی گەڕانەوە. دیل و میلیان پێ نییە.

– دە ڕێگای بدەن با بێتە ژوورێ. حوسێن خان کە هاتە ژوورێ بۆ بەر بارەگا، شا لەسەر تەختی شاهەنشاهی دانیشتبوو. حوسێن خان وەکو هەموو جارێ ئیکلامی بۆ شا کێشا.

شا عەباس جێگەی بۆ حوسێن خان دەستنیشان کرد و چوو دانیشت، شا پرسی:

– بڵێ، بزانم چت کرد؟

– شا پایەدار بێ، ڕێگاکەمان تا دەشت و ڕاست و ڕەوان بوو کارمان باش بوو، بەڵام کاتێ گەیشتینە لاپاڵی چیاکان، ئیتر هەموو بەفر و سەهۆڵ بوو ڕێگاوبان بەئاستەم بەدی دەکرا. زۆر جار ڕێگامان ون دەکرد و سەرمان لێ دەشێوا و خۆشمان نەماندەزانی بەچ لایەکدا دەڕۆین. من سوتۆ بەگی کوردم لەگەڵ خۆ بۆ ڕێ بەڵەدێ بردبوو.

– وەڵڵا بیرێکی باشت کردووەتەوە، ڕەنگە چاک کۆمەکی کردبیت و ڕێ بەڵەدییەکی باشی بۆ کردبیت، چونکە ئەو کوردە هەموو کون و کەلەبەرێکی ئەو وڵاتە بەڵەد و شارەزایە.

– نا، شا پایەدار بی، غایەنەتیی لێ کردین.

– «چۆن؟» شا عەباس بە سەرسامییەکەوە پرسی: «سوتۆ بەگ چۆن غایەنەتیی کرد».

– بەڵێ قوربان غایەنەتیی لێ کردین، لەو نێو چیایانەدا ڕۆژێکیان بانگم کرد گوتم: «سوتۆ بەگ ئەمانە چیای تۆن و تۆ خۆت لێرە گەورە بووی هەموو گەلی و دەرە و دۆڵ و کون و کەلەبەرێکی بست بە بست شارەزایت

بەڕێگایەکی کـورت و قــەدبڕدا بمانبــە زوو بگەینە قــەڵا.» ئەویش گــوتی: بەســەرچاو، بەڕێگـایەکی واتان دەبەم کـە بەزووترین کـات بگەینە قـەڵا. ئـیتـر ســوتـۆ بەگ وەپێش لەشکـر کـەوت، بەڵام بەقــەسـتی بـەگـەلی و جـێگەی وا سەختیدا دەبردین کە سەربازەکان بەحاڵ لێی دەرچوون. چەند جارم بانگ کـرد کـەچی هـەر دەیگوت: «تۆ دڵنیـا بە» تەنانـەت جـارێکیـان گـەیاندینیـیـە جـێگەیەک کــە ئیــدی نەمــاندەتوانی نـە بەلای ڕاســتــدا و نـە بەلای چـەپدا هـەنگاوێک هـەڵێنینەوە، ئیتر بەمە غایەنێتییەکەی ئاشکرا بوو.

حـوسێن خـان سـەری سـوتۆ بەگی لە تا خـورجـێک دەرێنا و لەبەردەمی شـا عەباسـدا داینا، دەموچاوی سـوتۆ بەگ شـتێکی زۆر ناحـەز و دزێو بوو، چونکە کـوشـتنی خـۆی بـەچاوی خـۆی دیتـبـوو. لەبەرئـەوە کـابـرا بەجـارێ بـووبوو بەعـیـبرەت. دەمی کـرابووەوە و خـوار ببـوو، چەناگەی گـێـڕ و گـەوێڕ بووبوو، چەند تاڵێک لە ڕیشی ڕزیـبوو بەحـاڵ دیار بوو، چاوی ئەبڵـەق بووبوو، پیاو کـە تەمـاشـای سـەری دەکـرد سـامی لێ دەنیـشت، جگە لەمـەش بۆگـەنی سـەگی تـۆپیــوی لێ دەهـات. بەڵام شـــا عـــەباس لـە دیمەنـی ســـەری ســـوتۆ بـەگ نەسڵـەمییـەوە و بە شـتێکی زۆر خـواسـاییی زانی، چونکە گەلێ سـەری بڕاوی وای دیتبوو کە بەفەرمانی خۆی خاوەنەکانیان کوژرابوون.

شـا بەو پەڕی خـوێن ساردییـەوە سەری سـوتۆ بەگی بەدەستـەوە گرت و ئەم دیو و ئەو دیوێکی پێ کرد و تێی ڕوانی، هـەر ئەوەندەی گوت:

– تۆ لە نـاهـەق ئەو سـەگـەت کوشـتـووە، چونکە هـێشـتـا هەر بەکـارمـان دەهـات. بەڵام نەکەن بەکوڕەکەی بڵێن کە باوکی کوژراوە.

– باشـە ئەی چی پێ بڵێین؟

– بڵـێن وەختـێ لە پێش لەشکرەوە دەڕۆیشت، دنیا تەمـومژ بوو، کـڕێوە و با و بۆران بوو لـە پڕ لە بەرزاییـیـەکـەوە کـەوتـە خـوارێ و تەمـەنی درێژی بە تۆ بەخشی.

حـوسێن خـان دیسان ئیکلامـی کێشا و دوعـاخـوازیی لە شـا کرد و گـەڕاوە

بۆ ماڵی خۆی.

ئەوێ ئێوارێ شا عەباس بڕیاری دا کە بەهەر جۆرێ بێ لە ئاخر و ئۆخری بەهارێ لەشکر بنێرێتەوە سەر قەڵای دمدم.

ڕاستە، شا عەباس تازە زاوا بوو، زلێخا خانی چواردە ساڵی کچی شای ئەفغانی هێنابوو، بەڵام هێشتا دڵی لە فەیزە خانێ سارد نەبووبووەوە، حەزی بە دیدەنیی کوڕەکەی دەکرد. هەستا چووە حەرەمسەرای فەیزەخان. لەو کاتەدا فەیزە خان کوڕەکەی لە باوەشدا بوو مەمکی دەدایێ. لە پڕ دەرگای حەرەم کراوە، فەیزە خان کە ئاوڕی داوە تەماشای کرد شا عەباس دەم بەپێکەنینەوە هاتە ژوورێ، هیچ دەنگی نەکرد، وەکو جاران بەخێرهاتنی نەکرد، تەنیا هەر لەبەری هەستا بەڵام پشتی تێ کرد.

شا عەباس هەرچەندە زلێخای چواردە ساڵانی بەسەر هێنابوو، بەڵام فەیزە خان شا عەباسی هەر خۆش دەویست، چونکە شا عەباس هەر لە سەر داو و دەستووری باو و باپیرانی دەڕۆیشت. شاکان ژنیان زۆر دەهێنا، بەڵام لەوەتەی شا باوی بۆ شەڕێ ناردبوو، بەتەواوی دڵی سارد بووبووەوە و نەیدەدواند. شا عەباس دەیزانی فەیزە خان لەسەر باوی لێی تووڕە بووە و تۆراوە.

هەرچەند دەیبینی خۆی لێ دەشاردەوە. شا عەباس فەیزە خانمی زۆر خۆش دەویست، چەند مانگ بوو نەیدیتبوو، قسە خۆشەکانی نەدەبیست، ئێجگار بۆی بە پەرۆش بوو، ویستی بەر بکا بەلایەوە، دیسان ڕووی خۆی لێ وەرگێڕا، شا لە دڵی خۆیدا گوتی: «پەرییە... حۆرییە، وەڵڵا باوە من ناهەقم».

لێی نێزیک بووەوە و دەستی لە ملی کرد و پاشان گەردنی ماچ کرد، گوتی:

– ڕووناکی چاوم من دەزانم لەسەر باوت لێم زویری و دڵت شکاوە، بەڵام شوکور باوکت بە ساغ و سەلامەتی گەڕاوە.

– هەی هوو، هەی هوو، من هێندە بەختەوەر نیم، ئەگەر بەختەوەر بووما باوکم کوڕێکی دەبوو و بەم ئاخری پیرییەی ئەم هەموو کڵۆڵی و دەردی

سەرییەی تووش نەدەبوو، خوا دەزانێ چیی بەسەرهاتووە، ئاخۆ ئەو کوردە بیانییانە دەردەکەی قولی خان چییان بەسەر هێنابێ، کە تەرمەکەشی دەست خاوەنی نەکەوتەوە.

– بە حەزرەتی عەلی ئێستا زۆر نییە باوکت لەلام بوو گەڕاوە بۆ ماڵ، فەیزە خان کە بیستی باوکی بەسەلامەتی گەڕاوە، ئینجا بەری بە لاوە کرد، بەزمانێکی شیرین و ناسک گوتی:

– ئەی بۆچی پێت نەگوتم هاتبام دیبام.

– لە ڕێگای دوور گەڕابووەوە زۆر ماندوو بوو، من خۆم ئیزنم دا.

– وەڵلا سا من پاش ئەوەی ڕۆستەمی کوڕم تێر شیر دەکەم دەچم بۆ دیدەنیی باوکم.

شا عەباس فەیزە خانی نازداری لە باوەش کرد و بە دڵێکی شادەوە ماچی کرد، پاشان بەسەر کوڕەکەیدا شۆڕبووەوە، گوتی:

– کوڕم لەو باوەڕەدام کە تۆش وەکو ڕۆستەمی زاڵ بیت.

کاتێ شا عەباس ئەم خۆزییەی کێشا فەیزە خان ئەو قسەیەی بە بیر هاتەوە کە باوکی جارێکیان بە نەوەکەی گوتبوو: «خوا زووت پێ گەیەنێ بەڵام نەک وەکو باوکت».

شا عەباس لێی دا ڕۆیشت، فەیزە خان کوڕەکەی تێر مەمک کرد و خستییە نێو بێشکە زێڕینەکەیەوە و داپیرەکەی تەمێ کرد ئاگاداری بێ و چوار کەنیزەکەیشی لەگەڵ خۆیدا برد و چوو بۆ ماڵی باوکی.

***



بەشی دەیەم

# هێرش بۆ سەر قەڵا

جەژنی (تێ بەردانی) خۆشەویست لەمێژبوو بەسەر چووبوو، مێگەل و ڕانە پەز ئیدی هاتبوونە سەر ئەو چیا بڵندانەی کە لەوەڕیان خۆش بووبوو و شینایییان زۆر و مشە بوو و تا چۆکان دەهات. ئەو بەرخە ساوایانەی کە لە ڕۆژانی «تێ بەردان»دا تازە پێرەوکە ببوون و هێدی هێدی وەدووی دایکیان دەکەوتن، گەورە بووبوون و هەر یەکە هێندەی کاوڕێکی لێ هاتبوو و بەحاڵ لە دایکی جوێ دەکرایەوە. زۆر کەس ئەو جێژنەی لە بیر چووبووەوە، تەنیا جحێڵ و لاوان وەبیریان دەکەوتەوە کە چۆن لەو ڕۆژە خۆشانەدا، لە گۆوەند و شایی و ڕەشبەڵەکدا دەکەوتنە دەستی دڵدارەکانیانەوە و بەدزییەوە قەول و قەراریان بەیەک دەدا و پەیمانیان نوێ دەکردەوە کە تا مردن یەکتریان لە بیر نەچێتەوە.

یەکەم مانگی هاوین بەسەرچوو بوو، خەڵک پەلەیان دەکرد گیا و گۆڵ بدوورنەوە و هەر لە ئێستاوە دەبار و ئازووقەی زستانێ بۆ ئاژەڵ و وڵسات دانێن. ماڵی خانۆش خەریکی گیا دوورینەوە بوون. هەر پێنج کوڕەکانی لەگەڵ چل خولامدا لەو چیا و زوورگانە گژوگیایان دەدوورییەوە، بەلام سەیفەدینی کوڕە گەورەی هەمیشە لەگەڵ باوکیدا بوو و لە ڕۆژی لێقەومان و شەڕ و شۆڕی زۆر سەخت و چەتووندا بستێ لێی جوێ نەدەبووەوە، باوکی هەمیشە خەریکی بوو فێری شارەزایی و بەڵەدی و فەند و فێڵی شەڕی دەکرد، فێری ئەوەی دەکرد کە چۆن مەزنایەتیی هۆزەکەی بکا، چۆن یەکێتیی بپارێزێ،

چۆن سەرۆک هۆز و تیرەکان و گەورەکانی مەجلیس و دەمڕاست و ڕیش سپییەکان بکا بە ئەنگوستیلەی پەنجەی و مەزنایەتییان بکا، چۆن کێشە و ناکۆکی و ئاڵۆزیی نێو هۆز و تیرەکان چارەسەر بکا و چۆن دادپەروەریش بێ.

خانۆ هەندێ جار دەیگوت:

– لاوۆ، دادپەروەری شتێکی یەکجار گەورە و چەتوونە؛ چونکە ئەگەر هاتوو یەکێکت سزا دا دەبێ سزاکەی هێندە ڕەوا و پڕ بەپێستی بێ کە گوناهبارەکە خۆی پڕ بەدڵ هەست بەوە بکا کە تۆ چاکی دەرۆست هاتووی.

سەیفەدین خۆیشی لە هەر پێنج براکەی و هەموو جحێڵەکانی بەرۆدار وریاتر و زرنگتر بوو، باوکی لە کن مەلا ڕەشید لە بەرخوێندنی دانابوو، قورئانی پێ خەتم کردبوو. فێری زمانی فارسی و خوێندنەوە و نووسین بووبوو. زۆرجار کەوتبووە نێو شەڕی گەورە و گرانەوە و لەو شەڕانەدا چەند کەڵەمێردایەتی و ئازایەتییەکی نواندبوو. لە نێو هۆز و خێڵەکاندا بە لاوێکی بێ خەوش و چاونەترس و بەجەرگ ناوی دەرکردبوو. ڕیش سپی دەیانگوت:

– سەیفەدین مەگەر هەر لە خۆی بێ جێگەی باوکی بگرێتەوە.

ئەو ڕۆژانە هەتاو هێندە گەرم و خۆش بوو، هەرچی گیا و گوڵێکیان دەدرووەوە دەستبەجێ وشک دەبووەوە و ئینجا گورزە گورزە لە نێزیک گۆم و تەویلەکانەوە لە لۆدەیان دەکرد.

پەز و وڵاخ ئیدی کۆک بوون، خەڵک خەریک بوون دەست بەحەیوان فرۆشتن بکەن. خانۆ هەموو ساڵێ لەم دەمەدا پەزی خۆی بۆ وڵاتی دوور دەبرد و لەوێ دەیفرۆشتن، بەڵام ئەم ساڵ کڕیار لە هەندەرانڕا خۆیان هاتبوون پەزەکان بکڕن. خانۆ خۆی کۆکردەوە لەگەڵ کڕیارەکاندا بۆ نێو پەزەکان بچێ لەو چیایانە. بەڵام لە پڕ جاسووس لە شاری تارانەوە خەبەریان هێنا کە شا عەباس لەشکرێکی گەورە و گرانی ئامادە کردووە و بەم زووانە بۆ سەر قەڵای دەنێرێ. ئەم خەبەرە شوومە وەکو زەریان لە نێو خەڵکدا بڵاو بووەوە. ئەوەی دەستی چەک بگرێ خۆی بۆ شەڕ ساز کرد. هێشتا بەیانی بوو، پەیکی خانۆ

بەنێو هەموو هۆز و خێڵەکاندا بڵاو بوونەوە و بانگی سەرۆکەکانی هەر چل و چوار هۆزەکانیان کرد. سەرۆکەکان هەموو بە چەک و پیاوی لێهاتوو و خولامی خۆیانەوە لە قەلای دمدم کۆبوونەوە. ئەوێ ڕۆژێ دیوەخان وا پڕ بووبوو جێگەی یەکێکی دیکەی تێدا نەدبووەوە و زۆر کەس بەپێوە ڕاوەستابوون، جەوزۆ و ئەسۆی لاکان و هەمزە چاوەش و پۆستۆ و قارەمانەکانی دیکە هەموو بەتەنیشت خانۆوە دانیشتبوون.

خانۆ ڕووی لە مەجلیس کرد، گوتی:

– ئێوە وا دەزانن کە بۆ کاروباری هۆزەکان بانگم کردوون؟

– نا، قوربان، ئێمەش ئەوەمان بیستووە کە شا عەبباس دیسان لەشکرێکی گەورەمان دەنێرێتە سەر– ئەم قسانە لاوێکی خوێن گەرم کردی.

خانۆ گوتی:

– پار پایزێ بەچاوی خۆتان دیتتان دوو جار لەشکری لێ کردین، بەڵام پشت بەخوا تێکمان شکاندن و لە خاکی خۆمانمان وەدەرنان، ئێستاش وا جارێکی دیکە خەریکە لەشکرمان لێ دەکا. بەڵام ئەم جارە، بەقسەی جاسووسەکانمان، لەشکرەکە لە کێشدا نییە و یەکجار گەورە و گرانە و چەک و جبەخانەکەی لە وزەدا نییە. دەڵێن، ئەم جارە تەنیا هەر سوارە نییە، پیادەیەکی بێشوماریشی لەگەڵدایە.

مەجلیسەکە هەموو کڕبوون گوێیان لە قسەکانی خانۆ گرتبوو و لەوە باش گەیشتبوون کە لە بارێکی زۆر دژوار و چەتووندان، چونکە بەقسەکانی خانۆدا دیار بوو، هەموو قسەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرا دەکرد و یەک دوو جاری دووپات دەکردەوە و سەیرێکی کۆڕەکەی دەکرد. کۆڕەکە شارەزای ڕەوشتی خانۆ بوو و جۆری گفتوگۆ و دەمودوویان هەریەکە لە باری خۆی و قافی خۆیدا هەڵدەسەنگاند و دەیانزانی چ دەڵێ.

هەرکە خان لە قسەکانی بووەوە یەکێ لە جەماوەرەکە هەڵی دایێ، گوتی:

– لە وڵاتی ڕۆم، وەختێ لەوێ بووین، هەموو ساڵێ ڕۆم لەشکری لێ

دەکردین، ئەوەبوو ناچار هاتینە ئێرە، لێرەش وا شای ئێرانێ ئەم بەزم و ڕەزمەمان پێ دەکا. وا دیارە نیازیان وایە لە ڕیشەمان دەربێنن و هیچمان نەهێڵن، بەڵام تا یەکمان بمێنێ دەبێ هەر شەڕ بکەین، بەڕاستی مردنمان لەم حاڵە چاکترە.

ئەو ڕۆژە لە بازاڕی قەڵای دمدما، لە مەیدانی ئاژەڵ و وڵاخ فرۆشتندا، لە خانەکاندا لە دووکان و کۆڵانەکاندا، خەڵک هەموو فسک فسک و چرپە چرپیان بوو و باس باسی ئەو لەشکرە گەورە و گرانە بوو کە بەرەو قەڵا بەڕێ کەوتبوو. هەندێ دەیانگوت: «خەڵک بەچاوی خۆیان دیویانە کە لەشکرەکە دوو ڕۆژە لە تارانەوە بەڕێ کەوتووە، بەڵام هێشتا دواییەکەی لە شارە و خەلاس نەبووە».

نیوەڕۆ بوو. خەڵک بۆ نوێژی نیوەڕۆ لە مزگەوت کۆبووبووەوە. مەلا ڕەشید لەسەر منارەکە دابەزی، هێشتا نوێژ دانەبەسترابوو گوتی:

– ئەم شەڕە شەڕی دوژمنی ئاینە، شا عەباس نیازی وایە لە ئاینی سونییەتیمان وەربگێڕێ و شیعەیەتیمان بەسەردا بسەپێنێ، هەرکەسێ لە پێناوی ئاینی خۆیدا شەڕ بکا و لەو شەڕەدا بکوژرێ شەهیدە و بەهەشتییە.

جەماوەرەکە هەموو سوێندیان خوارد: کە لە پێناوی ئاینی خۆیاندا، لە پێناو نیشتمانی باو و باپیرانیاندا سەری خۆیان دابنێن و وڵاتەکەیان لە دوژمن بپارێزن.

خان زۆر چاکی دەزانی کە دوای هەردوو شەڕەکەی پایز و کوشتنی قولی خان و قڕانی لەشکرەکەی ئێران، شا عەباس هەروا بەسانایی واز ناهێنێ و هەر وەختێ بێ بەسەریاندا دەدەن و ئەو تۆڵەیەیان لێ دەکەنەوە. جا سەبارەت بەمە، خانۆ هەر لە پایزەوە فەرمانی دابوو کە لە کارگەکاندا بەپەلە چەک ساز بکەن: نەجاخ، شیر، مەتاڵ، تیروکەوان، کۆسە میسری و گورز و کەمەند و پشتوو دروست بکەن. کارگەی پشتوویان ساڵێک بوو دامەزراندبوو. وەستای پشتوو کوردێکی پیری حەفتا هەشتا ساڵەی خەڵکی سلێمانی بوو، خانۆ

بانگی کرد، لێی پرسی کار لە چ ڕادەیەکدایە، وەستا بەڵێنی دایێ گوتی:

– قوربان من خەلیل نەبم، ئەگەر خۆم و هەردوو کوڕەکەم شەو و ڕۆژ لێک نەدەین و پشتوو بۆ سەربازەکانت ساز نەکەین. من هەر تکای ئەوەتان لێ دەکەم کە چەند پیاوێکم بۆ بەردەستی بدەنێ و تا دەشتوانن ئاسن و پۆلام فریاخەن.

بەفەرمانی خانۆ دە پیاوی شارەزا و زیرەک خرانە ژێر دەستی وەستا خەلیلەوە و دەست بەکار کرا.

پاش ئەم خەبەرە بەدووم و شوومە ورد و درشتی خێڵی بەرۆدار بیریان لەوە دەکردەوە کە تا دوا هەناسە خاکی خۆیان لە دوژمنی زۆردار بپارێزن و نەهێڵن داگیری بکەن. هەندێ چەکیان لە کن وەستای دیکە بەڕادان دەدا. وەستایەک لەمێژبوو، لە دیاربەکرەوە هاتبوو، ناوی وەلی بوو، زرێی چاکی دروست دەکرد. شەباب چووە کنی، گوتی:

– هاپۆ وەلی، دەمەوێ زرێیەکی چاکم بۆ دروست بکەی.

وەستا وەلی هەستا سێ زرێی لە سندووقێک دەرهێنا و لە پێش شەبابی دانان. شەباب یەکیانی لەبەرکرد. کەمێ بەلەشە زراو و ناسکەکەی گەورە و دەڵب بوو، گوتی:

– هاپۆ وەلی، دەمەوێ زرێیەکی نوێم بۆ دروست بکەی، ئەمە بەتەنگە و بەژنم گەورە و دەڵبە.

وەلی گوتی:

– وەی بەسەرچاوان شۆڕە سوارەکەم، هەر پاش چەند ڕۆژێکی دیکە زرێیەکی پڕ بەبەری خۆتت بۆ دروست دەکەم. بەڵام بستێ درێژتری دروست دەکەم.

لەوەتی هەمزە چاوەش هاتبووە قەڵای دمدم بۆ کن خانۆ، تەنیا هەر سەربازی مەشق نەدەدا، بەڵکە لە ماوەی ئەو چەند ساڵانەدا، سوپایەکی ڕێکوپێک و لەباریشی لەسەر شێوەی سوپای ڕۆم پێکەوە نابوو و سەدلک و

تابوور و بلووک و ئۆردووی چاکی لێ ساز کردبوون.

چەندین ڕۆژ بوو، لە هەموو ناوچە و قەزا و گوندەکانەوە سوارە و پیادە بەرەو قەڵا دەهاتن. بەستەکەی پێشێ هێندەی خەڵک لێ کۆبووبووەوە دەرزیت هەڵدابا وە زەوی نەدەکەوت، ئەو ناوە بووبوو بەئۆردووگایەکی گەورە و گران و شەو و ڕۆژ ژاوەی دەهات:

هەندێ بێ چەک بوون، دەپاڕانەوە چەکیان بدرێتێ و بەفەرمانی خانۆ چەکیان دەدرایە و بەزۆری بەو کەسانە دەدرا کە لەگەڵ سەرەک هۆزەکانیاندا هاتبوون.

چەکەکان هەریەکە لە ڕەنگێ بوون، هەندێ هۆز نەجاخ بەدەست بوون، هەندێ بەتیر و کەوانەوە، هەندێ شیر و مەتاڵیان پێ بوو، هەندێ ڕمبیان هەڵگرتبوو. ئەو چەکانەی کە تازە کوورەبوون لە بەرهەتاو دەچریسکانەوە. خانۆ بەخۆی و دەستە و دایەرەیەوە بەنێو خەڵکەکەدا دەگەڕا و لە سەرۆکەکانی دەپرسی: «چەند پیاویان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە؟» کاتب و دەفتەردار دەیاننووسی، ئەوەندە چەک لە فلانە جۆر بەسەر فیسارە هۆزدا دابەش کراوە و ئەوەندە جۆری دیکە بەسەر فلانە هۆزی دیکەدا دابەش کراوە.

کاتێ خانۆ لە ناو خەڵکەکە وەدەرکەوت و بەرەو ئۆردووگاکە ڕۆیی، سەیری کرد لە خوار بنارەکەوە لە کەنار گەلییەکە، تابوورێ ژن بەتیر و کەوانەوە وەستاون. چەند هەنگاوێ لەولاوە ژنێکی سەرە وەستابوو، ئەم ژنانە دەتگوت هەمزە چاوەش مەشقی پێ کردبوون، ژنە سەرەکە تیر و کەوانێکی لە مل کردبوو و شیرێکی کورتی جوانیشی بەلای چەپیەوە کردبوو و لە خانۆ ڕامابوو، وەختێ خانۆ کەمێ لێیان نێزیک بووەوە، لە پێشدا ژنە سەرەکە ئەنجا، هەموو ژنەکان ملیان کەچ کرد و ئیکلامیان بۆ کێشا. خانۆ گوتی:

– ئافەرم، کچەکانم، ئافەرم. ئەمڕۆ ڕۆژی غیرەتە، پێویستە گەورە و بچووک چەک هەڵگرن و نیشتمانی باو و باپیران لە دوژمنی زۆردار بپارێزن.

جەوزۆ کە ڕوانی خانۆ هاتە کن تابووری ژنان بەلەز بەپیرییەوە چوو و

ئیکلامی بۆ کێشا ئەنجا ڕەق ڕاوەستا، گوتی:

– سەرباز ئامادەبن.

خانۆ لە جەوزۆی پرسی:

– جەوزۆ ئەم تابووره ژنە کێ وا سازی کردوون؟

قوربان، بەڕاستی، هەمزە چاوەش ئەم کارەی بەمن ڕاسپارد و من سازم کرد. ئەو ژنەش کە سەرۆکایەتییان دەکا ژنی پزیشکەکەی خۆمانە کە پار پایزێ سەربازی ئێران مێردەکەشی و کوڕەکەشیان کوشت. ئەم ژنە لە پێشدا ویستی ببێ بە سەرباز، بەڵام هەمزە چاوەش گوتی:

– وەختێ لە نێو لەشکری ڕۆمدا بووم و لەگەڵ هەندەراندا شەڕمان دەکرد، زۆر جار ژنانمان لێ ڕادەپەڕین، شەڕێکی بەترەفیان دەکرد. منیش گوتم ئەم ژنە با بڕوا تابووری ژنان پێک بهێنێ.

– بەڕاستی ئەمە کارێکی زۆر چاکە، بەڵام گەلی براینە – خانۆ پرسی – تۆ بڵێی تیروکەوان هاوێشتنیان لە دەست بێ؟

– من یەکێ لە کۆمەکدارە شارەزاکانی خۆمم هەڵبژاردووە، ئەو دەچێ فێرە تیر هاوێشتنیان دەکا، دوێنێ خۆم چووم بەسەرم کردنەوە.

بەڕاستی ئەم ژنانە تیروکەوانیان هێندە چاک و چاپوکانە داوێشت و نیشانیان وا دەپێکا لە تۆ وابوو هەرلە مەشقی تیر هاوێشتندا وەختیان بەسەر بردووە. لێم پرسین:

– «لە کوێ فێربوون؟» یەکێکیان گوتی: «براله، ئەی نازانی ئێمە لە هەڕەتی کچێنیدا کوڕوکاڵ پەڵپیان لێ دەگرتین: کام کچ نیشان چاک دەشکێنێ. ئێمە لەو سەردەمانەوە فێری تیربازی بووین».

خانۆ لە لەشکرەکە نێزیک بووەوە، تەماشای کرد، تابوور تابوور و بلووک بلووک ڕیزبوون. هەر تابوور و هەر بلووکێ سەرکردەی خۆی لە پێشەوە بە ویقارەوە وەستاوە. خانۆ کە چاوی بەو ڕێکوپێکییان کەوت گوتی:

– با سەربازەکان تێ پەڕن بیانبینم.

لە پێشدا تیپی ڕمب بەدەست ڕەت بوون، ڕمبەکانیان هەر ئەوێ ڕۆژێ لە جبەخانە دەرهێنابوو و تازە بەسەریاندا دابەش کرابوون. سەریان لە بەر تیشکی ڕۆژ دەبریقاوە و هەر یەکە قۆتکێکی سووری پێوەبوو و هێندە ئاڵ بوون لە دوورەوە دەتگوت خاشخاشن و لە مێرگدا گوڵیان گرتووە. کوڕینە داخۆ دەست و پەنجەی چەند کچۆڵە و بووک و نەوجوان شەو و ڕۆژ لە کاردا بووبن تا ئەم قۆتکانەیان بەم جوانی و نایابییە چنیبێ، پاش ڕمب بەدەست، تیپی تیروکەواندار تێ پەڕین، ئینجا شیر و مەتاڵ هەڵگر، لە پاشان نەجاخ بەدەست و دوای ئەوان کۆسە میسری هەڵگر و لە پاش هەمووان تیپی گورز و کەمەند بەدەست ڕەت بوون. گەلێ لەو گورز و کەمەند بەدەستانە ناسیاوی خانۆ بوون، چونکە خانۆ زۆر جاران لەگەڵ خۆیدا بۆ شەڕی ئێرانێی بردبوون. ئەمانە کەسی وایان تێدا نەبوو کە گورزی بەفیڕۆ بڕوا و بەر دوژمن نەکەوێ و کەسی واشیان تێدا نەبوو گورزی دوژمنی بەرنەکەوتبێ. بەدەستووری شۆڕەسوارانی کورد بەدوو ڕیز بەرەنگاری یەک بوون و گورز و کەمەندەکانیان چەپ و ڕاست هەڵدەبڕی و ڕایان دەوەشاند، دەتگوت هەر بەڕاستەقانی وەنێو دوژمن کەوتوون و بەچەپ و ڕاستدا قڕیان دەکەن.

خانۆ زۆر کەیفساز بوو، لە جەوزۆی پرسی:

– جەوزۆ هەر هێندەتان سەربازی گورز و کەمەندار هەن؟

– ماقووڵ، ئەی جەنابت خۆت پار ناپێڕارێ نەتفەرموو: «لە باتی گورز و کەمەند دەست بەپشتوو ساز کردن بکەن». ئێمەش ئەوەبوو فەرمایشتەکەی جەنابتمان بەجێ هێنا و تەنیا لە پایزی ڕابردووڕا دەستمان بەگورز و کەمەندسازی کردووە، ئەوەش سەبارەت بەوە کە کەسێکی وامان دەست نەکەوت کە ئەم جۆرە چەکەمان بۆ دروست بکا، یەکێ لە ئامێدییەوە هاتووە، کوردە. ئەویش نەخۆشە. بەڵام ئەو گورز و کەمەندەی ئەو دروستی دەکا، بێ خەوشە و دەڵێن:

«گورز و کەمەندەکانی زۆر چاکن، بەر هەرچی بکەوێ هوورد و خاشی دەکا».

– باشـە، چەند جحێڵێکت لەبەردەس داناوە کە بەهرە لـە دەس و سنعاتەکەی وەربگرن؟

– بەڵێ چوار لاوی وریا و زرنگم لە بەردەس داناون.

وەستـاکە خۆشی زۆریان لێ ڕازییـە، بەڵام لێت ناشـارمـەوە جحێڵـەکانمان حەز لە گورز و کەمەند ناکەن.

– بۆچی حەزی لێ ناکەن؟

– دەڵێن: «بـەم جـۆرە چەکـە دەتوانرێ هـەر پیـاوی گـۆڕ خـۆیرِیلـە بکوژرێ، ئێمە پشتوو و تیروکەوان و شیر و مەتاڵمان گەرەکە؟».

هـەروا لە خـــوارەوە، لـە بەردەمـی دەبـۆتخــانـەدا لـەپڕ بـوو بەقــرِە و هـەرا، دەتگوت شـەڕە و خەڵک بەگژ یەکدا دەچن. دیاربوو خەڵکەکە دەبۆوانیان وەگیر هێنابوو داوای چـەکـیــان لێ دەکــرد و ئەویش وێـی نەدەدان. لاوێکی کــەتەی تێکسـمـرِاوی چوارشـانە بـەرەو ڕووی دەبۆوان دەهـات و دەسـتـە زلەکـەی لەپی وەک لەپی ورچ دەچوو ڕادەوەشاند، دەیگوت:

– ئـەی ئەم چـەکـــانـەتان بـۆ کێ دروست کـــردووە؟ چەک بـۆ ڕۆژێکـی وا و مەمـانان نەبێ ئەی بۆ کەی و بۆ کێیە. دیارە تۆ وات نیـازە کە لەشکری ئێران وەکو پار دیسان بەسـەرمـاندا بدەن و قرِمـان بکەن؟ ئێـمە بۆ ئەوە هـاتووین کـە تۆڵەی کۆن و نوێمان لە لەشکری ئێران بکەینەوە.

پیاوێکی کامڵ لە نێویاندا بوو، لاوەکەی ساردکردەوە، گوتی: ئێـرە جێی قرِە و هـەرا نییە، وەرە بچینە خزمەت خانۆ، ئەو خۆی چەکمان دەداتێ.

خـانۆ کە قـرِە و هەراکەی بیسـتـەوە، هات بۆ کنیـان، کـاتێ لە دەبۆتخـانـە نێـزیک بووەوە، جحێڵـەکـان دەرگـەی دەبۆتخـانەکـەیان چۆڵ کـرد و درِیان دا و کشانەوە چوون لەولاوە وەستان.

یەکێ لە جحێڵـەکان کە کـەمێ بەتەمەن بوو و شـەعری دەوری کۆڵۆسـەکەی هێندە کۆن بووبوو، بەجارێ شـیـتـاڵ بووبووەوە و لەبری ڕیشـوو بەسـەر دەم و ڕوویدا شـــۆڕ بووبووەوە... کــورِە بەرەو خــانۆ هـات ئیکلامــێکی وای بـۆ کـرد،

دەتگوت، بەدرێژاییی ژیانی لە خزمەت میر و گزیراندا پێ گەییوە. خانۆ پرسیی:

– ئەم قرە و هەرایەتان لەسەر چییە، بێژن؟

– قوربان ئەمە حاڵە؟ ئێمە هەموو خەڵکی گوندەکانی خواروویین و بێ چەکین، پایزی ڕابردوو لەشکری ئێران پیاوێکی زۆری لێ کوشتین، کوڕیان کوشت، باوکیان کوشت و گەلێ کاری ناڕەوا و دزێویان بەسەر هەندێ هێنا. خولاسە ماڵ نییە زیانی لێ نەکەوتبێ. ئێمە بۆیە هاتووین سەرمان لە پێناوی وڵاتدا بەخت بکەین، بەڵام بەداخەوە دەستەواڵاین و دەبۆوانەکەی جەنابیشتان چەکمان وێ نادا و دەڵێ: «چەک بۆ ئێوە نییە». قوربان کار وا دەبێ؟ ئەی ناڵێن: «ژمارەی دوژمن لە کێشدا نییە و ئێجگار زۆرە؟».

لاوەکە ئەم قسانەی بەدەنگێکی خەماوی و دڵشکاوییەوە درکاند. لە پاشان لاوێکی دیکە مێزەرێکی مەلایانەی بەکۆڵۆسەکەیەوە پێچابوو و تازە بەری سمێڵی ڕەش بووبوو، بەبێ ئیکلام کێشان، هاتە پێشێ و بەلەز دەستی بەقسان کرد و گوتی:

– من پار قورئانم لە خزمەت مەلا ڕەشیددا خەتم کرد. خەڵکی گوندەکانی خوارێم. گەورەم شا عەباس جگە لە وڵات داگیرکردن و کوشتارێکی زۆر، دەیەوێ لە بن باندووری خۆیمان بخا.

خانۆ کە ئەمەی بیست، کەمێ بیری کردەوە، پرسی:

– تۆ ئەم قسانەت لە کێ بیستووە؟

– گەورەم، پار پایز، وەختێ لەشکریان هات. قولی خان چەند پیاوێکی پیری لێ بەدیل گرتبووین، بەڵام نەیکوشتبوون، پێی گوتبوون: «ئێوە پیرن، بەزەم پێتاندا دێتەوە، ناتانکوژم، بڕۆن بەکوردەکانی خۆتان ڕابگەیێنن با بێنە سەر ڕێبازی ئێمە».

خانۆ لە پیاوەکانی دەوروبەری خۆی نۆڕی، گوتی:

– خۆ گوێتان لێیە، شا عەباس چیی لێمان دەوێ. جگە لە وڵات داگیرکردن،

دەیەوێ بەزۆر ڕێبازی مەزهەبیمان بەسەردا بسەپێنێ. سا قەسەم بەخوا، تا یەکێکمان مابێ شا عەباس ئەمە بەچاوی خۆی نابینێ.

خانۆ فەرمانی دا تیروکەوانیان بەسەردا دابەش کەن. ئیدی ئێوارە بوو، بەڵام قرچەی گەرمای هاوین هەر هێندە نەبوو خەڵکەکە هەڵنەپڕووکێنێ. چەندین ڕۆژ بوو خانۆ لە بەرەبەیانەوە تا ئێوارێ نەدەسرەوت و هەمیشە بەنێو خەڵکەکەدا ئەمسەر و ئەوسەری دەکرد و ئارەقی دەڕشت، دەستەسڕێکی دەرهێنا دەموچاوی پێ سڕییەوە. ئەنجا لە نێو خەڵکەکە هاتە دەرەوە و بەرەو دیوەخانە چوو. سێ سوار بەرەو کن خانۆیان ئاژۆت، هەر لە دوورەوە دابەزین، دووانیان ئەسپەکانیان گرت و یەکێکیان لە خانۆ نێزیک بووەوە و ئیکلامی بۆ کرد، گوتی:

– ماقوڵ، ئێمە دەبوو بچووباینە تەورێزێ لەوێندەرێ کاری خۆمان جێبەجێ کردبا، چەندین ڕۆژ بوو بەڕێوە بووین. بەڵام کاتێ لە قشلاخی خۆمان بەڕێ کەوتین، زۆری نەخایاند کەوتینە سنووری ئێرانێ و لەشکرێکی وامان دیت کە پێش و پاشی بەدی نەدەکرا و تا دەهات لە سنووری مە نێزیک دەبووەوە.

خانۆ کە ئەم قسەیەی بیست، دەستبەجێ تێ گەیشت، کە دوژمن لە سنوور نێزیک دەبنەوە. ڕاست بەرەو دیوەخانێ چوو و لە دووی سەرلەشکرەکانی هەنارد، جەوزۆ و هەمزە چاوەش و ئەسۆی لاکان و پۆستۆ و ئەوانی دیکە هەموو ئامادەبوون. خانۆ بەپەیکەکانی گوت: چییان دیتووە بۆیانی بگێڕنەوە، وەختێ پەیکەکان قسەکانیان گێڕاوە، خانۆ بە سەرلەشکرەکانی گوت:

– پێویستە پەلە بکەین، لە سەر سنوورەوە پێش دوژمن بگرین و دەرفەتیان نەدەین پێ باوێنە وڵاتەکەمانەوە. جەوزۆ تا زووە تۆ تابوورەکەی شەباب بەڕێ کە، بەڵام پێش ئەوەی بەڕێ بکەوێ با بێ بیبینم.

جەوزۆ فەرمانی خانۆی بە شەباب ڕاگەیاند، ئەویش گورج چوو بۆ کن وەستا و زرێکەی لەبەرکرد و خێرا بۆ کن خانۆ چوو. کاتێ گەیشتە دیوەخانێ

ئیکلامێکی کرد و لە شوێنێکەوە دانیشت. خانۆ کە چاوی بەشەباب کەوت، بە زەردەخەنەیەکەوە تێی ڕوانی و لە دڵی خۆیدا گوتی:

– «بریا هۆزەکەم زۆری وەکو تۆ بان.» خانۆ لەمێژبوو نیشانەی ئازایەتی و مێرخاسیی لە شەبابدا بەدی کردبوو و بۆیەش زۆری خۆش دەویست، پێی گوت:

– شەباب، دەبێ تۆ هەر ئێستا لەگەڵ تابووری خۆتدا بەڕێ کەوی و بچی پێش لەشکری ئێران بگری. ئێستا خەبەرمان وەرگرت دەڵێن: «لە سنووری مە تەواو نێزیک بوونەتەوە»، بەڵام دەبێ جارێ شەڕ نەکەن و کارێکی وا بکەن دوژمن پێتان نەحەسێ، زۆر چاک سەرنجیان بدەن بزانن بەرەو کوێ دەچن، چ جۆرە چەکیان پێیە. دە هەر ئێستا بەڕێ کەوە تا دەتوانی کۆچەڕێ بگرە. بەڵام دەبێ زوو بگەڕێیەوە کنم و لە هەموو شتێکم ئاگادار کەی.

شەباب دیسان ئیکلامی کێشا و گوتی: «ئەمر دەکەی قوربان، سەرم لە ڕێتە، ئیزنم بدە بڕۆم.»

– دە بڕۆ.

شەباب لە دیوەخانەی وەدەرکەوت خانۆ چۆنی فەرمان دابوویێ، دەستبەجێ دەبوو وەپێش تابووری خۆ کەوتبا و چووبا. بەڵام دلبەری بەبیر هاتەوە. دەیویست چاوێکی پێ کەوێ؛ چونکە چەند ڕۆژێ پێش ئەو خەبەرە ناخۆشە دلبەر بە نانێی خوشکی شەبابی گوتبوو لە کن مەلایەکی زانا بازیبەندی بۆ بەڕادان داوە کە بۆی ببێ بە تەلیسم و لە تیر و شیری دوژمنی بپارێزێ. شەباب لێی دا چوو بۆ کن دلبەر، بەڵام هێندە بەتەنگ بازیبەندەوە نەبوو، چوونەکەی زۆری لەبەرئەوە بوو کە چاویان بەیەک بکەوێ؛ چونکە لەمێژبوو یەکتریان نەدیتبوو، شەباب قەت قەت لە خۆیەوە نەدەچووە ماڵی دلبەر، ئەگەر ویستبای ببینێ لەپێشدا نانێی خوشکی دەناردە کن، ئینجا دەچوو، بەڵام ئەو ڕۆژە زۆری پەلە بوو، پێی نەکرا سەری ماڵی خۆیان بدا و نانێی خوشکی بنێرێ، هەندێ بیری کردەوە، گوتی خۆم دەڕۆم لە دەرگەوە

بانگی دەکەم، ئیدی هەستا ڕۆیشت، هێشتا نەگەیشتبووە بەر ماڵیان، کۆڵانێکی مابوو لە ڕێگا خورشیدی تووش بوو. خورشید سڵاوی لێ کرد، بەڵام ئەو وەڵامی نەداوە و لێی مۆڕ بووەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی: «خۆزی ئەم بەهارە لە قشلاخێ تووشم بای، جا هەنگێ دەتبینی چۆنم دەکردی بەمیوانی خاک، بەڵام بەختت بوو، زۆرت لێ گەڕام وەچەنگم نەکەوتی».

خورشید دەیزانی شەباب چەند بە شەرەف و ئابڕووە، ورتەی لە زار نەهات. شەباب کە لە ماڵی دلبەر نێزیک بووەوە، برا چکۆلەی دیت، گازی کردێ، کوڕە هاتە کن شەباب. شەبابی چاک دەناسی، کاتێ لێی نێزیک بووەوە پرسی.

– شەباب چت دەوێ؟

– کوڕی چاک، بەدزییەوە، بچۆ بەدلبەر بڵێ: وەرە شەباب گازت دەکا، جا، پارەت دەدەمێ بۆ خۆت بچۆ خورمای پێ بکڕە.

کوڕە گوتی:

– من پارە لە تۆ وەرناگرم، بەڵام دلبەرت بۆ بانگ دەکەم. کوڕە چووە ژوورێ، هەر دەقیقەیەکی نەخایەند دلبەر هاتە بەردەرگە، سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد، کەس دیار نەبوو، سووک سووک، وەکو مراوی بەرەو کن شەباب هات هێشتا چەند هەنگاوێکی مابوو بگاتە شەباب، گوتی:

– خێرە؟

– خێرە شوکور، ویستم بتبینم، چونکە تابوورەکەم ئامادە کردووە و لەسەر ڕۆیشتنم.

– بۆ کوێ؟

– دەبێ بچم پێش لەشکری ئیران بگرم، هێشتا نەگەیشتووەتە سنووری مە.

– دەی خوا تەختی شا وەرگێڕێ و گۆڕ بەگۆڕ بێ، دیسان ئەمە چەندین ڕۆژە خەڵک دێت و دەچێ و خەو لە چاوی کەس ناکەوێ.

دلبەر، کەمێ کڕ بوو، پاشان گوتی:

– وەی پرچم نەبڕن، جا خۆ دەڵێن لەشکرەکە ئێجگار زۆر و بێ شومارە، تۆ بەتەنیا لەگەڵ تابوورێکدا چت پێ دەکرێ؟

– من بۆ شەڕ ناچم، جارێ بۆ بەسەرکردنەوە دەچم بزانم لەشکرەکە چەند و چ جۆرە چەکێکیان پێیە و لە کوێوە دێن؟

– لێرە گەلێ کچیش چوونە نێو تابووری ژنانەوە، منیش حەز دەکەم هاوبەش بم و بۆ شەڕ بچم، بەڵام دایک و باوکم قایل نین و دەڵێن: «چوار برات هەن، با ئەوان بچن، تۆ بۆ کوێ دەچی؟»

شەباب لە حەژمەتان وەخت بوو باوەش بەدلبەردا بکا، سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد، هەندێ ڕێبوار بەکۆڵاندا ڕادەبردن، شەرمی کرد ئەوە بکا. لەپڕ فەرمانی وەبیرهاتەوە، دوعاخوازیی لە دلبەر کرد، گوتی:

– بەخوات دەسپێرم.

– هەروا زوو دەڕۆی.

– ناتوانم زۆر گیربم، دەبوو زوو لە شار دەرچووبام، هەر بۆ دیدەنیی تۆ هاتبووم.

دلبەر و شەباب هێشتا هەر قسەیان دەکرد، دایکی دلبەر هاتە بەردەرگە، شەباب و دلبەری پێکەوە دیتن، شاد بوو، دایکی دلبەر زۆری حەز دەکرد شەباب ببێ بەزاوایان. نێزیک بووەوە، شەباب وەکو کچان ڕەنگی لە شەرمان سوور هەڵگەڕا، ویستی بڕوا، دایکی دلبەر گوتی:

– وەرە ماڵەوە، بۆچی لێرە وەستاوی؟

– پووری زۆرم پەلەیە، دەبێ هەر ئێستا بەخۆم و لەشکرەکەمەوە بەڕێ کەوم.

– ئێ برۆ. برۆ لاوۆ، بەڵام جارێ وەرە ماڵەوە، چما بەمنداڵی کەم دەهاتی بۆ ماڵی پووری خۆت، دیارە گەورە بووی و ئێمەت لەبیر کردووە.

– نا، پووری ئایشێ، من تۆ قەت لە بیر ناکەم، بەڵام بەخوا، ناتوانم،

بەدوعا.

شەباب ئەم قسانەی کرد و بەلەز ڕۆیشت. هێشتا چەند هەنگاوێ دوور نەکەوتبووەوە، دلبەر بانگی کرد گوتی: «ئا، ڕاوەستە، ڕاوەستە، لە بیرم چوو، بەڕاست خۆ من لە نک ئەو مەلایەی کە لە حەکارییەوە هاتووە، بازیبەندێکم بۆ کردووی، دەڵێن مەلایەکی زۆر زانایە. هەر نوشتەیەکی ئەو بیکا، دەبێتە تەلیسمێ، نە تیر، نە شیر، نە ڕمب، هیچ کار لە خاوەنەکەی ناکا.»

دلبەر خێرا چوو لە ماڵەوە بازیبەندێکی بە نەخش و نیگاری هێنا، لە ژێرەوە لە باڵی شەبابی ببەستێ، شەباب کە باڵی چەپی لە ئۆیمەکەی داکەند، دلبەر چاوی بەزرێکەی بەری کەوت و زۆر شاد بوو، گوتی:

– شوکور جگە لە بازیبەند زرێیشت لەبەردایە، کە بازیبەندەکەی بۆ دەبەست، شەباب دەستی لەسەر دڵی خۆی دانا، دایکی هەستی بەمە کرد، شەباب لە شەرما لێی دا ڕۆیشت. عەیشێ لە دڵی خۆیدا گوتی:

– «لاوۆ، خوا بتپارێزێ، دە بڕۆ، دەی خوا شای ئێران و پادشای ڕۆم وەبەر ئاھ و نووزەی کوردان بخا و تەختیان وەرگەڕێ و بەناخی عەردا بچێ».

لە مێژبوو نیوەشەو بەسەرچووبوو، بەڵام هێشتا ڕاوێژ و شێوری کۆڕ و مەجلیسی خانۆ و سەرکاری لەشکرەکانی، نەبڕابووەوە، ڕاوێژی ئەوەیان دەکرد: «چ بکەن نەهێڵن دوژمن پێ لە خاکیان باوێ و نیشتمانەکەیان داگیر بکا». ئێوارێ گەلێ قسەیان کرد. پاشان خانۆ قسەی کرد:

– ئێوە نازانن شا عەباس چیی دەوێ؟ ئەگەر نازانن دەبا بۆتانی ڕوون بکەمەوە: شا عەباس دەڵێ: «دەبێ عەردت داگیر بکەم، باج و خەرج و خەراج بدەن، بێگار و سوخرەکێشیم بۆ بکەن، واز لە مەزهەبی خۆتان بهێنن و وەرنە سەر مەزهەبی ئێمە. وەرن شەڕم بۆ بکەن، وڵاتانم بۆ داگیر بکەن». خۆ تێ گەیشتن چیی لێمان دەوێ؟

– خانۆ ئەم قسانەی بەتووڕەیییەوە کرد.

ئەو ئێوارەیە هەمزە چاوەش لە پاش هەمووان قسەی کرد، گوتی:

– مەبەستی شای ئێران زۆر چاک بزانن. ئەو لەشکرەی کە لەسەری کردووین ئەمری وی بەجێ دێنێ، ئەوە چەند ساڵ و چەند جارە لەشکرمان لێ دەکا، بەڵام هیچی پێ ناکرێ، ئێ سەرەڕای ئەمەش سەردارێکی وەکو قولی خانی لە دەست چوو. ئەم جارە وەکو ئەقڵم بیبڕێ شارەزا و پسپۆڕی لەگەڵ ئەم لەشکرە گەورە و گرانە ناردووە. کەواتا ئەم لەشکرەی بۆیە کردووینە سەر ئەم جارە لە بنمان بێنێ و بەجارێ دوامان ببڕێتەوە و هەمووومان لەناو ببا، خاک و زەویمان لێ داگیر بکا، نامووسی ماڵ و منداڵمان ببا. ئیدی پاش ئەمە ژیانمان بۆ چییە؟ سەردەمانێ کە سەربازی سوپای ڕۆم بووم. هەمیشە هەر لە شەڕدابووم و زۆرم لەم شەڕانە بەچاوی خۆم دیتوون. یەکجار بێ بەزەن، بێ ئینسافن، مەگەر هەر شەڕ چاوشکێنیان بکا.

ئەو ئێوارەیە بڕیاریان دا سبەینێ زوو بڕۆن پێش لەشکری ئێران بگرن و نەهێڵن پێ باوێنە خاکی وڵاتەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی هەتاو تازە پەنجەی لە ڕەشاییی بەفری سەر چیایان دابوو کە سەیرت دەکرد هێندە کاو و جوان و بەدەو بوو دەتگوت زێوە و بەزێڕ کل دراوە. ئەو بەیانییە خانۆ لە سەرووی قەڵاوە بەسواری ئەسپێکی شینبۆز لە مەیدان ڕاوەستابوو. لەشکریش ئامادە وەستابوون. خانۆ کەمێ ئەسپەکەی بەرەو سەربازەکان ئاژۆت. لەو کاتەدا شێخ جەلات و مەلا ڕەشید بەرەو پیری خانۆ هاتن، کە لێی نێزیک بوونەوە سڵاویان لێ کرد. خانۆ سڵاوەکەی ئەستاندەوە، پاشان شێخ جەلات گوتی:

– گەورەم، سەر و ماڵم بەقوربانت بێ و خوا لە زەبری دوژمنت بپارێزێ، خوا یار بێ شیری تۆ و ملی یەکە بەیەکەیان دەبێ.

خانۆ ئەسپەکەی زەنگو کرد و لە شێخ جەلات نێزیک بووەوە، گوتی:

– من لە شێخی خۆم زۆر ڕازیم، بەڵام وا چاکتر بوو، کە تۆش و مەلا ڕەشیدیش لەگەڵماندا هاتبانە شەڕ، بریا شەڕکەران تۆ و مەلا ڕەشیدیان لە جەنگەی شەڕدا بدیبان و هەموو واقیان وڕ ما با.

شێخ جەلات کەمێ دۆش داما، سەیرێکی مەلای کرد، گوتی:

- بەسەرچاوان.

خولامان جڵەوی ئەسپەکانیان گرت و ڕایان کێشانە کن وان، مەلا و شێخ سواری ئەسپی خۆیان بوون و لە تەک خانۆوە وەستان. خانۆ ئیشارەتێکی جەوزۆی کرد، لەشکر لەدوایەوە بجمن. لەدوای خانۆوە چەند کەسێک ئالای سووریان بەدەستەوە هەڵگرتبوو و دەهاتن. لەشکر لەدوای ئالا هەڵگرانەوە بەڕێ کەوت. لە پێشدا پەلی شیر و مەتاڵ بەدەستان، پاش وان پەلی ڕمب بەدەستان، لە دوو وان پەلی تیروکەوان بەدەستان، لەدوای ئەوانەوە پەلی نەجاخ بەدەستان، لە دووی وانەوە کۆسە میسری بەدەستان، ئینجا لە پەی وانڕا گورز و کەمەند بەدەستان بوون. بەڵام ئەمانە کەسانێک بوون، کە لە خۆیانەوە بەڕەزامەندیی دڵی خۆیان هاتبوون. بەڵێ مەشق نەدرابوون، بەڵام هەر کامیانت بگرتایە لە شەڕدا وەستا و پسپۆڕ بوو و گەلێ ئۆغرم و کارەساتی گەورە و گرانی دیتبوو. کەم پیاوی وایان تێدا بوو کە لەشی یەک دوو کوێرە برین و کۆنە زامی پێوە نەبێ.

ئەو ڕۆژە تاوەکو نیوەڕۆ، لەشکر لە هیچ شوێنێ نەوەستا، بەبێ پشوو ڕێگای دەکرد. لە بناری هەڵەتەکانی خوارەوە زۆر دوور لە قەڵاوە، خانۆ فەرمانی دا لەشکر لەسەر کانییەک بوەستێ. لەشکر وەستا. خانۆ بانگی جەوزۆی کرد، گوتی:

- بنۆڕن، لەشکری پیادە چەند دواکەوتووە، ئێمە بۆ شەڕ دەچین، دەبێ وا بڕۆین، نە لەشکری سوارە و نە لەشکری پیادە ماندوو بن. لەشکری ماندوو زوو دەبەزێ، دەمەوێ ئەمە زۆر چاک بزانن؟

- بەڵێ، گەورەم، فەرمایشتی جەنابت سێ و دووی تێدا نییە، لەشکری ماندوو شەڕی پێ ناکرێ، زوو وەڕەز دەبێ.

خانۆ بەرەو کانییەکە چوو ڕوانی سەربازێ دەمەوڕوو مژی لە کانیاوەکە ناوە. ئاو دەخواتەوە، خانۆ لێی نێزیک بووەوە، گوتی:

– لاوچاک، دەڵێی کورد نیت، چما نازانی کورد ئاو بە مست دەخواتەوە. بنۆڕە، بنۆڕە.

خانۆ چووە سەر کانییەکە لە پێشدا دەستی خۆی پاک شت، پاشان بە مست، دەستی بەئاو خواردنەوە کرد. لاوەکە لە شەرمەزاریدا ڕەنگی سوور هەڵگەڕا، دایکێشا چوو بۆ کن ئەسپەکەی.

خانۆ لەسەر کانییەکە هەستا، زۆر دوور نەکەوتەوە سوارێکی لە دوورەوە بەدی کرد، هێند خێرا دەڕۆیشت لەبەر تۆز و خۆڵی بەر سمی ئەسپەکەی بەئاستەم دیار بوو. جحێلان بە خانۆیان گوت: «قوربان ئەم سوارە هەبێ و نەبێ شەبابە». کاتێ نێزیک بووەوە، ئەسپەکەی سەرتاپا شەلاڵ بووبوو، سوارەکەش خۆی لە ناو تۆز و خۆڵدا بۆر دەچووەوە لەسەر ئەسپەکەی بازی دا عاردی، بەدەستووری سەربازی ئیکلامێکی بۆ خانۆ کێشا و دەستبەجێ گوتی:

– ماقوڵ، ڕاستە ئێمە هێشتا نەگەیشتووینە لەشکری ئێران، بەلام هەندێ هۆز گوندەکانی دەشت چۆڵ دەکەن و ماڵ و منداڵیان بەرەو چیاکانی سەرەوە دەبەن. دەڵێن: «تا ئێستا لە عەمری خۆماندا لەشکری وا گەورە و گرانمان نەدیوە».

خانۆ دڕدۆنگ بوو، گوتییە شەباب:

– تۆ بچۆ بەچاوی خۆت ببینە، ئەنجا وەرەوە خەبەرمان بدەیێ. ئێمە بۆیە تۆمان نەنارد، بگەڕێیەوە قسەی خەڵکمان بۆ بگێڕییەوە.

شەباب کە ئەم پلارەی خانۆی بیست، ملی کەچ کرد و سوار بوو، خەریک بوو ڕێوڕاست تێی تەقێنێ، هەمزە چاوەش هەڵی دایە، گوتی: «زۆرم پێ شەرمە لاوێکی وریا و مێرخاسی وەکو تۆ کارێکی پێ ڕاسپێرن بەچاکی ڕای نەپەڕێنێ، چما من وام فێرکردی؟» شەباب متەقی نەکرد، چۆن خێرا هات ئەوهاش خێرا دای کێشا، ڕۆیشت، بەو دیوی چیاکاندا لەچاو ون بوو.

جەوزۆ خەبەری هێنا:

– لەشکری پیادە زۆر دوا کەوتوون.

خانۆ گوتی:

– دە کەوایە با پشوویەک بدەین تا دەمانگەنێ، هەنگێ بۆی دەجمین. بەڵام با ئەم شەو لێرە بمێنینەوە.

پاش چەند سەعاتێک کە پیادە گەیشتن، خان لێی پرسین:

– هیزە چۆنن، خۆ ماندوو نین؟

سەرکردەی پیادان ئەسکەندەری پیر بوو، وەڵامی داوە:

– جا لە ئێستاوە ماندووبن، خۆ شەڕ بەزیشی تێدایە و لەزیش جا ئەوسا چ بکەین؟

خانۆ کە چاوی بە کوێرە برینەکەی دەموچاوی پیرە کەوت دەستبەجێ ئەسکەندەری ناسییەوە و وەبیری هاتەوە کە ئەو ئەو مێرخاسەیە کە ئازایەتی و کەڵەمێردییەکی زۆری لە دژ ڕۆم نواندبوو و لە زووەوە بەخۆی و هۆزەکەیەوە هاتبووە پاڵی. کاتێ سەربازە پیادەکان لە بناری ئەوانەوە هێورین، بحەسێنەوە، خانۆ فەرمانی دا، کە ئەسپێکی یەدەک بدەن بە ئەسکەندەر، بەڵام ئەسکەندەر قایل نەبوو، گوتی:

– بۆچی من لەمان زیاترم، تا سواری ئەسپ بم؟

خانۆ تووڕە بوو، هەڵی دایێ:

– جا خۆ تۆ جحێل نیت، ئەمانە هەموو جحێڵن، ئەتۆ بەم ڕەنگە بڕۆی خۆ پاش چەند ڕۆژێکی دیکە دەوەستی و لە پەلوپۆ دەکەوێ، جا هەنگێ کێ لە بری تۆ سەرکارییان بکا. کەمێ هۆشت بێ هۆش؟ تۆ خەمی جحێلانت نەبێ، ئەوان ماندوو نابن.

ئەسکەندەر وەکو تاوانێکی کردبێ دۆش داما، گوتی:

– ماقوڵ فەرمایشتەکانت ڕاست و دروستن، دەبا ئەسپێکم بۆ بهێنن. ئەسپێکی زینکراویان هێنایە پێش ئەسکەندەر، ئەویش وەک لاوێکی چواردە ساڵان خۆی هەڵدایە سەر پشتی ئەسپەکە و دوو سێ سەڵەف لە مەیدانێ هات

و چوو و شیرەکەی بەم دیو بەو دیودا هێنا و برد، دەتگوت جریدبازی دەکا، جحێڵان دایانە قاقای پێکەنین. خانۆ گوتی:

– ئێوە دەبینن ئەم پیرە قەت مەشقیشی نەکردووە، بەڵام بنۆڕنێ چ ئۆگت و فەندان لەسەر پشتی ئەسپ دەنوێنێ؟

هاوینەکەی زۆر خۆش، ئاسمان ساماڵ، هەوا فێنک، کەژ و کێو و دەشت و دەر بەهەزار تەرزە گولیلکان خەمڵیبوون، بە تۆ با نە بکەی نەبخۆی هەر سەیری دیمەنی جوان و دڵگیر بکەی. هەندێ جحێڵ یاریی تەپوتاشیان دەکرد، هەندێ لاقرتی و قسەی خۆشیان دەکرد و دەیاندا تریقەی پێکەنین، یەکێ دەستەسرێکی لەسەری خۆی ئاڵاندبوو، بەدەنگێکی ژنانە دەیگوت: «ئا کنا، لاچن، وەی پرچم برن، خۆ کەرەکەمان دیار نییە». جحێڵان لە دەوری کۆ بووبوونەوە، پێی پێ دەکەنین، دەیانگوت: «وەڵڵا کوتومت لە ئۆغدە شێت دەچێ، بڕۆنێ، بڕۆنێ لەبەر خاتری کەرەکەی دەڵێ پرچم برن».

خانۆ زۆری کەیف بەوە هاتەوە کە لاوەکان دڵخۆشن و دەماخیان چاخ و کەیفیان سازە و وەڕەزی و نیگەرانییان پێوە دیار نییە، لە دڵی خۆیدا گوتی:

– سەد شوکور کە هیچ دڵتەنگ نین. ئینجا لە جەوزۆی پرسی:

– سازبەندی لقەکان هاتوون، یان نا؟

– بەڵێ، ماقوڵ، هاتوون، لق چۆن بێ سازبەند دەبێ، هەر لقە سازبەندی خۆی لەگەڵدایە، تەنانەت لاوانی هەندێ لق تۆلوم و بلوێریان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە، هەندێکیان شمشاڵیان پێیە، جگە لەمەش من مرازی سازبەندم بۆ خۆمان هێناوە.

– ئافەرم جەوزۆ، ئەی کوا مراز دیار نییە؟.

– ماقوڵ، دەبوایە مراز لە نێزیک جەنابتەوە بێ، بەڵام هەندێ دوور دام مەزراند.

دە کەواتا با مراز دەست بەتۆلوم لێدانێ بکا و جحێڵانیش وەسەما کەون. جەوزۆ چوو گوتییە مراز، ئەویش دەستی بەمقامی (شەڕ) کرد. کوڕگەل

دەستیان گرت و کەوتنە گۆڤەند: جارێک چەپ لێیان دا، دوو جار ڕاست لێیان دا و قەمەیان هەڵکێشا چوونە پێشێ گوتیان: «نابێ، نابێ، نابێ». پاشان قەمەکانیان گورج لە کالانێ دەخستەوە و دەستیان دەگرتەوە، دیسان جارێ چەپ لێیان دا دوو جار ڕاست، هەمیسان قەمەیان هەڵکێشا و بۆ پێشەوە چوون، گوتیان: «نابێ، نابێ، نابێ». جاری سێیەم کە گۆوەند وەرسووڕایەوە، ئەنجا دوو جاریان چەپ لێ دا، بەڵام کە ڕاستیان لێدا دیسان قەمەیان هەڵکێشا و سێ جاریان گوت: «نابێ، نابێ، نابێ». قەمەکانیان هەمیسان لە کالانێ خستەوە و گۆوەندیان گێڕا. کاتێ ئەوان وا ڕێکوپێک بەقەمەی زاخاودراو و ڕووتەوە دەچوونە پێشەوە دەتگوت لە دوژمن وەردێن. خانۆ کە چاوی بەم یارییە کەوت و گوێی لە دەنگی «نابێ، نابێ، نابێ» یان بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەشەدوبیللا، قەت نابێ نیشتمانی خۆمان بدەینە شا عەباس، بیدەینە ئەو مەعرزانە».

لە سەرووترەوە لە نێو کاژێکدا، بلووکی ئەسۆی لاکان بوو، دەنگی زوڕنا دەهات، وێ دەچوو مقامی (سێ پێیی) بێ. ئیتر زەردەپەڕ بوو، ڕۆژ لە ئاوابووندا بوو، سێبەری دار و درەخت گەورە و درێژ بووبوو. پاش شیو خواردن خانۆ سواربوو و لەشکر هەموو بەڕێ کەوتن. پێشەنگی لەشکر بەزەحمەت بەر پێی خۆیان دەدیت. زەوی لە تاریکیدا نوقم بووبوو، لە ئاسمانی شیندا لە پێورمێزین بەولاوە هیچی دیکە بەدیار نەدەکەوت. لەشکر نەرم نەرم، لەسەرەخۆ دەکشا، لە تەقەی سمی ئەسپان لە بەردان دەکەوتن کەس دەنگی لێوە نەدەهات. یەکێ لە پێشەنگانی لەشکر خەبەری بۆ خانۆ هێنا، کە گەیشتوونە ئەسکەری پیادە، خانۆ گوتی، بەئەسکەندەر بڵێن:

– با ئەسکەرەکانی ئەمشەو لێرە شەوبێری بکەن، سبەینێ لەگەڵ بەرەبەیاندا بەڕێ کەوێ بێ، بەڵام نەک بەپەلە و لەز، تا دەتوانێ با لەسەرەخۆ و هێدی هێدی بجمێ.

هەرکە پاسەوانی خانۆ ئەم فەرمانەیان بەئەسکەندەر ڕاگەیاند، گوتی:

– نا، چۆن لێرە بمێنمەوە، خۆم دەچم خانۆ دەبینم.

ئەسکەندەر هاتە خزمەتی خانۆ و بەو تاریکە ئەنگوستەچاوە ئیکلامێکی بۆ کێشا، گوتی:

– ماقوڵ، ببوورن، جەنابتان فەرمانتان داوە کە ئەسکەرەکانم ئەمشەو لێرە پشوو بدەن، ئەسکەری من ماندوو نین، ئێمە باش هاتووین، چما وا چاکتر نەبوو ئەگەر ئێمەش هێدی هێدی لەگەڵ ئێوەدا بهاتباین.

خانۆ سەری لەوە سوڕما، کە ئەو پیرە هەشتا ساڵە بەم شەوە تاریک و نووتەکە چۆن چاوی دەبینێ، وەڵامی قسەکانی ئەسکەندەری دایەوە:

– نەخێر، ئەسکەندەر، با پیادەکانت بحەسێنەوە، سەربازی ماندوو، خۆت دەزانی، نە سەربازە و نەشەڕکەرە. جارێ گەلێ ڕۆژی چەتوونمان لە پێشێیە، تۆ بەگوێی من بکە، با سەربازەکانت چاک بحەسێنەوە. با نۆبەدار و ئێشکگریش بەدەوری سەربازگەکەتدا ئێشک بگرن و وریابن، سەربازگە بێ ئێشکگر نابێ. ئەسکەندەر ئەم قسانەی لەمەڕ ئێشکگرتنەوە بەدڵ نەبوو، گوتی:

– ماقوڵ، خۆ من منداڵۆچکە نیم بێ قەزابی، چما من ئەمڕۆ هاتوومە نێو شەڕێ، ئەی من هەر ئەوە نیم ئەوی بە وڵاتی ڕۆمم کرد کردم، پادشای ڕۆم دەیگوت:

«ئێوە هەر ئەسکەندەر بەگم بۆ بگرن ئیدی هیچم ناوێ.»

خانۆ وای بۆ بەدیارکەوت کە پیرە بە ئامۆژگارییەکانی تووڕە بووبێ و دڵی شکابێ. بەدەنگێکی نەرم گوتی:

– ئەسکەندەر، من زۆر چاک دەزانم ئەتۆ کێی و چت بۆ نەتەوەی خۆت کردووە، بەڵام بڕوا بکە من ئەم قسانەم لە ڕووی خراپەوە نەکرد. تۆ دیتت ئەمڕۆ چەندمان ڕێ بڕیوە. پیاوی نووستو وەکو مردوو وایە. بۆچی تەمێ و ئامۆژگاری خراپە؟ دە تۆ خۆت بیڵێ؟

ئەسکەندەر کە زانیی بەبێ سۆنگە و لە هیچە تووڕە بوو، گوتی:

– ماقوڵ، قسەی جەنابتە و فەرمایشتەکانت لەسەر سەرم، پیاوی ماندوو

وەک مردوو وایە. ببوورن، من خراپ حاڵی بووم.

ئەسکەندەر بۆ کن سەربازەکانی خۆی گەڕاوە. هەرچی سوارەش بوون بەو دیوی چیادا ئاوابوون. دنیا کشومات، دەتگوت دار و درەختەکانیش دەیانزانی شەوە، بۆیە کڕ و بێدەنگ بووبوون، تەنانەت یەک گەڵادار چییە نەدەلەرییەوە.

بەردەستان شیویان بۆ خانۆ ئامادە کرد. سێڤدینی کوڕی هات، بە باوی گوت:

– کاکە*، شیو ئامادەکراوە، فەرموو شیوکە، هێشتا پارووەکت نان نەخواردووە.

کاتێ لە کۆنەکە نێزیک بووەوە، بەڵام هێشتا وەژوور نەکەوتبوو، لە پڕ شەبابی لێ نێزیک بووەوە، ئیکلامی بۆ کێشا، گوتی:

– قوربان، ئەمڕۆ ئێمە دوو سەربازی عەجەممان بەدیل گرتوون.

– ئەی کوان، لە کوێن؟

– گەورەم ئێستا سەربازەکانم دەیانهێننە خزمەتت.

– وریابن، شەوێ هەڵنەیەن.

خانۆ چووە ژوورێ. خولامێکی لە دوو جەوزۆ و سەرکارەکانی دیکە نارد بێنە کنی. لە پێش هەمووان، جەوزۆ هات، کە چاوی بە شەباب کەوت، گوتی:

– شەباب دەبینم قەتمان لێ دوور ناکەوییەوە، نازانم تۆ، کارێکی پێت دەسپێرن چۆن دەتوانی بەدیی بهێنی؟

خانۆ کە ئەم پلارەی جەوزۆی بیست، گوتی:

– جەوزۆ لە شەباب گەڕێ، ئەو ئەمڕۆ مێرخاسییەکی دیکەشی نواندووە. ئەمڕۆکە دوو سەربازی عەجەمی بە دیل گرتوون و هێناونی.

– ئەدی کوان؟

سەرکار و ڕێبەران کە ئەم مێرخاسییەی شەبابیان بیست بە چاوی

* لە نێو کورداندا باوە هەندێ کوڕ بە باوکەیان دەڵێن کاکە.

خۆشەویستی و ڕێزەوە تێیان نۆڕی. سێڤدینیش لە شەبابی نۆڕی، بەڵام بەچاونەباری و گومانەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی:

«من دەبینم بەختت یار و یەغباڵت ڕوو لە هەورازە، دلبەری بەدەویش لە تۆ بەولاوە دڵی بە کەسەوە نییە».

شەباب کە نۆڕی سێڤدین بەچاونەباری و نامۆییەوە تێی نۆڕی، وەبیری هاتەوە کە چۆن جارێکیان لە سەیرانێ، کە شەباب لەوێ نەبوو، سێڤدین قسەی بۆ دلبەر هاوێتبوو، هەنگێ کە شەباب ئەو قسانەی بیستەوە هێندەی بەتەنگەوە نەهات، بەڵام ئەمڕۆ کە بە چاوی خۆی دیتی و بە گوێی خۆی بیستی: سێڤدین چۆن توانج و پلاران داوێ و چۆنی دەنۆڕیتێ ئیدی بەجارێ دڵی خەوشی گرت.

لە پێش دەری کۆن بوو بەدەنگە دەنگ. سەرباز دیلەکانیان بە تێ هەڵدان ڕاپێچ کردبوو، هێنابوویانە کۆن. خانۆ کە چاوی بە تێ هەڵدانیان کەوت، زۆر تووڕە بوو، گوتی: ئەوە چییە؟ لە دیلدان ئاکار و کردەوەی پیاوان نییە. پیاو دەتوانێ بشیانکوژێ ئەگەر نیازی خراپەیان بوو، بەڵام لێدان کاری مێرخاسان نییە و لە کەڵەمێردان ناوەشێتەوە مەگەر هەر ڕۆم و عەجەم کاری وا نامەردانە و نارەوایان لێ بوەشێتەوە!

سەربازەکان گوتیان:

– قوربان ئێوە نازانن لە بەرەبەیانەوە چ دەکەن، سرەوتنیان نییە، خۆ بە عاردیدا دەدەن، مان دەگرن، هەر دەڵێی گای بنەن، بە پاڵەپەستۆی نەبا نەدەهاتن، یەکجار ئا ئەم درێژە چەتەوڵەیان.

هەرکە شەبابمان لێ جیابووەوە خۆی بە عاردیدا مەلاس دا نەدەهات و نەدەهات. هێندەی نەمابوو بیکوژم، بەڵام سەرئەسکەر، شەباب تەمێی کردبووین کە بەزیندوویتی بیانگەیێنینە خزمەت جەنابتان، بۆیە نەمانکوشتن.

یەکێکیان ڕەقەڵەیەکی تەلاشی درێژی لۆزەندەر بوو، نیشانەیەک بەتوێڵییەوە بوو، ئەوی دیکەیان گولەیەکی کوڵەبنە بوو، خانۆ فەرمانی دا

دەست و پێیان بکەنەوە.

کوڵەبنەکەیان داوای ئاوی کرد، خانۆ فەرمانی کرد، جامێ ئاوی بۆ بێنن. کە جامە ئاوەکەیان دایێ، دەستی دەلەرزی، خانۆ فارسیی دەزانی، لێی پرسین:

– ئێوە سەر بە کام بلووک و لە کێهە ئۆردوون؟

شتاقیان متەقێیان نەکرد. خانۆ پرسیارەکەی لێ دووپات کردنەوە:

– بڵێن، لە کام بلووک و سەر بە کام ئۆردوون؟ دیسان ورتە لە هیچیانەوە نەهات. خانۆ گوتی:

– قسە بکەن چاکترە، ئەگەر قسە نەکەن خۆتان زەرەر دەکەن، ئێمە دەتوانین وەدووتان بێنین، بەڵام وامان پێ خۆشە لە خۆتانەوە بێنە دوو و بە باشی و ڕاست و ڕەوان و بێ ئەشکەنجە و ئازارکێشان وەڵاممان بدەنەوە. ئێمە کوردین، وەکو ئێوە نین.

خانۆ جارەکی دیکەش لێی پرسین:

– لە کیهە بلووک و سەر بە کام ئۆردوون و بۆ کوێ دەڕۆن؟

دیسان فزەیان نەکرد. خانۆ بە فارسی گوتییە جەوزۆ:

– دە کەوایە، نەیارن و ناتانگەرەکە قسە لای ئێمەی کورد بدرکێنن، ئا دەی بیانبەن، لە پشت ئەو کۆنەوە بیانکوژن.

جەوزۆ چاوی لە دوو سەربازان کرد، دەسبەجێ باڵبەستیان کردن کاتێ بردنیان، خانۆ بە کوردی گوتی:

– درێژەکەیان ڕەحەت کەن، وا دیارە ئەفسەرە، ئەوجا ئەوی دیکەیان لە خۆڕا وە قسان دەکەوێ.

هەرکە بردنیاننە پشت کۆنێ، ئەسۆی لاکان گورزێکی لە ڕێسی ملی سرەواند، دەنگی لێوە نەهات، دانێغلا زەوی. ئەوی دیکەیان دەستی بەپاڕانەوە کرد، نەیکوژن، گوتی: «چم لێ دەپرسن، ئەمن وەڵامتان دەدەمەوە، ئێوە هەر مەمکوژن». دیلەیان دیسان هێناوە کۆن.

بەو ئێوارە درەنگە خـانۆ چیی پێویست بوو لە دیلـەی پرسـی، هەمـوو سرِ و پەنی و نهێنی و جبەخانە و ئارمانج و باس و خواسێکی لێ ڕوون بووەوە.

تاریک و ڕوون بوو لەشکر سەرلەنوێ بەڕێ کەوت. لە ڕێگا تووشی کۆچ و باری خـەڵکی گـوندەکـانی دەشت هاتن. هەمـوو مـاڵ و منداڵیـان سواری گـا کردبوو و بەرەو چیا تووش و هەڵدێرەکان دەچوون. خانۆ پرسـی:

– ئەوە چتان لێ قەوماوە؟ بۆ کوێ دەچن؟

یەکێکیان خانۆی ناسییەوە، گوتی:

– ماقوڵ، چت عەرزکەین دەڵێن دیسان لەشکری عەجەم هاتووە. دەترسێن وەکو پایزی پارمان بەسـەربێنن، پار نەنگ و سووکییـەکی زۆریان بەسەر ماڵ و منداڵمـان هێنا، جـا بەهـەر ڕەنگێ بێ دەمـانەوێ ژن و منداڵان بەرەژوور، بۆ گـوندەکـانی نێـو چیـاکـان بـەرین، لە چەنگاڵی ئەم کـافـرە زۆردارانـەیان دوورخەینەوە.

خـانۆ کە گەیشـتـە گوندەکانی دەشـتێ نواڕی چۆڵ و هۆڵ وەکو کەسـیـان تێدا نەمابن وابوون، سەیری کرد هەرکەسە گژوگیای خۆی درووەتەوە لە پێش مـاڵێ لۆدەی کـردووە و هـەندێ پیـر و مـیـر نەبن کـە تاک و تـەرا لێـرە و لەوێ دروێنـەیان دەکـــرد ئیـدی هـەرچی دەســـتی دار بگرێ چەکی هەڵگرتبـــوو و چووبووە شەڕێ، یان ماڵ و منداڵی خۆی بەرەو چیا سەختەکان دەبرد. خانۆ کە ئەمەی دیت هەناسەیەکی هەڵکێشا.

سـێ شـــەو و سێ ڕۆژ بـوو لەشـکری خـــانۆ بـەڕێوە بـوو، نـاوبەنـاو نەبـێ، ئەویش کـەم، دەنا نـەدەهێـوری بحـەسـێـتـەوە. سـەری چوارەی بـوو، پاش نیـوەڕۆیەک بوو، پەڵەهەورێک بـە ئاسـمانەوە لەسەر چیا گەردن کەشـەکانەوە بەدیارکەوت، تا دەهات زێدەتر دەبوو و بەرەو لەشکرەکە دەکشا، لە پاشـان با و وەشـتـێکی توند هەڵی کـرد، بوو بە گرم و هۆڕی هەور و هـەڵا و برووسکە و تریشـقەدانێک هەر مەپرسە، زۆری نەخـایاند باران شـەست دای دا، بەڵام چ بارانێک، کڵاو بەسـەرە. بۆن و بەرامـەی هەوا خـۆش بوو و باران کـردییـەوە.

هەندێ دنیا فێنکی کرد. شەباب خەبەری هێنا کە لە سوپای ئێران نێزیک بوونەتەوە. لەشکر وەستا. شەباب نۆی بردە سەر زنارێکی بەرز، لەوێوە سوپای ئێرانی نیشان دا، لەو گوژم و بڵندەوە سوپای ئێران وەکو عەینەک زۆر ڕوون لە خانڕا دیاربوو. ئەو شوێنەی کە سوپای ئێرانی لێ دامەزرابوو لێڕەوارێکی چڕ و سێرەکی لێ بوو و لە نێو ئەو لێڕە سێرەکەدا سەربازێکی زۆر و زەوەند هێوریبوون، لەشکرەکە هێند گەورە و گران بوو لەو بەستە ڕاستەدا چاو بڕی بە بەر و دوای نەدەکرد. خانۆ زۆری لەو لەشکرە بێ شومارە ڕوانی، لە دڵی خۆیدا هەر لێکی دەداوە:

«لە کوێوە و چۆن بەسەر لەشکری ئێراندا بدا؟»

گورجێ سەربازێکی بەدوای هەمزە چاوەش و جەوزۆ و ئەسۆی لاکان و پۆستۆ و ئەسکەندەری پیردا نارد. ئەمانە کە هاتن و لەو بەرزاییەوە نۆڕییانە لەشکری ئێران، پۆستۆ گوتی:

– من زۆرم شەڕ دیوە و چاوم بەزۆر لەشکری دوژمن کەوتووە، بەڵام تا ئێستا هیچ لەشکرێکم بەم گەورە و گرانییە نەدیوە.

ئەسۆی لاکان بە پێکەنینەوە گوتی:

– کەواتا لە ئێستاوە لێی تۆقیوی.

– نا، تۆقینی چی، پێشینان گوتوویانە: «ئەوەی سەری بەگوێزان بتاشێ قەڵەمی نایە».

سەرکردەکان بەوردی نواڕییانە لەشکری ئێران. ئەم کەڵەمێردە کوردانە لەو کرِی و ماتییەیاندا دەتگوت ئەوە لێک دەدەنەوە، کە چۆن دوژمنی زۆردار ببەزێنن و گەلیان لە دەست ڕزگار بکەن.

کەس دەنگی لێوە نەدەهات، خانۆ گوتی:

– ئێوە دەبینن بەلای دەستەچەپدا، ئەوەتا دوژمن لەو بەستەدا ڕەش دەچێتەوە، دەبێ یەکێ بڕوا بۆ ئەوێ – خانۆ قسەکەی تەواو نەکرد و هێشتا نەیگوت کێ بڕوا، ئەسکەندەر هەڵی دایە، گوتی:

– ئەو کارە بە من بسپێرە – خانۆ ئاوڕی داوە نوارییە ئەسکەندەر، بەڵام هیچی نەگوت.

– لەشکری لای دەستە چەپ بە تۆ دەسپێرم هەمزە چاوەش، هی لای دەستەڕاستیش بۆ ئەسۆی لاکانێ، ئەوەی ناوەندیش بەشی پۆستۆیە.

ئەسکەندەر بەدڵ ڕەنجاوییەکەوە لە خانۆی پرسی ئەی من کارم چییە؟ خانۆ کە زانیی پیرە دیسان زیز بوو، لێی نێزیک بووەوە، گوتی:

ئەسکەندەر گیان، هەرکە من چوومە شەڕەوە، تۆش لەگەڵ سەربازەکانی خۆتدا هەرۆ بەر مەیدانێ. چما تۆ نابینی دوژمن چەندی لەشکر لێ کۆ کردووینەوە، ئێمە بە ژن و منداڵ و پیر و جحێڵەوە کۆبینەوە بە نیوەی ئەوان نابین. هێشتا ئۆغرم و کارەساتی گران لە دواوەیە، هەڵمەت و هێرش زۆرە کوڵ و کەسەری دڵی تیا برێژی.

ئەم قسانەی خانۆ دیسان پیرەی دڵ دایەوە، بەڕوویێکی شادەوە، گوتی:

– قوربان، تۆ چۆن دەفەرمووی، من وا دەکەم.

پاشان خانۆ کەمێ دوا کەوت تەمێی سەربازەکانی کرد، گوتی:

– ئێمە زۆر نێزیک بووینەوە. کەوتووینە تۆڕی دوژمنەوە. پەلامارمان بدەن، لەم لەشکرە گەورە و گرانە ڕزگار نابین، زۆر زەحمەتە دوژمن ببەزێنین، ئەوان گەلێ لە ئێمە زۆرترن. پێویستە سەربازە هێوساندییەکانمان بکشێنە پاشەوە و دوورکەونەوە. هەر ئێستا با ئەسکەندەر بیانبا لەسەر کانییە ترشەکێ دامەزرێن. ئەم سەربازانەمان کە لێرەوە دەکشێنەوە پاشێ مەیدانی شەڕ چۆڵ و فرەوان دەبێ، جا ئەوسا بە کەیفی خۆمان قەڵادارەکانمان چۆن دەست بدا وایان دەگوێزینەوە، بەڵام دیسان هێرش دەبەینە سەر دوژمن. پێویستە سبەینێ تاریک و ڕوونان بەسەریاندا بدەین، تا هەستیان پێ نەکردووین. هێشتا لەشکرەکەیان یەکیان نەگرتووە، دەنا پێیان ناوەستین بەیانی کە لێتان دان دەستیان لێ مەپارێزن، تا دەتوانن لێیان کەلەپاچە کەن، چونکە نوستوون و ئارخاینن، ئەنجا لەبەریان هەڵێن و وەدووی خۆتانیان دەن، وەرن، وەرن تا لە

ئێمە تێ دەپەڕن، وەکو ئاگاتان لەمە نەبێ، بڕۆن تا دەگەنە ئەم چیا بەرزانە و زۆر چاک ماندوو دەبن، هەنگێ من و جەوزۆ لێیان ڕادەپەڕین، دایان دەپلۆسین. ئێوەش لە دووررا خۆتان لە بۆسەدەن، ئەنجا ئێمە تێیان دەکەوین، تا دەتوانین لێیان قڕ دەکەین. پاشان لە بەریان هەڵدێین، تا لە ئێوە تێ دەپەڕین، ئەنجا ئێوە جارێکی دیکە وەدەست بێن تێیان کەون، ماندوون قڕکردنیان سانایە، لێیان دەن دەستیان لێ مەپارێزن. ئا بەم ڕەنگە دەبێ لەو چیا و هەڵدێرانە تاکیان نەهێڵین و ئاسەواریان کوێر کەینەوە. وا نەکەین هیچ چارەیەکی دیکەمان بەدەستەوە نییە. دەڵێن چی؟ سەرکاران تێکڕا گوتیان: «فەرمایشتەکانت بەجێن، مەگەر بەم چەشنە بتوانین ئەم لەشکرە گەورە و گرانە بشکێنین.»

دەمێ بوو تاریکی داهاتبوو، ئاسمان ساماڵ بوو، خانۆ وچانێک لە نێو شینایی و گولیلکان وەلەزیا، دەستی لە ژێر سەری دانابوو، دەینۆڕییە ئاسمانێ، ئاسمان پڕی ستێر بوو. هەندێکیان جووت جووت بوون هەندێ کۆمەڵ کۆمەڵ بوون، هەندێکیش تاک تاک بوون، دەتگوت کیژە کوردانن لە سەیرانێ بڵاوبوونەوە:

ئەوانی جووت جووت دڵخوازی یەکن و ڕازی دڵیان بۆ یەکتر دەگێڕنەوە، ئەوانی کۆمەڵ کۆمەڵ خەریکی ئەوەن هەندێکان خەڵک ناونوچک و بۆسۆ دەکەن و بوختانیان لە بۆ هەڵدەبەستن و هەندێکیان غەیبەت دەکەن، هەرچی تاک تاکن ئەوانیش وەکو ئەو کچانەن کە دایک و باویان بۆ خاتری شیربایی زۆر بەنابەدڵی لە پیرەمێردانیان مارە کردوون، بۆیە وا کڕ و دوورەپەرێزن و لە حاڵی خۆیان بێزار و وەڕسن و ئیدی چ قسەیان بۆ نەماوەتەوە بۆ هاوڕێ و دەستەخوشکانیان بگێڕنەوە.

بەردەستییەکان کۆنیان بۆ خانۆ دامەزراند، نوێنیان بۆ ڕاخست، کەمێ هەلاژێ، سێڤدین بەدووی باویدا هات. خانۆ لەو دەمەدا خەم و خەیاڵێکی قووڵ دای گرتبوو. ئەو ئەمڕۆ لەشکری گەورە و بێ شوماری دوژمنی دیتبوو، بیری دەکردەوە: "چۆن نەتەوەکەی لەو زوڵم و زۆرداریە، کە وەکو بەڵای لابەلا

بەرۆکی گرتوون، ڕزگار بکا».

ئەو هیچ گـومـانی لەوەدا نەبوو کـە دەیانبـەزێنێ، بەڵام دیسـان بیـری دەکردەوە: «گەلۆ، ئاخۆ چەند کەسی لێ دەکوژرێ و چەندی لێ دەرباز دەبێ؟» ئیدی هەروا بیری دەکردەوە، سێڤدین لە بابی نێزیک بووەوە، گوتی:

– کاکە، خولامان کۆنیان بۆ داکوتاوی، نوێنیشیان بۆ ڕاخستووی، تاوێ هەڵاژێی، تۆ ئەمە چەند ڕۆژە زۆر کەم نووستووی.

– لاوۆ، سـێـڤـدین، ئێـسـتـا کێ لە ناو نوێندا دەنوێ. بڕۆ پشـتی زینی ئەسپەکەم بۆ بێنە، لە ژێر سەرمی دانێم، تۆزێ هەڵاژێم.

سێڤدین کە ڕۆیشت خانۆ دیسان خەم و خەیاڵ دای گرت. سەیری دەکرد حـاڵیان ناهەموار و چەتوونە، بەڵام لە شـەڕ و بەرگری لە خۆکردن بەو لاوە هیچ ڕێگایەکی دیکەی بەدی نەدەکرد. لەو کاتەدا ئەو چەند بەگە کوردانەی وەبیرهاتنەوە کە خیانەتیان لە میللەتی خۆیان کردبوو و چووبوونە پاڵ شا عەباس. هەندێ جاریش بە بیریدا دەهات کە تکاکاران بۆ ئازربایجان بنێرێ، داوای کۆمەکیان لێ بکات، ئەدی ئەو چەند جار کۆمەک و یارمەتیی وانی نەکرد لە دژ شای ئێرانێ و بە هاواریانەوە نەچوو، یا پەیکان بەرەو شەمدینان بەڕێ کات و کۆمەک لەوان داوا بکا، بەڵام پاشان خۆی بەخۆی دەگوت:

«بەڵام ئێمە هێشتا دەستمان بەشەڕ نەکردووە و هەر لە ئێستاوە داوای کۆمەک و یارمەتیکردن کارێکی نەنگە و بۆ پیاوماقووڵانیش کرێت و دزێوە».

خانۆ هێشتا لەو بیرکردنەوە قووڵانەدا بوو، سێڤدین نەرمەزینێکی بۆ باوی هێنا، بەڵام کە ڕوانی باوی لە مـتـالا و بیر کـردنەوەدایە، هیچ دەنگی نەکرد، نەرمەزینەکەی بەهێواشی لە تەنیشت باویەوە دانا و گەڕاوە ڕۆیشت. خانۆ هێند چووبووە ژێری بەخۆی نەزانی کەی خەو بردبوویەوە. هەر نەشیزانی چەند نووستووە. بەڵام لەگەڵ ئەستێرەی بەیان هەڵات، وەخەبەر هات دەتگوت ئەو وەخەبەری هێنا، گوتی: «هەستە، ئیدی وەختی ئەوەیە بەسەر دوژمندا دەی» خانۆ چاوی کردەوە، لە دەوروبەرێی نۆڕی، سەیری کرد پاسەوانەکان

هەرکەسە لە جێگەیەک ئەسپی خۆی دەلەوەڕێنێ. بەڵام ئەوانیش دهەنژان و وەنەوزیان دەدا. خانۆ ڕابوو هاتە کن کوڕ. سێڤدین لە نێو شینایی و گولیلکاندا ڕاکشابوو، دەستی چەپی دابووە بەرسەری خۆی و بەدەستی ڕاستیشی شیرەکەی توند گرتبوو. خانۆ بەسەر سێڤدیندا خواربووەوە، بەهێواشی گوتی:

– سێڤدین، کوڕە شیرینەکەم، هەستە، ئیدی وەختی هاتووە.

کوڕە لەگەڵ دەنگی باوی بیست لە تاوان ڕاپەڕی، کۆڵۆسەکەی سەری کەوت، کوڕە کۆڵۆسی گورج گرتەوە، لەسەری کردەوە. هەنگینێ شەباب دیسان لە خانۆ نێزیک بووەوە، ئیکلامی بۆ کێشا گوتی:

– قوربان من دوێنێ شەوێ دوو پیاوی پیادەم هەنارده کن ئەسکەری ئێران، زۆر نییە گەڕانەوە؟

– باشە، چیی تازەیان هێناوە؟

– شتی تازە ئەوەیە کە دوێنێ شەوێ گەلێ هێستری بە باریان گەیاندووەتە لەشکر.

– نەتانزانی باری هێسترەکان چی بوون؟

– زانیمان، چۆن نەمانزانی، دەڵێن: «هەموو ئازووقە و زمێربوون».

لاوەکان دەڵێن: «ئەوانە هێند بێ باک لێی نووستبوون، تەنانەت دوو قاسکمان لە بەرئاگرەکەیان هەڵگرت، هێنامان هەستیان پێ نەکرد.»

کەوی سبەینێ تازە وەکو خمام لە عاردی دابوو. سەربازەکانی کورد وەکو هەڵۆ لە هەموو لاوە پریان دا سەربازی ئێرانی. دوژمن ئارخاین، هێشتا لە شیرینیی خەوی هنگورێدا بوون. پێش هەمووان هەمزە چاوەش بە سەربازەکانی خۆیەوە هەڵی کوتا سەریان. لەو لاشەوە ئەسۆی لاکان بەسەریدا دان، ناوەندیش بەشی پۆستۆ بوو. تا کەمێ دنیا ڕووناک بووەوە، سەربازەکانی خانۆ بەسەدان کەلاکی سەربازی ئێرانیان لەوێ خست.

ئەم بەسەردادانە کوتوپڕەی ئەو بەرەبەیانە، ئەسکەری ئێرانی بەجارێ

شـێت کرد، هـەندێک چەواشــە بوون، نەیاندەزانـی لە ترسـان چ بکەن و هـەروا واقیان ورمابوو لەو کارەساتەی بەسەریان هات.

بوو بـە ناڵـە ناڵی بـریـنداران، بەیانـی ئیــدی چاک ڕوون بووبـووەوە. خــانۆ هەمـزە چاوەشـی بـاش لێوە دیاربوو، کە خـۆی وە چادرێـک گـەیاند، وێ دەچوو چادرەکـە هـی سـەرهەنگان بـوو، بەڕم چادری لەسـەری نووسـتووەکـانی ژێری هەڵداوە، بە شیر و ڕم و سمکۆڵی ئەسپ قڕی دە هەمووان خست.

هەتاو تازە پەنجـەی لـەپشت چیاکانەوە هاویشـتبـووە ئەو شـوێنی لەشکری گەورە و گرانـی ئێرانی تێدا هێوریبـوون، هێرشـی سـەربازانـی ئازا و دلێری کورد بەئاشکرا لە خانڕا دیاربوو و لە خۆشییان دەیگوت:

– لێیـان دەن، فـیـدای دەست و شیـرتان بم، وایان لێ دەن ئیـدی جـارێکی دیکە بەرۆکی کوردان نەگرن و تۆبە بکەن.

ســەربازی ئێـرانی درێکی چاک و ڕەوێکی چاوشکێنی پێ درا، بـەڵام ئەو سەربازانەی کە لە دوور هێوریبوون لە هەرا و بگرە وەخەبەر هاتن، دەسبەجێ ڕیز بوون ڕوویان لـە هێرشـبـەرانـی کوردان کـرد. زۆر بەڕێکوپێکی وەتەنوورە کەوتن و هـاتن، هـەموو دەتگوت ئاڵقە زنجیرن و یەکێکیان لەوی دیکەیان بستێ نەدەترازا، نیـازیـان وابوو کـوردان لە چەمـبـەرێ خـەن و گـەمـارۆیان دەن و بەجارێ قڕیان کەن. ئەو بەیانییـە خـانۆ گوێی لە دەنگی سـەرئەسکەرەکەیان بوو، دەیگوت:

– تند، تند، تند. واتە «خێرا، خێرا خێرا».

وەخــتێ ئەوان لە دوورڕا تەنوورەیان دەبەست و بـەرەو ســەربـازانی کــورد دەهـاتن، لەوە ئاگادار نەبوون کوردان چۆنیـان قـڕ دەکردن، هەر بۆیەش خـێـرا دەهـاتن، بەڵام دەسبەجێ خانۆ ئەو فێڵ و دەهۆیەی ئاشکرا کردن، گوتی:

– وا دیارە ئەمـانە دەیانەوێ سـەربـازەکـانمان لە چەمـبـەر دەن، بۆیە وا دوور بەدوور و بە مـاتە مـات دێن. سـێـڤدین کوڕی خـۆم، خـێـراکە، تۆ بەم نەواڵەی ژێردا بڕۆ، بـەهـەمـزە چاوەش بڵـێ با بکشـێـتـەوە، بـەسـە، زۆر پێـشکەوتووە،

پاشان بە ئەسۆی لاکانیشی ڕاگەیەنە.

سێڤدین سواری ئەسپەکەی بوو، کەمێ بەرەخوار چوو، لە پڕ هەمزە چاوەش ئەسکەری خۆی کێشاوە، لە پاش ئەو ئەسۆی لاکان، ئەنجا پۆستۆ کشاوە، هەر دەتگوت لەبەریان هەڵدێ. سەربازانی ئێرانی وەدووکەوتن. خانۆ گوتییە جەوزۆ:

– جا بتبینم، جەوزۆ، ئەمن لەوە دڵنیام کە ئەمجارەش گۆی ئازایەتی و گەڕناسییەکی دیکە ببەیەوە. تۆ بۆ هۆ وێوە بڕۆ خانۆ دەستی درێژکرد شوێنی بۆ دەستنیشان کرد، – ئەمنیش لێرە دەمێنمەوە.

پاشان بە کوڕەی گوت:

– سێڤدین، تۆش سەت لاوی خوێنگەرم لەگەڵ خۆتدا ببە، لەو گەلییە خۆ لە بۆسە دەن تا وان دێن بەلاودا تێ دەپەڕن، هەنگینێ بەسەریاندا بدەن، بەڵام وریابن دەچەمبەرێتان ناوێن و گەمارۆتان نەدەن.

پیاو هەق بڵێ: جەوزۆ کەڵەمێردێکی بێ خەوش بوو، چەندین جار کەوتبووە تەڵە و تۆڕی سەربازی ئێرانییەوە، بەڵام هەمیشە چالاکانە و نێرانە خۆی لێ ڕزگار دەکردن و نەیدەهێشت بەر زەبران بکەوێ و ئەوی ئەو بە سەربازی عەجەمانی دەکرد با بە دەواری شڕی نەدەکرد.

خەڵک دەیگوت: «جەوزۆ بۆیە وا ئازا و دلێرە و بەر زەبران ناکەوێ؛ چونکە جگی گورگی لە بن جلکانەوە، لەسەر کەڤچکی دڵی خۆی دووریوە»*.

جەوزۆ بۆ ئەو شوێنە چوو کە خانۆ بۆی دەستنیشان کرد، خۆیشی لەو جێگە بڵندە نەهاتە خوارێ، هەر لەو هێسییەوە سەیری شەڕی دلاوەرانی کوردی دەکرد. کاتێ ئیدی دەمە دەمی نیوەڕۆ بوو، خانۆ نواڕی سەربازانی ئەسۆی لاکان و ئەوانی دیکەش هاتن، تێ پەڕن، ئیدی لەسەر زنارەکە هاتە خوارێ و چووە نێو سەربازەکانی خۆی و دەستی بە تەمێ و ئامۆژگارییان

---

* عەشیرەتی بەرۆدار بڕوایان وابوو، هەرکەسێ جگی گورگی پێ بێ بەر زەبران ناکەوێ.

کرد.

هەرکە لەشکری ئێران گەیشتە تانگی خانۆ لەنکاو بەخۆی و دلاوەرانییەوە بەریان لێ گرتن، ئەوان لە لای خۆیانەوە و جەوزۆش لە لای خۆیەوە، ئیدی بە هەردوو لا تێیان کەوتن، ئەنجا سێڤدینیش لەو لارا لێیان دەرپەڕی، سەردارخان کە ئەوەی دیت، هەر بەجارێ واقی وڕما، چونکە قەت هێرشی وا بە زەبروزەنگی نەدیتبوو. سێڤدین خۆی لە نێو ڕیزی وان داوێشت و بەڕاست و چەپاندا لێیان دەدان و لەگەڵ عاردیدا جووتی دەکردن. خانۆ کە چاوی بەم زەبروزەنگە بەدەستوبردە کەوت، لە دڵی خۆیدا گوتی:

– هەزار شوکور، کە وەجاخم ڕوونە و جێگرم هەیە.

ئیدی بوو بە شەڕێکی وا، سەربازی عەجەم شڵەژان و وەپاشەکشە کەوتن.

ئەسپەکانیان ماندوو بوون، نەیاندەتوانی لەبەر سەربازانی خانۆ هەڵێن، ڕزگاربن.

خانۆ ئەو ڕۆژە هێندەی لێ بەفەتارەت دان، شێخ جەلات گوتەنی، «بوو بەڕۆژی مەحشەر».

جەوزۆ بە تۆش و بەژن پیاوێکی هێند بەتەن و مەن و لەندەهوور نەبوو، وەرتەیەکی نە زۆر قەبە و نە زۆریش بێ نموود بوو. بەڵام ئەمڕۆ کە وەکو گۆری خۆی بەسەر بووژی ئەسپەکەیەوە دەنووساند و ڕکێفی دوژمنی دەکرد، دەتگوت: ئەسپەکە سواری بەسەرپشتەوە نییە و کەس نەیدەتوانی زەبری پێ بگەیێنێ. هەسپەکەی بنیشی ئەسپێکی ئەوەندە گڕ و بەخۆوە نەبوو، بەڵام ئەسپی قەڵای دمدم بەدەگمەن دەیتوانی لە مەیدانی دەو و جریدبازیدا لەگەڵی دەربیا.

ئەمڕۆکەش کاتێ جەوزۆ لەشکری ئێرانی لەبەردەمیدا دیت، ڕاست هەسپی خۆی زەنگو کرد و هەسپی تاین دەتگوت لەوە گەیشتووە کە ئیدی وەختی هاتووە وەکو هەڵۆ خۆی هەڵدا، هەرچی لە پێش با بە سمی دەیپەستاوە و هێز نەبوو بتوانێ بیسرەوێنێ، جەوزۆ لە چاو مێرخاسەکانی دیکەی خانۆ جحێڵ

بوو، بەڵام لە زۆر شەڕاندا شان بەشانی خانۆ کەڵەمێردایەتیی نواندبوو. هەر بۆیەش خانۆ بۆ سەرکاری ئەسکەری خۆی دەستنیشانی کردبوو. ئەو لەم شەڕەدا سەلماندی کە بەڕاستی شیاوی ئەو پایەیە و پڕ بەشان و باهویەتی. هێرشی بۆ هەر لایەک دەبرد، سەربازی عەجەم دەتگوت گیا و گوڵە و بەر داسی درەوەنیان کەوتووە. بەڵام خانۆ هەرچەندی لە سەربازی عەجەم قڕ دەکردن هەر وەکو خۆیان بوون و لە کەمییان نەدەدا، بگرە تا دەهات پتر دەبوون. چونکە شا عەباس لەشکرێکی لە سنوور بەدەری کردبووە سەر قەڵای دمدم و پەیتا پەیتاش هەموو ڕۆژێ ژمارەیەکی تازەی دەهاتە پاڵ.

ڕۆژگار ئیدی ڕاشکابوو، هەرکە لەشکری ئێران یەکیان گرت، زۆریان بۆ خانۆ هێنا. خانۆ پشووێکی دیکەش خۆی ڕاگرت، بەڵام پاشان پشتی تێ کردن و هەڵات. ئەوانیش وەدووی کەوتن. خانۆ کات ناکاتێ لە پڕ لێیان هەڵدەگەڕاوە و زۆر بەتوندی دای دەپاچین و دیسان هەڵدەهات. ئیتر بەم ڕەنگە خاپاندنی، تا هێنانییە کن هەمزە چاوەش و سەربازەکانی دیکە. کە تووشی ئەسۆی لاکان بوو، گوتی:

– ئیدی بۆ ئێوە بن.

لەشکری عەجەم دیسان دلاوەرانی کوردیان لێ دەرپەڕین و بە ئەسپی هێساوە هەڵیان کوتانە سەر. سەر ئەسکەری عەجەم سەری سوڕمابوو، وەک لە دڵی خۆیدا بڵێ:

«ئەم کوردانە لە ژێر زەوییەوە هەڵدەقوڵێن».

دنیا تاریک داهات. خولامان هاواریان هێنا: «پۆستۆیان کوشت.».

تەرمەکەیان بە شەعرێکی ڕەش پێچابووەوە، هێنایان لە بەردەمی خانۆیان دانا، خانۆ گوتی:

– ئێمە دەبێ هەموو ژیانی خۆمان وەکو پۆستۆ، کەڵەمێردانە، بەخت کەین، نەهێڵین دوژمن پێ باوێنە خاکی باو و باپیرانمانەوە و ئابڕووی خا و خێزانمان ببەن و خۆشمان لە بن باندووری خۆ بکەن، ئەنجا خانۆ لە تەرمەکە

چووە پێش، گوتی:

– ئەی قارەمان، هەزار ڕەحمەت لە گیانی پاکت، تۆ ئێرەیی و بەخیلیت بەئێمەدا نەیەتەوە، ئێمە ئێرەییمان بە تۆدا دێتەوە، کە کەڵەمێردانە، دەچییە بن گڵی سارد و سڕەوە.

هەرچی لە دەوری تەرمەکەی پۆستۆ کۆڕیان بەستبوو، تێکڕا سوێندیان خوارد تا دڵۆپە خوێنێکیان لە شادەماردا مابێ شەڕ بکەن و ژیانی خۆیان لە پێناوی وڵاتدا بەخت بکەن و قسەکەی خانۆیان دووپات کردەوە:

«ئەی قارەمان هەزار ڕەحمەت لە گیانی پاکت، تۆ ئێرەیی و بەخیلیت بە ئێمەدا نەیەتەوە، ئێمە ئێرەییمان بەتۆدا دێتەوە کە، کەڵەمێردانە دەچییە بن گڵی سارد و سڕ».

بەشەڕی ئەوێ ڕۆژێ سەرئەسکەری ئێرانی بۆی وەدیارکەوت، ئەمانە ئەو کوردەی جاران نین کە ناشییانە و بەملهوڕی خۆیان هێرشیان دێنا. ئێستا سەربازی کورد وەکو سەربازی دەوڵەتێکی بەهێز و ڕێکوپێک هەموو مەشق دراون، فێڵ و دەهۆی شەڕ هەموو فێربوون، بەپێڕۆ و نیزامی ئەسکەری شەڕ دەکەن. سەرئەسکەر لە دڵی خۆیدا، گوتی: «کەواتا پادشای ڕۆم کۆمەکیان دەکات.»

خانۆ لەم شەڕەدا بۆی ئاشکرا و ڕوون بووەوە، کە شا عەباس ئەم جارە لەشکرێکی یەکجار گەورە و گرانی کردووەتەسەر، شەڕی ئەم جارە شەڕێکی زۆر سەخت و چەتوونە و لەوانەیە خەڵکێکی زۆری تێدا بکوژرێ، بەڵام لە سەرکەوتن و دوژمن بەزاندندا چ دوودڵ نەبوو و بڕوای بەخۆی زۆر پتەو و ئەستوور بوو.

جارێکیان سەر لە ئێوارەیەک، لەشکری ئێران ڕەوی کرد، بەجارێ کشاوە، لەشکری خانۆ دوایان کەوتن تاوەکو تاریک داهات، ئینجا هاتنە گوندێ. خانۆ لێکی دایەوە، کە ئەم پاشەکشێیە تەڵەکە و ڕێوبیازییە. ئیدی لەوە پتر نەیهێشت دوویان کەون.

بەڵام پیاو کە لەو گوندەکانی دیکەی دەوروبەری دەنۆڕی بەجارێ ئاگری تێ بەردەبوو: ئەو پیر و کەنەفتە هەشتا – نەوەد ساڵانەی کە خۆیان لە کونی ژوورێ خزاندبوو و پێیان وابوو کەس دەستیان بۆ درێژ ناکات، هەموویان لەتوپەت کردبوون. هەندێکیان دەگرِی تەندوور هاوێشتبوون و قرچ و هۆڕ سووتاندبوونیان و گەلێ سەیر و سەمەرەی ناپیاوانەیان وەسەر هێنابوون. سەربازانی کورد کە بەم نەنەر و دەستدرێژییەیان زانی هێندەی دیکە ئاگریان گرت و زاتیان بزووت و ئەوەی کردیان، کردیان.

کاتێ پەیک خەبەریان بە شا دا، کە هێشتا لەشکریان نەگەیشتووەتە قەڵای دمدم و چەندین سەربازیش قڕکراون، بەجارێ حەپەسا؛ چونکە ئەو وا بەتەمابوو لەشکر قەڵای گرتبێ و هەموو کارێک بڕابێتەوە. شا لەشکرێکی گرانی دیکەی لە قزڵباشان بۆ کۆمەک بەڕێ کرد، بەڵام خانۆ هەرگیز بواری نەدەدانێ و ئەو دۆڵ و نەواڵ و گەلی و بێشانەی لە کەلاکی سەربازی عەجەم پڕ کردبوو. هەندێ جار هەمزە چاوەش بە خانۆی دەگوت:

– ماقوڵ، من لەگەڵ لەشکری ڕۆمدا بووم، زۆرم شەڕ دیون، وەختێ ڕۆم میللەتەکانی دیکەیان بەزۆری شیران لە بن باندووری خۆیان دەکرد، کەس ئەوەندەی سەرباز لێ قڕ نەدەکردن، بهاتبا هەر جارە هێندەیان لێ قڕکردبان، قەستەم بەخوا پادشای ڕۆم هێندە سەر نەدەکەوت.

شەڕ گەیشتبووە ڕادەیەک لە هیچ لایەک سەرباز بەدیل نەدەگیران و بری نەدەدرایە یەک. سەربازی عەجەم کوردە دیلەکانیان بێ بەزە دەکوشت. خانۆش سەربازی وانی دەکوشت، سەری دەپەڕاندن و لەو چیا بڵندانەڕا بەسەر ئەسکەری ئێرانیدا خلۆر دەکردنەوە، ئەسکەر کە چاویان بە سەری پەڕیوی هاواڵەکانیان دەکەوت سامیان ڕێ دەنیشت و لە ترسان هەر ئەوە نەبوو زارەتەرەک نەبن، نارەزاییان دەردەبڕی و وەختوتە و بۆڵە دەکەوتن، دەیانگوت:

– ئێمە نازانین، شاهەنشا لە پێناوی چدا لەسەر ئەم چیا تووش و هەڵدێرانە شەڕ دەکا. ئەگەر سوودێکیشی لێ وەچەنگ کەوێ هەر ئێ، بەڵام

ئەم کەور و زناره چ قازانج و سوودێکی شای تێدایە؟

شا عەباس وێڕای ناردنی قزڵباشان نواڕی لەشکرەکەی تا دێ تێ دەشکێ و زەرەر و زیانی گەورەتری لێ دەکەوێ و هیچی پێ ناکرێ. ئیدی دەستی بەتەڵەکەبازی و فرۆفێڵان کرد. پیاوێکی نارده کن خانۆ کە خۆی بەدەستەوە بدا و شا عەباس هیچ نیازی خراپەی لەگەڵدا نییە و دڵنیابێ لێی خۆش دەبێ و وەکو سەرۆکی هەموو کوردی ئێران بە خانی دەناسێ و هەموو مانگێکیش دە زێڕی مووچە دەداتێ و لە هەموو خێڵ و عەشیرەتەکەشی خۆش دەبێ، بە مەرجێ خۆی بەدەستدای بزانێ و دان بە شاهەنشایەتیی ئەودا بنێ.

لەو ڕۆژانەدا بە فەرمانی خانۆ ئەسکەندەری بە خۆی و ئەسکەرەکەیەوە بەرگری لەو لایە دەکرد کە دوژمن نیازی وابوو پشت لە کوردان بستێنێ و بەرەو قەڵا هێرش ببا. هاوپێوەندی لەشکری ئەسکەندەر و خانۆ تابووری شەباب دەیکرد، هەر سات ناساتێ سوارەی شەباب، یا شەباب بۆ خۆی بێ وچان دەهاتن و دەچوون. ڕۆژێکی تازە ڕۆژ گزنگی دابوو. هێشتا خمامی کەوی بەیانی وەکو مژ بەڕووی ئاسۆوە بوو. سووکە بایەک دەهات گیا و گوڵ و گەڵای دار و درەختی لەسەرەخۆ دەهەژاند. لاوێک لە سەربازانی ئەسکەندەر لە سەنگەردا ڕۆنیشتبوو دەینۆڕییە ئەو سەمتی کە پێی وابوو دوژمن لەوێڕا دەیتوانی ڕیز بشکێنێ، تەماشای کرد وا شتێک لەو بنارەوە، لە نێو لێڕەوارەوە، نێزیک بە کانییەکان بۆ ئەوێ دێ و حیلکە حیلکێتی. لاوە لە دڵی خۆیدا گوتی: «ڕەنگە ورچ بێ»، ڕاپەڕی هاتە کن ئەسکەندەر، گوتی: «شتێک لە نێو ئەو لێڕەوارەوە بەرەو ئێرە دێ». ئەسکەندەر دەسبەجێ زانیی کە ئەوە ورچ نییە، ڕەنگە تەڵەکە و ڕێویبازی عەجەمان بێ. دە سەربازی دووی خۆی دا و بەرەو پیری دەنگەکە چوون. تا گەیشتنە ئەوێ ئیدی دنیا ڕوون بوو و هەتاو لەسەر لووتکەی چیاکان هەڵاتبوو، پیاو هەموو شتێکی بەدی دەکرد.

ئەسکەندەر بە سەربازانی گوت:

– خێرا چواردەوریان بگرن و بەرە بەرە گەمارۆیان دەن، ئەمنیش لێرەوە دێم.

کاتێ لە کەڤیی کانییەکە نێزیک بوونەوە، پیاوێک لە نێو لێڕەکەدا بەدیارکەوت و هات بۆ کنیان، تێیان ڕاخوڕی:

– کوڕە زەلام کێی؟

کابرا بەهەناسەبڕکێ ئارەقەی نێوچاوانی سڕییەوە، گوتی:

– من قاسیدی شا عەباسم. شا بۆ خزمەت خانۆی سەرۆکتانی ناردووم. ڕێگام ون کردووە.

سەربازێک تیری دە کەوانێ هاویشت، تێی سرەوێنێ، ئەسکەندەر نەیهێشت، گوتی:

– مەیکوژن، باڵبەستی کەن بیبەنە خزمەت خانۆی.

هەر ئەو دەقیقەیە شەباب بەسەردا هات، پرسی:

چ خەبەرە؟

ئەسکەندەر تێی گەیاند.

شەباب گوتی:

– چاویشی ببەستنەوە، یاسا وا دەڵێ، خۆم دەیبەم.

چاوی کابرایان بەستەوە، شەباب لەگەڵ خۆی هێنایە حوزووری خانۆ، دەست و چاویان کردەوە. خانۆ لێی پرسی:

– لە کوێوە دێی، کێ ناردووتی و بۆچی هاتووی؟

کابرا هەستا سێ جاران کوڕنووشی برد، گوتی:

– سوپاس بۆ خوای گەورە کە بەسەلامەتی گەیشتمە حوزووری جەنابتان. خانۆ پایەداربێ، من شا عەباس ناردوومییە خزمەتتان، کە پێت ڕابگەیێنم ئیدی شەڕ نەکەی، ئەویش بە سوێندی قورئان بەڵێنت دەداتێ کە لەشکری خۆی بکێشێتەوە و جەنابت بە خانی کوردستانی ئێران بناسێ، دەست نە لە خۆت و نە لە عەشیرەتیشت نادا و هەموو مانگێ دە زێڕیشت مووچە و سەوقات دەداتێ. تۆ هەر هێندە ببە دەستدای شاهەنشای.

کابرا دیسان کورنووشی برد، گوتی:

– شا بۆ ئەو عەرزانەی ناردوومە خزمەتتان و بە هەویای وەڵامدانەوەتانە. ئەسۆی لاکان و هەمزە چاوەش و جەوزۆش لە حوزووردا وەستابوون. خانۆ بەقسەی قاسیدی شا عەباس زۆر تووڕەبوو، گوتی:

– برۆ، بە شا عەباس بڵێ: ئەمن خان نیم، ناشمەوێ ببم بە خان، من نێوم خانۆیە – نێوی کوردانە. من نازناوی خانم ناوێ. ئەمن هەر هێندەم لە شا عەباس دەوێ لێمان گەڕێ و قۆشەنمان لەسەر نەکا و گەڕی لە گەڕمان نەئاڵێنێ. ئەو پارچە عەرزەی باو و باپیرانمان لێ داگیر نەکا. ئەوەشی پێ ڕابگەیەنە کە ئەمن لەوان کوردان نیم بۆ زێڕ و دراو غەیانەتی لە میللەتی خۆم بکەم. بە شا عەباسی بڵێ: ئەگەر قبووڵ ناکا و لێمان ناگەڕێ تا یەکمان ساخ بێ هەر شەڕێ دەکەین. بڵێ: «ئێمە زۆر جاران سوێند و بەڵێنی شامان بیستوون، بەڵام بە چ دەچن؟ لە ئاکامدا لە بێ ویژدانی بەو لاوە چی دیکەمان لێ وەدەست نەکەوتووە. ئێمە ئیدی بڕوا بەسوێند و بەڵێنی وی ناکەین».

پاشان خانۆ بە جەوزۆی گوت: «چاوی ببەستنەوە و بە شەبابی ڕاسپێرن، بلا بیبا، بە ساغ و سەلامەتی بگاتەوە کن شا عەباسی.

لەو ڕۆژانەدا دەشتی ئێران هێشتا هەر گەرم بوو، دەتگوت هاوینە.

لەشکری خانۆ زۆری زەرەر لێ نەکەوتبوو. بەڵام زەرەر و زیانی لەشکری ئێران لە حەد بەدەر بوو.

کاتێکی قاسدی شا عەباس گەڕاوە، وەڵامی خانۆی پێ ڕاگەیاند، شا لە ڕکان لە جێی خۆی ڕاپەڕی دەستی بە هاتوچۆ کرد، گوتی:

– چۆن؟ کەواتا کوردێکی چیایی سەر بۆ من دانانەوێنێ و بەدەستداییم ناقاییلە. ئەدی کێ عەشیرەتی لوڕ و بەختیاریی هێنا ژێر بار و خستنییە سەر ڕێگای ڕاستی؟ سا سوێندم وابێ دەبێ تۆش بێنمە ژێر بار.

شا فەرمانێکی زۆر بەپەلەی کردە سەر سەرکاری سوپا:

«دەبێ هەرچۆنێ بێ زوو قەڵا بگری، هێشتا زستان نەهاتووە، کە زستان

هات، گرتنی زۆر دژوارتر و چەتوونتر دەبی».

سەیفوڵڵا خان هەرکە فەرمانی وەرگرت و خوێندییەوە، وەڵامی شای داوە:

– شا خۆش و پایە بڵندبێ، نامەوێ لێت وەشێرم، خانۆ ئاسەواری لەشکرەکەی بڕیومەوە. بەڕاستی پیاو نازانێ ئەم کوردانە لە کوێوە هەڵدەقوڵێن. ئەمن لەوەی بە شکم کە بەو دەمودەستە بتوانم قەڵا بگرم. چما ئەوە چەند مانگە هێشتوویانە سەرباز پشوو بدەن».

هەرکە کاغەزی سەیفوڵڵا خانیان دایە دەستی شا عەباس و خوێندییەوە، کاغەزەکەی دڕی، گورجێ وەزیرێکی لە دووی سەیفوڵڵا هەنارد:

خێرا بێتە حوزوور.

کاتێ وەزیر گەیشتە کن سەیفوڵڵاخان و فەرمانی شای پێ ڕاگەیاند، لە دڵی خۆیدا گوتی:

«ئەمن لێم ڕوونە بۆچیی دەوێم، هەر ئێستا زیندانم دەکا، بەڵام وەڵڵاهی زیندانم لەو حاڵە پێ خۆشترە».

سەیفوڵلاخان لەشکری بە وەزیر ڕاسپارد و سواربوو بۆ حوزووری شا عەباس بچێ، هەرکە گەیشتە تارانێ، یەکسەر بۆ بەردەرگەی تالاری شای ئاژوا، بەڵام شا عەباس نەیهێشت سەیفوڵڵاخان وەژوورکەوێ و چارەی ببینێ، حوکمی کردبوو هەر کە هات بیگرن، زیندانی کەن. سەیفوڵڵاخان کە گەیشتە بەردەرگە، کێشکچی گورجێ دەستیان لە زنجیر کرد و بردیان هاویشتیانە زیندان. ئەو دەمی سەیفوڵڵاخانیان زنجیر کرد، سەردارخان لە خزمەتی شا عەباسدا دەستەونەزەر ڕاوەستابوو گوێی بۆ قسەکانی ڕایەشتبوو. سەردارخان کابرایەکی چەتەوڵی کەتە بوو، کە لێی ڕادەمای ڕک و خوێنڕێژیی لە چاوان دەباری، کۆسەیەکی چاو زەق بوو، زۆرزان و فێڵباز بوو، هەرکە بۆنی کارێکی گرنگ و بەخێری لە شا عەباس کردبا وەکو گورگ بێنی ئەو کارەی دەکرد تا بەئەنجامی نەگەیاندبا بەرۆکی بەرنەدەدا و لێی نەدەگەڕا. بۆ ئەو کارە، شا عەباس زۆرزانێکی بلیمەتی وەکو ئەوی بەبیردا هات. کابرا لە

کاری زۆر گەورە و گراندا سەرکەوتبوو. هەر بە هۆی زۆرزانی و فڕوفێڵی وییەوە عەشیرەتی لوڕ و بەختیاری تێ شکان و دەبن باندووری شای ئێران کەوتن. بێ ئینسافی و دڵڕەقیی کابرا لەوەدا نەبوو، هەرچی پیاوی گەورە و بەڕێزی ئەو عەشیرەتانە بوون هەمووی لە ناودان و لە ناهەق خوێنێکی زۆری ڕشت. شا عەباس زۆری بڕوا پێ بوو، گوتی:

– سەردارخان، ئەمجا تۆ دەنێرم، بەڵام تۆش وەکو ئەو سەیفوڵلاخانە سەگبابە نەکەی. دەبێ بەهەر نرخێک بێ تا زووە قەڵا بگری و نوغرۆی کەی. ئەو کوردەشم بە ساغی بۆ بێنە.

سەردارخان پاش ئەم قسانە دوو سێ ئیکلامی بۆ شا کێشا. شا لەو بڕوایەدا بوو سەردارخان بێ سێ و دوو ئەو کارە جێبەجێ دەکا و دوودڵیی پێ ناوێ، گوتی:

– سەردارخان، نازانم چ بڵێم، تۆ پیاوی نسحەت و ئامۆژگاری نی، ئەلحەملای ئەتوو ئەو پیاوەی کە عەشیرەتی لوڕ و بەختیاریت بۆ سەرکوت کردم و ئێستا وەکو مەڕیان لێ هاتووە وساڵی چەند هەزار زێڕ خەرج و باجم بۆ دەنێرن. دە بڕۆ، دەی ئۆغرت خێر بێ، کوڕی خۆم.

سەردارخان ئەو قسانەی دواییی شا عەباسی زۆر پێ خۆش بوو. دوو سێ جار کوڕنووشی بۆ برد و ئەنجا پاشەوپاش کشاوە و وەدەرکەوت، ڕۆیی. سەردارخان هەر ئەوێ ڕۆژێ سواربوو، چەند خولامی لەگەڵ خۆی خستن و بەرەو قەڵای دمدم بەڕێ کەوتن. هەرکە گەیشتە جەبهەی شەڕ، نۆڕی لەشکر حاڵی زۆر شڕ و پەرێشانە. سەربازی عەجەم شەڕکەر بوون، بەڵام کوردەکان ترسێکی وایان لە دڵیان ئاویشتبوو، هەرکە ناوی کورد دەهات، وەخت بوو زارەتەرەک بن.

سەردارخان ئێوارەیەکی بانگی سەرکردانی کرد، لێی پرسین:

– ڕاست بڵێن، حاڵتان چۆنە؟ لە چتان کەمە؟ ئازووخە و خواردنتان لە چدایە؟

یەک لە سەرکردان سەردارخانی چاک دەناسی، لەگەڵی چووبوو شەڕی عەشیرەتی لوڕ و بەختیاری، هەستا ئیکلامێکی بۆ سەردارخان کێشا، گوتی:

– سەردارخان خۆش بی – کە ناوی سەردارخانی هێنا سەرکردەکانی دیکە لێکدی ڕامان– لە سایەی سەری شاوە لە چمان کەم نییە، ئەگەر لە ئازووخە و خواردنیش دەفەرموون، هێندەمان مەڕ و ماڵات لە کوردان بەتاڵان وەرگیر کەوتووە لە بن نایە. بەڵام ئەم کوردانە وەکو کوردەکانی عەشیرەتی لوڕ و بەختیاری نین، کە دەیانگوت (کوردین)، ماقووڵ ئەمانە چاپکن، کاتێکی شەڕ دەست پێ دەکا پیاو نازانێ لە کوێڕا هەڵدەقوڵێن، لەنکاو وەکو تەزرەمان تیرباران دەکەن، بە شیران تێمان بەردەبن. کەللەسەری سەربازی کوژراوانمان لەسەر چیاڕا بەسەردا گلۆر دەکەنەوە. بەئیمامی عەلی، ڕۆژی وا هەبوو خوێن لە هەموو شوێنێک جۆگەلەی دەبەست، خۆ سەرکردەکانی دیکە هەموو لە حوزووردان، با ئەوان بڵێن: «ڕاست دەکەم یان درۆ». پیاو نازانێ خۆ لە کوێ دەشێرنەوە.

هەرکە سەرکردەکە نێوی عەشیرەتی لوڕ و بەختیاریی هێنا، سەردارخان پرسی:

– تۆ بە چدا دەزانی لوڕ و بەختیاری کوردن؟

– قوربان، ئەو دەمی جەنابت سەرکردەی لەشکر بووی، ئەمن سەرپەل بووم، بەڵام ئێستا سەرکردەم.

سەردارخان هەستی کرد کە ئەو کوردانە وەکو کوردی لوڕ و بەختیاری نین، ئەوانە شەڕکەرن. هەروەها ئەوەشی لێ ڕوون بووەوە کە سەیفۆڵڵاخان تا ئێستا هەموو هێزەکەی لە مەیدان ناوێشتووە و بۆ شەڕی هێشتووەتەوە، ئەگەر ئەو لەشکرە گەورە و گرانە هەموو بەجارێ هێرشیان بردبا، سەرباز بەو ڕەنگە زەندەقیان نەدەچوو.

لە وەتی سەردارخان هاتبوو لەشکری ئێران هێرشی کز بووبوو.

خانۆ گوتییە جەوزۆ:

– چ باسە، دەنگیان نییە، وێ دەچێ ئەو بێدەنگییە شتێکی تێدابێ. دەبێ زۆر وریابین، لەوانەیە لە پشتەوەڕا گەمارۆمان بدەن، لەشکرەکەیان زۆرە و لە هەژمار نایە.

خانۆ بۆ خۆی چوو هەموو قەڵاچییەکانی یەک یەک بەسەرکردەوە، گورز و کەمەندارانی لە ڕیزی پێشەوە دامەزراند و خۆی بوو بە سەرکردەیان.

کاتێکی تەرمی پۆستۆیان هێنا، لە قەڵا ناشتیان، زادینە خانمی ژنی و هۆزەکەی لەسەر گڵکۆی سوێندیان خوارد بچنە شەڕێ و تۆڵەی بستێنن.

پاش حەوتووی پۆستۆ، زادینە خانم خێرا هەزار پیاوی بە چەک و سیلاحەوە لە هۆزی ماڵە رندان هەڵبژاردن و خۆی بوو بە سەرکردەیان و سوار بوو بەرەو مەیدانی شەڕ بەڕێ کەوت. ڕۆژ تازە گزنگی دابوو کێشکە ویتە ویتیان بوو. ئێشکچییەکی هەمزە چاوەش گوتی: «ماقووڵ، لەشکرێکی گەورە وێرەوە دێ».

خانۆ پرسی:

– بەڕێدا دێن، یان قەدبڕ؟

– بەڕێدا دێن.

هەمزە چاوەش گوتی: «سەربازینە ئامادە بن» هەرکە بەرایی لەشکری زادینە خانم بەدیارکەوت، هەمزە چاوەش لێیان نیزیک بووەوە، نۆڕی هەموو سەر بەکوڵۆسن و لەسەرەخۆ بەکوردی دەدوێن. ئینجا لە دڵی خۆیدا گوتی: «هەبێ و نەبێ ئەمانە کوردی غەیانن و شا عەباس لە دژی ئێمەی کردوونە داردەست و دەیانەوێ گەمارۆمان بدەن». بە سووکێکەوە پرسی:

– ئیوە کێن؟

– ئێمە خەڵکی قەڵای دمدمین، لە هۆزی ماڵە ڕندان، بۆ کۆمەکی خانۆ دەچین.

دەنگێکی ژنانە بەجارێ هەمزە چاوەشی شڵەژاند. زادینە خانم هەمزە

چاوەشی ناسییەوە، گوتی:

– هەمزە چاوەش، چت لێ بشێرمەوە، کاتێکی ئەو ماڵ وێرانەیان* کوشت، سوێندم خوارد لە جیاتی وی بچمە شەڕێ.

ئیدی هەمزە چاوەش زادینە خانمی ناسییەوە، چونکە زۆر جاران لێی دەبووە میوان، گوتی:

– برۆ خوشکێ، نێوی ژنە کوردت هەزار جاران لێ حەلاڵ بێ، برۆ خوات لەگەڵ.

خولامان خەبەریان بە خانۆ دا زادینە خانم بە لەشکرێکی هەزار شەڕکەرەوە هاتووە، دەیەوێ بێتە حوزوور. خانۆ قەدەرێ تێ فکری زادینە خانم کێیە؟ بەینێکی کڕ بوو، ئەنجا گوتی:

– «ئیزنی بدەن، با بێ بزانم لە کیهە هۆزە؟»

سەیفەدینی کوڕی گوتی:

– کاکۆ، ئەی نازانی زادینە خانمی پۆستۆیە، لە هۆزی ماڵە رندان؟

خانۆ هەنگێ وەبیری هاتەوە:

«چەند ساڵ لەمەوپێش، وەختێ شا عەباس عەشیرەتی شکاکی بەگژیاندا کرد زادینە خانم گەنج بوو، مێرخاسییەکی وای نواند مەگەر هەر لە کەڵەمێردان بوەشێتەوە.

لەگەڵ سێ کەنیزان ڕێگا بە سێ پیاوی شکاک دەگرن، دوویان لێ دەکوژن و مێگەلە مەڕێکی تالانکراویشیان لێ دەستێننەوە».

زادینە خانمیان ئیزن دا هاتە حوزووری خانۆ، ئیکلامی کێشا، دەتگوت سەرکردەی ڕاستەقینەیە، ئەنجا گوتی:

– باوۆ تۆ باوی هەمووانی، ڕووم ڕەش بێ، ئەو ماڵوێرانە وەجاخ کوێرە،

* لە نێو کوردان، نە ژن نێوهێنانی مێرد و نە مێرد نێوهێنانی ژن بەجوان دەزانێ. ژنان کە ناوی مێردیان لە کن پیاوی غەیرە دێنن دەڵێن برات، پیاوانیش کە ناوی ژنیان دێنن دەڵێن خوشکت.

کوڕی لە پاش بەجێ نەماوە لە جیاتی بچتە شەڕ.

نیشتمانی خۆی زۆر خۆش دەویست و ژیانی خۆی لە پێناوی خاکی کوردستاندا بەخت کرد. لەسەر گڵکۆی سوێندم خواردووە لە جیاتی وی بچمە شەڕ. هەزار پیاوم لە عەشیرەتی خۆمان کۆکردوونەوە، بەکۆمەکتانەوە هاتووین.

زادینە خانم ژنێکی بەژن بەرزی گردی قژ کاڵ بوو، پۆڕی دوو پەلکی ئەستووری لێ هوندبووەوە و بەسەریەوەی ئاڵاندبوو. دەموچاوی لە بەرهەتاو هەڵقرچابوو. ڕوومەتەکانی وەکو سێو سوور دەچوونەوە. چاوەکانی خڕبوون. نیگای وەکو تیری لە کەوان بەربوو پیاوی دەنگاوت. لێوی ئاڵ و کەمێ تەنک بوو. بۆ نیشانەی کۆستکەوتوویی و خەمباری پوشییەکی ڕەشی بەسەرییەوە بەستبوو. پاش ئەوە لە قسەکانی بووەوە، چەند هەنگاوێک پاشەوپاش کشاوە، خانۆ گوتی:

– کچی خۆم، تۆ کارێکی نیشتمانپەروەرانە و ڕاستت کردووە، بەڕاستی ئێمە لە بارێکی زۆر ناسک و چەتووندایین. بەڵام بڕوامان بەخۆمان زۆر ئەستوورە کە بتوانین وڵاتی خۆمان بپارێزین. شیری دایکت لێ حەڵاڵ بێ، بەخێربێی، بەسەرچاوان.

پاش ئەوەی سەردارخان بۆی ڕوون بووەوە لەبەرچی ناتوانن قەڵا بگرن، ڕۆژێکی سەرکردەکانی هەموو کۆکردنەوە، گوتی: «سبەینێ هێرش دەکەین، دەبێ لەشکر هەموو هێرش بکا، بەڵام بەیانی زوو هێرش ناکەین، لەگەڵ خۆرکەوتنان بەسەریاندا دەدەین؛ چونکە سەربازی ئێمە ناتوانن لەم لێڕەوار و گەلی و هەڵدێرانەدا بەتاریکی شەڕ بکەن. زۆر شوورەییە بۆ سوپای ئێران نەتوانێ ئەو چەند کوردە ببەزێنێ. با هەر کەسە بگەڕێتەوە نێو سەربازی خۆی، تا سبەینێ دەتانبینمەوە.»

سبەینێ زوو، هەتاو کەوتبوو. شنەبایەکی نەرمی خۆش لەسەر چیا بڵندەکانڕا دەهات، دنیای بە بۆن و بەرامەی گوڵ و ڕێحانی ئەو چیا و نزارانە

دەبووژاندەوە و پیاوی بەجاریێ مەست دەكرد. خانۆ گورز و كەمەندچییانی هێنابووە كن خۆی. چوو سڵاوی لێ كردن و قسەی بۆ كردن، لەنكاو لەشكری عەجەم هێرشی هێنا، خانۆ لەگەڵ گورز و كەمەندداراندا لێیان ڕاپەڕین شێرانە قڕیان هاویشتنێ، عەسكەری عەجەم لەبەریان هەڵاتن. سەردارخان قیژاندی: كوڕە، نامەردتان نەكەن خۆڕاگرن، كوڕە هەڵمەیەن.

ئەنجا هەمزە چاوەش لە جەبهەی خۆیەوە تێیان كەوت. زادینە خانم لەو لاوە هەڵی كوتا سەریان و بەدەنگێكی ژنانەی خۆش قریواندی:

«شەڕێک لە مە قەوماوە لە قەڵای دمدمی، لە بەیاران،

«ئەوە خوێنی كوردە ڕژاوە لەسەر كەور و زناران،

«بنۆڕنە جەنازەی عەسكەری عەجەمان، گوێ دێرنە

«ناڵە ناڵی بریندااران،

«وەڵڵا نابێ، بیللا نابێ، حەیفە كوردان،

«ملكەچی قوبووڵ كا بۆ شای عەجەمان،

«برا لێ دەن، خزمە لێ دەن،

«بستێنن تۆڵەی پۆستۆی نێچیروان.

ئیدی شەڕێكی وا قەوما، كورد گوتەنی «منداڵی لەبار ژنان دەبرد». كەلاكی سەربازی عەجەم بەسەریەكدا كەڵەكە بووبوو، بەڵام سەرەڕای ئەو كوشتی و كوشتارە سەربازی عەجەم هەر دە زیادیێدا بوون. سەربازی عەجەم زۆریان كوژران، چونكە وەكو كوردان شارەزای چیا و هەڵدێران نەبوون. بەڵام سەربازی خانۆش كەمیان لێ نەكوژران.

ئێوارەیەكی خانۆ تەماشای كرد لەشكری ئێران خەریكە لە هەموو لاوە گەمارۆیان دەدا. هەركە دنیا تاریک داهات، خانۆ لەشكری خۆی كێشاوە، دایە شاخ و گوژمی بڵند. فەرمانی دا هەرچی ڕێگا و كون و كەلێنێكی بۆ قەڵا دەچێ، بیگرن. ئاگایان لە بزنەڕێ و كۆچەڕێ و ڕەوەندان بێ. خۆشی چوو بۆ قەڵا.

ئیـدی ئێـوارەیەکی درەنگ بوو، خـانۆ بڕیاری دا مـەجلیس کـۆ کـاتەوە، بەسـەرۆک دیوەخـانی گـوت: «لە دووی هەمـوو ئەندامـانی مـەجلیس بنێـرە». سەرۆک دیوەخان دەستبەجێ خولامی لە دوو ناردن.

خـانۆ کەوتـە بیرکردنەوەیەکی قـووڵ. تەمـاشای دەکرد سـەربازی دوژمن لە ئەسـتێـرەی ئاسـمـان زیاترە، چەندیان لێ قـڕ دەکەن لە بن نـایەن و تا دێ لە زیادییێدان، هەرچی سەربازی خۆشیەتی کەمی لێ نەکوژراون. لە دڵی خۆیدا گوتی: «با حـەسارم کەن، نابمە ملکەچ و دەستدایان». خانۆ لەو فکرانەدا بوو، سەرۆک دیوەخان دەرگەی کردەوە، وەژوورکەوت، گوتی:

– ماقووڵ، خەبەرمـان بە هـەمووان دا، تەنێ گەورەی هۆزی ماڵە رندان دیار نیـیـە، ئەویش – خـانۆ قـسـەکـەی پێ بـڕی–، گوتـی: «لە دووی زادینە خـانمی بنێرە، ئێستا ئەو لە جێی مێردی گەورەی هۆزە».

دوو خولام بەلەز لە دووی زادینە خانم چوون.

بە زادینـە خـانمیـان بۆیە دەگـوت: «خـانم» چونکە کـچـە بەگ بـوو. هەر بە کچێنی لەگەڵ پۆستۆی نێچیروانی بوێر و ئازای بەناوبانگدا حەزیان لە یەک کردبوو، بەڵام دایک و باوی کچە ناقـایل بوون بیدەن بە لاتێکی نێچیروان، کە زستانان لە کەوڵ و پۆست بەولاوەی لەبەر نەدەکرد، بەڵام ناوبانگی ئازایەتی و مێرخاسیی پۆستۆ لە هەموو وڵاتان دەنگی دابووەوە. کە دەچوویە ماڵی واقت وڕ دەما؛ دەعبا نەبوو کەڵلەی بەدیوارەوە دانەکوترابێ.

دەیانگێڕاوە:

«پۆستۆ زادینە خـانمی چاوکاڵی بۆ زۆزانان هەڵگرت. دایک و باوی زادینە پێ حەسان.

شـەوکـەت بەگی بابی زادینە خـانم بیست سـواری سـوار کردن و لە دووی پۆستۆی بەڕێ کردن، گوتـی: ئەو توڵە باوەی بکوژن و پۆڕی کیژەکەشم لە بندا بۆ ببڕن و خۆشیم بۆ بێننەوە.

شـــەوکـــەت بەگ خـــەڵکی وڵاتی ڕۆم بوو، هـاوینان بـۆ زۆزان دەهاتە چیـای

دمدم. پۆستۆ لەوێ تووشی زادینە خانم دێ و حەز لەیەک دەکەن و بەڵێن بەیەک دەدەن کە تا مردن بۆ یەک بن و هیچ شتێک نییە لێکیان هەڵاوێرێ. دوو سێ هاوین پۆستۆ وەپارێزی دەکەوێ هەڵی گرێ، هەلی وەچەنگ ناکەوێ، هاوینی چوارەم ئاخرێکەی ڕەدووی دەخا و دەیرفێنێ».

پۆستۆ لە دوورەوە سوارەکانی باوی زادینە خانمی بەدی کرد. زادینەی لە لێرەوارێکدا شاردەوە و خۆشی وەکو پڵینگی دەلان هەڵی کوتایە سەریان. دوو سواری لێ کوشتن، یەکیشیانی بریندار کرد، ئەوانی دیکەش هەموو هەڵاتن.

وەختێ زادینە خانم هات، خانۆ، دەستی بەڕاوێژ کرد، گوتی: «ئێوە هەموو چاک دەزانن کە ئەم لەشکرە وەکو لەشکرەکانی پێشوو نییە، کە بەچەند هەزار سەربازێکەوە هێرشیان بۆ دێنایین و ئێمەش پێشمان لێ دەگرتن و زۆر بەئاسانی لە سنووری وڵاتمان وەدەردەنان. ئێستا کار لە بیست هەزار و چل هەزاریشدا نییە، لەشکرەکە سەت هەزار سەربازە. دەبێ ئەم ئێوارەیە لەگەڵ چارەنووسی خۆماندا ڕووبەڕوو بوەستین و بڕیاری خۆمان بدەین، یاخۆ بەدەست دوژمنەوە بدەین و وڵاتمان داگیر بکەن و ئابڕووی دنیا و قیامەتمان بدۆڕێنین و هەتا هەتایە سەرشۆڕ بژین، یا بەرگری بکەین و خۆمان حەسار کەین و تا یەکمان دەمێنێ شەڕ بکەین و کۆڵ نەدەین».

خانۆ هەرکە لەو قسانە بووەوە وەکو و هەڵۆ لەسەر کورسییەکەی دابەزی، لە مەجلیسەکەی نۆڕی بزانێ چ لە دەموچاویاندا دەخوێنێتەوە.

هەموو سوێندیان خوارد سەریان لە پێناودایە و لە بستێکی خاکی خۆیان خۆش نابن.

ئیدی مەجلیس بڵاوەی لێ کرد. شەوگار ڕاشکاو ڕانەشکا لەشکری دوژمن قەڵایان لە حەساردا.

بەفەرمانی خانۆ خەڵکی هەموو تەدارەکی خۆیان دیت. تۆپیان لە هەموو جێیان دامەزراند و لەسەر شوورەوە قەڵاچی و شەڕکەر خۆیان ئامادە کرد و هەموو سووچ و کەلێنێکیان تەنی. هەرچی ژن و منداڵ و پیر و کەنەفتانی

گوندەکانی دەوروبەری قەلا بوون هەموویان هێنایە نێو قەلاوە. دووکان و خانان پڕ بوون لە خەڵک. خانۆ فەرمانی دا بە خورشیدی بازاڕباشی ئاگای لەو خەڵکە بێ و بەدەنگ هەمووانەوە بچێ.

سەرباز هەموو هاتنە نێو قەلاوە. خەڵکی بەرۆدار چەند ڕۆژان لە حەساردا بوون. نیوەڕۆیەکی نانێ تووشی دلبەر هات، گوتی:

– دلبەر بیستووتە خورشیدی ئاڵچاخ لەو ڕۆژی وا چەتووندا چ دەکا؟

– نەوەڵلا، نەمبیستووە، چ دەکا؟

– دەڵێن، خانۆ ئەو هەموو خەڵکەی بەو ئەسپاردووە.

دلبەر گوتی:

– ملی بشکێ، تووخوا ناوی مەهێنە. ئەگەر پیاو با هەڵبەت دەچووە شەڕێ. عەمری نەمێنێ کەی پیاوە.

پێش ئەو شەڕە، جاران لە هەموو جێیان، لە قاوەخانان، لە بازاڕ لە مەیدانان، لە مالان هەمیشە بەزم و ئاهەنگ بوو، ساز لێ دەدرا، لاوژە و بەیت و بالۆران دەگوترا. زۆر جار ڕدێن سپی و دنیادیدە لە قاوەخانان سەربەهووردی شەڕ و کەڵەمێردی ئازا و دلێرانی کوردانیان دەگێڕاوە. لە هەندێ جێ دەنگی تۆڵووم و زوڕنا دەهات و لاوان شایی و ڕەشبەڵەکیان دەگێڕا و زۆریان خۆش ڕادەبوارد، لە دووکان و خانان ئالووێرچی بانگیان دەکرد:

– وەرن، برا وەرن، مالی چاک و هەرزان بکڕن.

بەهاوینان هەموو ڕۆژێ شایی و ڕابواردن بوو. هەندێ جار کاروانی هەندەران لە بەغدا، لە بەسرە، لە شام، لە حەڵەب، لە ئەستەمبۆڵڕا دەهاتنە قەلا و بەو ڕۆژگارە دەنگی زەنگ و قۆڕی ئێسترو وشتران بوو. دەنگبێژ و سازندە و خۆشخوانانی هەکاری و دیاربەکر و جزیر و بۆتان و شوێنانی دیکە لە قەلا بەر نەدەکەوتن. لۆتی و ڕەقاس و نوکتەبێژ دەکەوتنە بەزم و جەفەنگ و فڕیان داوێتە یەکدی سەر بەقوڕیان وە پێکەنین دێنا، یەک دەیگوت:

تۆ لە بەژنان بەژن چەندە،

وەک ستوون لە عاسمان بەندە،

تۆ لە دەم هەروەکو کاری،

کە دەچڕی چەندە دەمخواری.

ئیدی دەبووە پێکەنین و هەرا و ئەوی بەرانبەری دەیگوت:

نێوم ناوی خولە قۆڵ،

بەژنت بەژنی دەسکەدۆڵ

دەنگت گارەی مریشکە کۆڵ.

دیسان دەبووە هەرا و پێکەنین.

بەڵام قەڵا ئەو قەڵای جاران نەبوو، نە دەنگی سازبەند، نە دەنگی زوڕنا و تۆڵۆم؛ نە دەنگی سترانبێژ و خۆشخوان، نە قاقای پێکەنین و نە بزەی سەر لێوان، نە تاسەی ژوان و بەڵێن، نە تەدارەکی شایی و بووک، نە خەنەبەندان و نە جل هەڵگرتن، نە زبارە و دەسەوای کیژۆڵان، نە کۆڕی کوڕوکاڵان، نە بێنە بێنەی دیوەخانان، هەموو شت ڕەنگی پەڕیبوو، تروسکە لە هەموو چاوان کوژابووەوە، ئاوات و هەویا تاسا بوو. جار جار گوێت لە ورتەی پیرەژنێک دەبوو و هیچی تر.

سەردارخان لە بەرەبەیانرا هەتا بانگی شێوان قۆشەنی بەرەو قەڵا دەهێنا، کەسێک نەبوو پێشیان لێ بگرێ. بەکۆمەکداری خۆی گوت:

– زۆر سەیرە، ئەو کوردانە چییان لێ بەسەرهات، دەڵێی عەرز قووتی داون. بۆ سبەینێ کە ڕۆژ بووەوە و قەڵا بەدیارکەوت، سەردارخان لێی ڕوون بووەوە کە کوردەکان خۆیان لە حەسارداوە. بەڵام کاتێکی لە قەڵا نیزیکتر بووەوە سەری سوڕما؛ تەماشای کرد ئەم قەڵایە وەکو ئەو قەڵایانە نییە کە ئەو دیتبوونی. قەڵای دمدم لەسەر چیایەکی بڵند بینا کرابوو، دەتگوت تەبیعەت بەقەستی سەرتەپڵەی ئەو چیایەی وا تەخت و بەرین دروست کردووە، تا قەڵای لەسەر دروست بکرێ، قەڵای دمدم هەر قەڵایەکی ڕووت نەبوو، شارێکی

گەورە و ئاوەدانیش بوو. لەم سەر تا ئەو سەری مەیدانێکی دوورودرێژ بوو. لە لایەکی پاڵی بە گەلییەکی قووڵەوە دابوو و لە لایەکی دیکەوە پاڵی بە چیای دمدمەوە دابوو.

سەردارخان نۆڕییە ئەو ڕەوەزە و زنار و هەڵدێرە هەزار بەهەزارانە، تەماشای کرد هەندێکیان وا داڵقابوون دەتگوت هەر ئێستا دەجمێن و هەر چییان بەر هەوێڵ کەوێ دەیهەنجنن. هەندێ جێگەی لێڕەوارێکی چڕی وا بوو زەلامی لێ دەرنەدەچوو. لە کورد زیاتر کێ دەیتوانی لەسەر ئەم چیا بێوانە هیمی ئاوەدانی لێ دا و لە نێو گورگ و ورچ و گا کێوی و دڕندان بژی؟

سەردارخان لە دوورڕا ڕێگای قەڵای بەدی نەکرد. بەڵام کە نیزیکتر بووەوە دوو ڕێگای دیت لە گەلییەوە بۆی دەچوون. چۆمێکی قووڵ بەو گەلییەدا دەکشا، گرم و هۆڕێکی لێوە دەهات دەتگوت ورچی هارە.

سەردارخان لەوێڕا گوندەکانی نێزیکی قەڵای بەڕوونی لێوە دیار بوو. زەویوزاری دەوروبەری گوندەکان بەئاشکرا دیار بوون و زەرد دەچوونەوە، وەختی دروێنە بوو. سەردارخان لە دڵی خۆیدا گوتی: «نەمانهێشت گوندەکانی خواری دەغڵ و دانەکانیان بدوورنەوە، نابێ بێڵین ئەمانیش گەوزێ بدوورنەوە». سەردارخان بەدەم ڕێگاوە بیری دەکردەوە، لە پڕ تووشی چەم و نەواڵێکی قووڵ بوو، ماوەیەک بەنێو دار سێو و دار هەرمێ و دار قەیسیدا ڕۆیشت، هەندێکی دیکە چووە پێش، تووشی ڕیزێک دار گوێز هات، لە بەرخۆیەوە گوتی:

– دیارە ئێرە، جگە لە دەغڵ و دان، داری میوەشی لێ دەڕوێ، نێو ئەم چەم و نەوالانە گەرمن.

خولامێک لە نێزیکییەوە بوو، گوتی:

– بەڵێ، قوربان، بن ئەم گەلییە قووڵانە گەرمن، بۆیە داری میوەشیان لێ شین دەبن.

– وا دیارە حاڵ و باڵیشیان خۆشە و دەوڵەمەندن؟

– بەڵێ، گەورەم، چۆن دەوڵەمەند نەبن، نە خەرج و باج دەدەن، نە بێگار و سوخرەکێشی دەکەن، ئەوە چەند ساڵە بۆ خۆیان، وەکو بەرزەکی بانان، ئاسوودە و تەرخان دەژین، دیارە دەوڵەمەند دەبن.

– خەمت نەبێ، بزانە ئێستا ئەمانیشت چۆن وەکو لوڕ و بەختیاری بۆ سەرکوت کەم و دەبن پێی شاهەنشایان نێم.

سەردارخان دوو سێ ڕۆژێک دەرفەتی سەربازانی دا بحەسێنەوە.

پشووێکی چاکیان دا، تێر نووستن؛ چونکە لەمێژبوو نەحەسابوونەوە و هەمیشە هەر شەڕ بوو. ڕۆژی چوارەم سەردارخان لەگەڵ گزنگی ڕۆژدا فەرمانی دا لەشکر لە هەموو لاوە هێرشیان کرد. خانۆ نەیهێشت تۆپان ئاگردەن، تا لە چۆم پەڕینەوە، گوتی:

– ئەوجا، لێ دەن، بەقوربانتان بم.

لە پڕ بوو بە گرم و هۆڕی تۆپان و گولله وەکو تەرزەی بەهار بەسەریاندا باری. بەگرم و هۆڕی ئەو چەند تۆپە دەتگوت دنیا ژێر و ژوور بوو و چیای دمدم ڕووخا، هەر گرم و هۆڕ بوو و لەو چیا و ڕەوەزانە دەنگیان دەداوە. هەرکە دووکەڵی تۆپەکان ڕەوینەوە، سەردارخان تەماشای کرد لاشەی سەرباز بە دەیان لە بن قەڵا بەسەریەکدا نغلیون و کەڵەکە بوون. لاشەی چەندی دیکەیان شەپۆلی ئاوی بەگوڕ و خوڕی ئەو چۆمە، وەکو ئاوماڵکە ڕای دەماڵین. هەرچیش بە ساغی مانەوە بەرەو پاش هەڵاتن. سەردارخان سەری سوڕما، گوتی:

– ئەم سەر چیا بڵندانە و تۆپ؟ کێ ئەم تۆپانەی بە کوردان داوە؟ هەبێ و نەبێ – ئەمە کردەوەی پادشای ڕۆمە. ئەو لەمێژە دەیەوێ کوردستان داگیرکا.

ئەوێ ڕۆژێ دیسان هێرشێکی دیکەیان کرد و بوو بە گرم و هۆڕی تۆپ و فزەی تیران و سەرباز بە سەدان بەسەریەکدا نغڵین و کەڵەکە بوون. بۆ ڕۆژی دوایی سەردارخان هەلانی دا عەسکەر هەڵیان کوتایە سەر قەڵا، دیسان بەسەدان لاشە و کەلاک بە سەریەکدا کەوتن و کەڵەکە بوون. مانگێ پتر بوو

سەردارخان هەر وازی نەدەهێنا. زۆر جاران لە سێ لاوە هێرشیان دەبرد. خانۆ هەر ئەمسەر و ئەوسەری دەکرد و فەرمانی تۆپ ئاگردان و تیر بارانی دەدا. ژنانیش بەش بەحاڵی خۆیان قۆچاخە تیریان بەسەر دوژمندا دەباراند. خانۆ دەیگوت: «ئەگەر دێنە پێشەوە یەکیان بە ساغی دەرناچێ».

سەردارخان لێکی داوە ئەوە چەند ڕۆژە سەربازێکی زۆری لێ دەکوژرێن و ناتوانێ قەڵا بگرێ، ناچار لەشکری کێشاوە پاش و لە چوار دەوری ڕیز ڕیز هێوراندنی و خێوەتیان هەڵدا، گوتی:

– وەڵڵاهی، دەبێ دارتان بەسەر بەردتانەوە نەهێڵم.

سەربازی عەجەم دەستیان بە تاڵان و بڕۆی ئەو گوندانە کرد، کوردەکان پەزێکی زۆریان بۆ لەوەڕ لە گوندان بەجێ هێشتبوو. هەندێ شمەکی بە نرخی ماڵی بەجێ هێشتبوو. هەندێ خەرمان و جێزی هەروا بەنیوە چڵی لە جۆخینان بەجێ هێشتبوو. عەسکەری ئێران بێ سێ و دوو هەرچی پەز و دەوار و نێو ماڵان بوو هەموویان تاڵان کرد. هەرچی دەغڵ و دان بوو کردیان بەئالیکی ئەسپان، ساپ و کا و کۆتەڵ و کۆزەر و پووشیان سووتاند.

خانۆ زۆر جاران شەوانە سەربازی لەگەڵ خۆی دەبردن، دەیگوت: «با بچینە ڕاوێ» هەر جارێکی دەچوون عەسکەرێکی زۆریان قڕ دەکرد. ئیدی لەشکری ئێران بەشەویش لە ترسان نەدەحەسانەوە.

چەند مانگ بوو ئەو خەڵکە زۆر و زەوەندە بە ژن و منداڵ و پیر و جوانەوە حەسار و ئابڵووقە درابوون. ئازووخە و خۆراک نەمابوو، برسێتی و قاتوقڕ بوو. خانۆ تەماشای خەڵکەکەی دەکرد هەموو لە برسان چاویان بە قووڵدا ڕۆچووبوو و لاکەی سەریان دەهات، بەڵام نەبێزارییەک، نەگازنێک، نەگلەیییەک، ورتەی لە زاری کەس نەدەبیست.

چەند شەو بوو خانۆ خەو لە چاوی نەکەوتبوو. بەیانییەک لە کن تۆپچییەکان قەرای قەننەکێشێ هەڵاژا، کە وەخەبەر هات، گوتییە جەوزۆ:

– خێرا، دوو زەلامی چاپک و بوێرم بۆ بێنە بچن بۆ حەکاری و شەمدینان،

یان ئازربایجان داوای کۆمەکمان بۆ لێ بکەن و تا زووە فریامان کەون. جەوزۆ دەسبەجێ گازی دوو کوڕی خورتی چالاکی کرد، یەکیان شەباب بوو، خانۆ نەیدەویست شەباب بنێرێ، چونکە بۆ خۆی دەیزانی قەڵا چەندی پێویستی بە مێرخاسی و ژیریی شەبابە. خانۆ هەر دوو کوڕەی بردنە پەناوە، گوتییە شەباب.

– دەمەوێ، بەقاسیدی بۆ نێو کوردانی حەکاری و شەمدینان یان ئازربایجانتان بنێرم، داوایان لێ بکە بە هاوارمانرا بگەن، بەڵام ئەتۆ – بە شەبابی گوت – لێرە پترمان بەکار دێی، دەتەوێ بچی؟

– نە، قوربان، من نامەوێ مەیدانی شەڕ بەجێ بێڵم.

خانۆ گوتیە جەوزۆ:

– زەلامێکی دیکەم بۆ بێنە.

یەکسەر سەیفەدینی کوڕی خانۆ گوتی:

– کاکۆ، ئیزنم بدە، من دەچم.

– ئەرێ، لاوۆ، تۆ بچۆ، دە بڕۆن خۆتان ئامادە کەن، خۆم دێم شەوێ بەڕێتان دەکەم.

بەتلێکی شەو ڕابردبوو، بەڵام بانگی کەڵەشێر لە قەڵا نەدەهات، چونکە نە کەڵەشێر، نە پەز، نە وڵسات هیچی نەمابوون، خەڵکی قەڵا لەمێژبوو هەموویان سەربڕیبوون و خواردبوونیان.

خانۆ بەبێ بانگی کەڵەشێر لە کاتی خۆیدا وەخەبەر هات. شەوێکی تاریک و نووتەک و ئەنگوستەچاو بوو، خانۆ لە دڵی خۆیدا گوتی: «چ کاتێکی چاکە»، هاتە دیوەخان هەر دوو کوڕەی وەخەبەرهێنان و بەرەو دەرگای مووسڵی بردن. کە نیزیکی دەرگا بوونەوە، ئێشکچی تێی ڕاخوڕین: «زەلام کێی؟» خانۆ بەدەنگە نێرەکەی خۆی وەڵامی دانەوە گوتی:

– منم، خانۆم.

ئینجا هاتە بەردەرگا. داوای کلیلی لە ئێشکچییان کرد. ئێشکچی دەرگای

کـردەوە. خـانۆ هـەر دوو کـوڕەی مـاچ کـردن و ئۆغـر خـێـر و دوعـاخـوازیی لێ کردن و گەڕاوە.

سـەردارخـان بەو لەشکری وا گـەورە و گـرانـە هـەرچەندی دەکرد و دەکۆشـا هیـچی لەگـەڵ خـانۆ پێ نەدەکرا. ئینجـا دەسـتـی بەشـەوخـون و شـەوارە کـرد، شـــەوانـە سـەربـازی دەنـاردە سـەر قـــەڵا، بەڵام بێ سـوود بوو، هـەرچـی دەچوو نەدەگەڕاوە. پاشـان لە داری ئەو دارسـتـان و لێڕەوارانە سـەدان پەیژەی بەرز و مەحکەمی بە دروستکردن دا، کە بە پەیژان وەسەر قەڵا کەون. بەڵام دلاوەرانی کورد لەمێژبوو بەم فێڵەیان دەزانی. شەوانە لە پشت شوورە ئێشکیان دەگرت. هەندێ جـار ژنان ئێشکیـان دەگرت؛ چونکە سـەرباز زۆر ماندوو بـوون، شـەو و ڕۆژ لە شەڕدا بوون.

سـەرکردەی ژنان گـوتیە دلبەر و نانێ، کـە هـەمیـشـە پێکەوە بوون، دەبێ ئەو شـەو ئێشـکی پشت شـوورە ئێوە بیگرن، کـچینە خـۆتان دەبینن لە چ ڕۆژێکی ناسکداین، دەبێ ئابڕوو و نامووسی ژنە کوردان بپارێزن».

کـیـژەکـان هـیـچـیـان مـتـەقـیـان نەکـرد. هەرکـە تاریک داهات دلبـەر و نانێ چەکی خـۆیان هـەڵگرت و چوونە پشت شـوورەی قەڵا. قـەدەرێک بوو بێـدەنگ ئێشـکیـان دەگـرت. هـێـشـتـا مـانـگ بەدیار نـەکـەوتـبـوو. ئاسـمـان سـامـاڵ بوو. ئەستێران جریوە جریویان بوو. دلبەر بە ئاسپایی گوتییە نانێ:

– پێم وایە بەیان نیزیکە.

– هـەڵبـەت نیـزیکە، ئەی نابینی ئـەسـتـێـرە ناکـشـێن و پێـورمـیـزن بەئاسمانەوە نییە.

هـەر دوو کـچـە هـەسـتـیـان کـرد وا زەلامـێک بـە مـاتـە مـات و تەلـە تەل هەڵدەکـشێ، خـۆیان تەلاند تا زەلامـەکە هات، کـەوتە بەینـی هـەردووکیـانەوە، نانێ بەماتە مات لێی نیزیک بووەوە، بەردێکی بەڕێسی ملیدا کێشا، گێژی کرد. ئیدی کابرایان بەدیل برد بۆ دیوەخان، خانۆ کە چاوی وێ کەوت، گوتی:

– حەو، خۆ لە خۆمانە، ئەوە لە کوێتان هێنا.

جەوزۆ گوتی:

– ئەم شەو ئێشکچیی پشت شووره ژن بوون، دوو کیژ گرتوویانە.

خانۆ گوتی:

– ئافەرین، کچە کورد.

دیلەکە گوتی:

– منیش کوردم، له خۆتانم.

– ده ئەگەر ڕاست دەکەی کوردی و له خۆمانی، بڵێ: «چ له نێو عەسکەری عەجەم هەیه و نیازیان چییه؟ به تەمای چین؟»

خانۆ هەرچیی پێویست بوو لەباری لەشکری ئێرانەوه یەکه یەکەی له کابرا پرسی و ئەویش هەمووی وەڵام دایەوه. پاشان گوتی:

– ئەوه مانگێ پتره دوو لاوی ئێوەیان گرتبوو، له کن سەردار خان بوون.

– سەردارخان کێیه؟

– سەرکردەی لەشکری ئێرانه.

– ئەی سەرکرده سەیفوڵڵاخان نەبوو؟

– بەڵێ ئەو بوو، بەڵام پاشان شا عەباس له دووی نارد، گەڕاوه تارانێ سەردارخانی له جیاتی نارد.

– ئەو دوو لاوه ئێستا له کوێن؟

– سەردارخان هەردووکی کوشتن؛ چونکه چەندی لەگەڵ کردن و کۆشان هیچیان له بارەی قەڵاوه نەدرکاند.

– باشە، تۆیەکی کورد، له پای چدا له دژ نەتەوەکەت دەستت داوەته چەک؟ چۆنت دڵ دێ ڕۆڵەی میللەتی خۆت بکوژی؟

دیلەکە سەری داخست، وەڵامی پێ نەدراوه. خانۆ به جەوزۆی گوت:

– ئەو تولەی تولەباوه بەرن، به نێو شاریدا بگێڕن، با خەڵک بیبینن. با بزانن غەیانیان کێن؟ با خۆیان سزای بدەن.

دیلیان برد، بە نێو کووچە و بازاڕی قەڵایاندا گێڕا، جارڕکێش جاڕی ڕادێشت، دەیگوت:

– خەڵکینە وەرن، خانۆ ئەو دیلەی ناردووەتە نێوتان، خۆتان سزای بدەن. کابرا کوردە و غەیانەتیی کردووە و چووە پشتی شا عەباسی گرتووە، چەکی لە دژی میللەتی خۆی هەڵگرتووە، کوردی کوشتووە.

بوو بە هەرا خەڵکەکە تێی ورووکان، پیرەژنێک خۆی گەیاندێ تفێکی لە دوڕچاوی کرد، گوتی:

– پێم ناڵێی خۆت بە چەند بە دژمن فرۆشتووە؟

ئیدی عالەمەکە بە عاردیاندا دا یەکێ بە بەرد، یەکێ بە دار، یەکێ بە لەقە، لەتوپەتیان کرد.

پاش یەک دوو ڕۆژ ژنی خانۆ، بەکوشتنی سەیفەدینی کوڕی زانی، دایە شین و گریان و وەی شێرە، قژ و پۆڕی ڕنیەوە، دەموچاوی کرد بەخڵتانی خوێن، هاتە دیوەخان، دەستی بە لاوانەوە کرد:

– هەی لاوۆ لاوۆ دەک دایکت کوێر بێ، ئاخۆ لاشەکەت لە کوێ کەوتبێ.

خانۆ لێی تووڕەبوو، گوتی:

– شەرم ناکەی. تۆ دەبێ زۆر شاد بی. کێ شەڕەفی وای وەگیر دەکەوێ کوڕی لە پێناوی خاکی باو و باپیراندا خۆی بەخت بکا.

سەردارخان چەند مانگ بوو، دەوری قەڵای دابوو. بەو چەند مانگە ئەویش شارەزای گەلێ ڕێگا و ڕێباز و ڕێچکە و شڤەڕێی نێو ڕەوەز و زنار و گەلی و چۆم و لێڕەواران بووبوو. ڕۆژێکی دەمە دەمی نیوەڕۆ بوو، خەڵکی قەڵا بەدەردی خۆیاندا کەوتبوون، حاڵیان زۆر شڕ بوو، برسێتی بەجارێ تاوی بۆ هێنابوون. لە حاڵێکی وا نالەبار و چەتووندا سەردارخان هێرشێکی کوتوپڕی کردە سەر قەڵا. هێرشی ئەم جارە هێند بەفێڵ و دەهۆ بوو، سەرباز بەجارێ ڕژانە بن شوورەی قەڵاوە. خانۆ تەماشای کرد: وا پەیژەی بڵند بڵند بەکێش دەکەن و خەریکن بەدیواری شوورەدا هەڵدەگەڕێن. قیژاندی: «کوڕینە،

نامەردتان نەکەن لێیان دەن، دوژمن وا خەریکە لە قەڵا سەر دەکەوێ».

عالەمەکە هەر کە گوێیان لە قیژەی خانۆ بوو، نەک هەر تۆپ بە تیر و دەمانچە و دار و بەرد و هەرچی بەردەست کەوت بەژن و پیاو و گەورە و بچووک دوژمنیان داگرت، تیر وەکو تەرزەی بەهار بەسەر دوژمندا باری. سەردارخان لە دوورەوە چاوی لەو شەڕە بوو. ئەو جارەش هێرشەکەی تێ شکا و سەربازێکی زۆری لە بن شوورەی قەڵا بەجێ مان و ناچار لەشکر کشاوە.

پاش ئەم هێرشە مەحموود مەڕەکانی نۆڕی ئیدی نۆرەی ئەوە هاتووە تۆڵەی خۆی بکاتەوە و دەوڵەت و سامانێکی چاکیشی لە شا عەباس وەچەنگ کەوێ.

مەحموود مەڕەکانی لە هۆزی فرشیکان بوو، پیاوێکی هەتیوچە و نەدیوبدی و شۆفار بوو، لەگەڵ دەر و دراوسێدا بەڕێ نەدەچوو و هەمیشە کێشە و هەرای بوو. زۆر جاران خەڵکەکە لە کن گەورەی هۆز گازنیان لێ دەکرد، بەڵام چییان لەگەڵ پێ نەدەکرا. هەرکە دەبووە شەڕیش کەسی دەرۆست نەدەهات هەرچی بەر هەوێڵ کەوتبا دەی پلیشاندەوە. خانۆ زۆری لە بارەی پیاوخراپی و شۆفاریی مەحموود مەڕەکانییەوە بیستبوو، بەڵام دەنگی نەدەکرد، چونکە ئەوەی بە کاری نێو عەشیرەتان دەزانی و خۆی تێوە نەدەگلاند. بەڵام چەقۆ گەیشتە هێسکان، گەورەی عەشیران ناچار لە کن خانۆ گازنیان لێ کرد. بەڵام خانۆ سزای نەدا، چونکە پیاوێکی ئازا و نەبەزیش بوو، زۆر دڵڕەق بوو. چەند جاران خانۆ بۆ جێگەی زۆر دوور و بەترسی ناردبوو، کاری زۆر گرنگی پێ ڕاسپاردبوو، بەدڵ و بەگیان جێبەجێی کردبوو و گورجێ گەڕابووەوە. خانۆ تەنیا زەوی و زارەکەی لێ ساندبووەوە و بەسەر گوندییەکانیدا دابەش کردبوو*.

* ئەو سەردەمە زەوی دابەشکردن بەسەر گوندیدا بەخەیاڵی کێدا دەهات؟ وەرگێڕ

خۆشی هێنابووە نێو شاری قەڵا. بەڵام مەحمورد حەزی نەدەکرد لە گوند وەدەرکەوێ، خانۆ بەزۆری وەدەری نا، کە هاتە شار، کاری نەکرد، هەمیشە لە قاوەخانان خەریکی قومار بوو، هەرچییەکیشی هەبوو هەمووی بەقومار دۆڕاند، زۆر جاران خۆی بەئاشکرا دەیگوت:

– خانۆماڵی منی وێران کرد، عەردی لە دەست کردمەوە، لە گوندی وەدەرنام، منیش خاوەن زەوی بووم، خاوەن ماڵ بووم، ئەمڕۆ وام لێ بەسەرهاتووە.

پاشان چوو بوو بە ئاشەوان، چەند ساڵ بوو، شەو و ڕۆژ هەر لە ئاش بوو. ئەوێ ڕۆژێ مەحموود مەڕەکانی کە بەرەو گەلی چوو بۆ ئاش، کەس دەنگی نەکرد، چونکە هەموو دەیانناسی و کەس شکی لێ نەدەکرد.

کاتێ بەرەو چۆم چوو، سەرباز خەبەریان بەسەردارخان دا کە وا پیاوێک بەرەو چۆم دێ. سەردارخان وای زانی ئەو پیاوە قاسیدی قەڵایە و هاتووە خەبەری خۆوەدەستەوەدانی پێیە. فەرمانی دا کەس دەستی بۆ نەبا. هەرکە هاتە گوێی چۆمەکە، کاغەزێکی بۆ گەورەی عەجەم نووسی:

– «ئەگەر دەتانەوێ قەڵا بگرن، بچن لە سەرووی قەڵاوە، هەندێ گوژمی تووش هەن، لەوێ چەند قووچە بەردێک بەڕیز داندراون، لە بن ئەو بەردانەوە کارێزێک بۆ قەڵا لێ دراوە، ئەگەر ئەو ئاوەتان بڕی، قەڵا لە خۆڕا تەسلیم دەبێ. دەنا بەهیچ جۆرێکی دیکە ناتوانن قەڵا بگرن، مەحموود مەڕەکانی».

کابرا کاغەزەکەی بەسەری تیرێکەوە بەست و بۆ ئەوبەری چۆمی هاویشت. سەرباز کاغەزیان هەڵگرتەوە، بردیان، دایانە سەردارخان. کە خوێندییەوە لە خۆشییان شامەرگ بوو هەر ئەو دەمی سەربازانی لەگەڵ خۆی بردن و چوونە ئەو جێگەی مەحموود مەڕەکانی لە کاغەزەکەدا بۆی نەخشە کێشابوون، تەماشایان کرد چەند قووچە بەردێک لە دووی یەک ڕیز کرابوون، دەستیان بەهەڵکەندن کرد، تاتی سەرکارێزیان هەڵداوە، ڕوانییان ئاوێکی زۆر و ڕەوان، بەخوڕ بەرەو قەڵا دەڕوا. ئاویان بڕی و سەردارخان بەدڵی خۆش گەڕاوە.

سەرلەبەیانی کەمێ ئاو هات بۆ قەڵا، بەڵام کە چاشت داهات، ئاو چۆڕی لێ بڕا. خەڵکەکە لە ترسان هەرچی ئاو لە حەوزاندا بوون بە کونده ڕایانگوێزتە ماڵان و تا ئێوارێ تنۆکی ئاو لە حەوزەکاندا نەما. سەردارخان پێی وابوو لە پاش ئەم ئاوبڕانە، ئێستا خەڵکی قەڵا هەر لە خۆڕا تەسلیم دەبن و هەموو کارێ بەسانایی دەبڕێتەوە، بەڵام پاش ئاوبڕینیش بەحەوت ڕۆژان، قەڵا هەروەکو خۆی وابوو. خانۆ هەموو شەوێ وەکو پڵینگ لە نێزیکەوە لە دوژمنی دەکوشت.

سەردارخان گوتی:

– ئەوە چ سەمەرەیە، ئاویشمان لێ بڕین، کەچی هەر باکیان پێ نییە، دەبێ ژێر زەوییان هەبێ؟

هێورزە کەوتبووە نێو خەڵک، عالەم هەموو دەمیان هیشک بووبوو، تەنانەت تەڕاتییان لە گەرووداا نەمابوو قووتی بدەن. هەموو ساڵێ لەو دەمەدا، لە ئاخر و ئۆخری پایزێ با و باران بوو، بەڵام بۆ بێ یەغباڵی و چارەڕەشی تۆ وەرە تا هەنگێ هێشتا بارانێک نەباریبوو و هەموو ڕۆژێ ساماڵ بوو دەتگوت هاوینە؟

خانۆ کە چاوی بەو حاڵە کەوت فەرمانی دا:

– تا زووە بە کونده و دەفر و ئامان و دەبە ئاو لە چۆمەوە بێنن.

ئێوارە بوو، نیزیکەی سێ سەت زەلام کونده و مەشکە دەفر و ئامان و دەبە و قاپ و عەیاریان هەڵگرت و بە چەکەوە چوون بۆ گەلی. سەردارخان کە بەمەی زانی لێی ڕوون بووەوە کە ئەم جارە کاری قەڵا کراوە و خەڵکەکە لە تینووان پەرێشانن، فەرمانی دا:

– سەرباز هەموو خۆتان مات کەن، وا بکەن کەسیان هەستتان پێ نەکا. هەرکە هاتنە سەر چۆمەکە، هەموویان قەڵاچۆکەن و نەهێڵن یەکیان بە ساغی دەرچێ.

سەرباز لەو بەرەوە سەردارخان چۆنی فەرمان دابوونێ وایان کرد. پیاوەکانی خانۆ یەکیان لێ بەساغ دەرنەچوو، هەریەکە هەشت نۆ تیری

زەهراوی بەلەشەوە بوو. خەڵکەکە لەبەر تینوویتی گوێی نەدەدا مردن، پۆڵ پۆڵ سەرباز دەچوون و نەدەگەڕانەوە بەداخەوە خۆشیان دەمیان نەدەگەیشتە ئاوی چۆمەکە، گورجێ تیرباران دەکران و بەتینوویتی دەمردن.

خانۆ کە دیتی سەرباز هەموو لە تینووان بەجارێ سست بووە و ئیدی شەڕی پێ ناکرێ، دیسان مەجلیسی کۆکردەوە. ئەندامانی مەجلیسی زۆریان دیار نەبوون، مەجلیسەکە زۆری لێ کەل بووبوو، نە ئەسۆی لاکان، نە هەمزە چاوەش، نە ئەسکەندەری پیر، نە شەبابی جوانە مەرگ، نە مەلا ڕەشید، نە شێخ جەلات، نە زادینە خانم ئەمانە شتاقیان نەمابوون. ئەم کۆبوونەوەیە دوامین کۆبوونەوە بوو. خانۆ هەر وەکو جاران لەسەر کورسییە بڵندەکەی ڕۆنیشتبوو تەماشای مەجلیسەکەی دەکرد، گوتی:

– لە هەمووتان زۆر مەمنوونم، هەموو بەڵێنی خۆتان بەجێ گەیاند، زۆر پیاوانە و مێرخاسانە شەڕتان کرد و گۆی شەرەفتان بردەوە. دەبینن – سەیری دەوروبەری خۆی کرد– زۆر کەس خۆی لە پێناوی وڵاتی پیرۆزدا بەخت کرد و ناموس و ئابڕووی کوردانی نەدۆڕاند. ئەمن بڕیارم داوە ئەو جارەش خۆ وەدەستەوە نەدەم. ئەمن دەمەوێ باroot لە بن قەڵا ڕۆکەم و بیتەقێنم. خۆتان دەبینن کەس بێ ئاو دەرنابا و شەڕی پێ ناکرێ. هەرکەسێ دەیەوێ خۆی بەدەستەوە بدا، ئەمشەو بڕوا خۆی تەسلیم بکا. بەڵام من تەسلیم نابم. با نەڵێن خانۆی کورد خۆی تەسلیمی دوژمن کرد، خاکی خۆی دا بە شای ئێران و عەرز و ناموسی خۆی برد.

– چ دەڵێن، ڕاتان لەسەر چییە؟

خانۆ کە لەو قسانە بووەوە وەکو هەڵۆ دیسان لە کورسییەکەی دابەزی و لە مەجلیسەکەی نۆڕی، بەهەویای وەڵام بوو؟

ورتە لە دەم کەسەوە نەهات، دەتگوت هەموو دەڵێن.

– «وەڵڵا ئێمەش تەسلیم نابین و ئامادەین خۆمان لە پێناوی نیشتماندا بەخت کەین».

خانۆ کە بۆی ڕوون بووەوە هەموو بەبڕیاری وی ڕازین، دەستبەجێ گوتی:

کوڕگەل زووکەن،
بارووتی لە چاڵ دەرکەن،
قەڵای دمدم نوغرۆ کەن،
کوردان خۆ تەسلیم ناکەن.
خێرا عاردیان کۆڵاوە،
باررووتیان لە چاڵ هەڵداوە،
قەڵای دمدمیان تەقاند،
بەهەموو کوردستانیان ڕاگەیاند.
هەویای شا عەباس وەدی نەهات
خانۆ لە دین دەرنەهات،
تەسلیم بە شا عەباسیش نەبوو،
بۆ خاس و عامان عەیان بوو.
بڵا کوردان هەموو بزانن،
ئەگەر خۆ بەخۆ غەیان بن،
هەمیشە بێ وڵات دەبن،
سەرشۆڕ و ژێردەستە دەبن.

ئەوجا لە سێ شوێنڕا باررووتیان لە بن هیمی قەڵا ڕۆکرد و تەقاندیان.

ئاگر لە قەڵا بەربوو، چەند ڕۆژ بوو بەخۆ و دانیشتوانییەوە دەسووتا. دووکەڵی ڕەش بەری ئاسمانی گرتبوو. بۆسۆ و بۆکوڕووز ئەو گەلی و نەواڵانەی پڕ کردبوو. پاش چەند ڕۆژێک دووکەڵ ڕەوییەوە، بەڵام سەردارخان هەر نەدەوێرا بچێتە قەڵا، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «کەواتا خانی کورد بەفێڵ ئاگری لە قەڵا بەرداوە، تا بچمە قەڵا و منیش بەدەردی قولی خان بەرێ. سەردارخان زەندەقی لە بوێری و مێرخاسیی خانۆ چووبوو. ڕۆژێکی سەد پیاوی قزڵباشی ناردە قەڵا بزانن چ باسە، قزڵباشان تەماشایان کرد قەڵا

کەسی زیندووی تێدا نەماوە. شاری قەڵا پڕ بوو لە زێڕ و زێو و شمەکی بەنرخ و گرانبایی. قزڵباشەکان دەستیان بەتاڵان کرد، هەرچی بەنرخ بوو کۆیان کردنەوە. چەند سەعات بوو، سەردارخان چاوەنۆڕیان بوو بگەڕێنەوە، هەر نەگەڕانەوە. سەردارخان لە دڵی خۆیدا گوتی: «کەواتا ئەو قزڵباشانە چوون لەگەڵ کوردەکان ڕێک کەوتن، چونکە زۆر جاران کورد و قزڵباش لە دژ شای ئێران یەکیان دەگرت و شەڕیان دەکرد. پاشان هەزار سەربازی نارد، کە چوونە قەڵاوە تەماشایان کرد گیانلەبەرێکی بە ساغی تێدا نەماوە، بەڵام قزڵباش کەوتوونە نێو بازاڕ و کارگە و دووکان و ماڵان هەرچی هەیە و نییە کۆیان کردووەتەوە، خەبەریان بەسەردارخان دا، حاڵ لەمە حیکایەت لەمە. سەردارخان فەرمانی دا:

– خێرا بیانهێنن.

کە هێنایانن، سەردارخان تەماشای تیردانەکانی کردن هەموو هەڵمسابوون، کردنیانەوە، سەردارخان واقی وڕما. هەقی بوو. هەموو جۆرە زێڕێکی تێدا بوو، خشڵی ئێران، ئی ڕۆم، زێڕ و زیوی هیندستان و ئەفغانستان و ئی وڵاتانی دیکەی هەموو تێدا بوون، کابرا سەری خۆی بادا گوتی:

«وەڵڵا باوە وەکو شا و پادشا ژیاوە، چی لەوان کەمتر نەبووە».

سەردارخان چوو بۆ نێو شار، نۆڕی حەوزێکی گەورە چەند ژنێکی بەسەرەوەن چۆکیان داداوەتە سەر مەڕمەڕی حەوزەکە و هەریەکە جامێکی بەدەستەوەیە دەتگوت ئاو هەڵدەهێنجن، بەڵام حەوزەکە مچقی بوو و چۆڕی لێ بڕابوو. کە لێیان نێزیک بووەوە نواڕی ژنەکان هەموو مردوون. کابرا سەرسام بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی:

«بەڕاستی خەڵکێکی نەبەز و کۆڵنەدەرن، ئەم هەموو چەتوونی، فەلاکەتەیان تووش بوو، هێشتا هەر تەسلیم نەبوون».

ئەنجا بەرەو نێو شار چوو، تووشی مەیدانێکی هەراوی بەرین بوو، نۆڕی

دار و درەختێکی خۆشی لێ ڕواوە. سێبەری دوو ڕیزە دار دەکەوتە کووچە و کـۆڵانان، دوو جـۆگـەی پێـدا دەڕۆیشت. بەڵام ئاویان پێـدا نەدەڕۆیشت و وشکاویان هێنابوو. سەردارخان بەرەوخوارتر چوو، تووشی کۆشکێکی دوو نهۆمیی گەورە هات، دوو گومەزی بەسەرەوە بوو. گومەزەکان چەند کلاوڕۆژنە و پەنجەرەی گلۆڤەر خڕیان پێوە بوون. بە پێپلیکاناندا وەسەرکەوت، چووە سەرێ، لە گومەزەکانڕا چواردەوری قەڵای هەموو لێوە دیار بوو. ئەوجا هاتە خوارێ، دەرگـای کردەوە تەماشـای کرد دیوەخـانێکی گەورە و فـراوانە. مافووریێکی گەورەی لێ ڕاخرابوو، گا کێوی و کارمامز و دەعبای دیکەی لەسەر نەخش کرابوو. چەند جۆرە چەکی سەیر سەیر، تەنانەت چەکی بەردی زەمـانی زوو و کـەوانی چەرم و دەمـانچـەی باروتیـشی بەدیوارەوە بوو. بەرەوژوور تەختێکی کەمێ بڵند دانرابوو دۆشەکێکی لەسەر ڕاخرابوو، چەند بالیف و سەرینێکی پەڕۆ نەرمی بۆ بەرپاڵ لەسەر ڕیزکرابوون، سەردارخان گوتی:

– ئەم تولە باوە وەکو شا و سوڵتانان ڕای بواردووە، من خۆم میری لوڕم گرت و کوشتم، شتی وام پێوە نەدی. لە دەرچووندا بوو، ئەفسەرێک گوتی:

– گەورەم، ئەمە ڕێگایەکی پەنامەکییە لەم هەیوانەوە بەرەژێر دەچێ.

بەپێپلیکاناندا چوونە خوار، کەمێ تاریک بوو، ئەوانەی لە پێشەوە بوون، گوتیان: «ژوورەوە ڕووناکە». کە چوونە پێشتر، ئیدی وەکو دەرێ ڕووناک بوو، لە نێـو ئەو بەرد و زنارانەدا، لە ژێرەوە هێندەیان ئەشکەوت و کـیلەر هەڵکۆڵیبوو دەتگوت شارێکی چکۆلەیە. ئەمە هەمووی عەمباری زمێر و زەخیـرەی عەسکەر بوو. هێشـتا ئارد و گەنمێکی زۆری تێدا مابوو. سەردارخان گوتی:

– وەڵڵا، ئەگەر ئاومان لێ نەبڕیبان، هێندەیان ئازووخە هەبوو، دەبوو ئەم ساڵیشمان لێرە بردبا سەر و حاڵمان بەدەست کرێوە و بۆران و سەرما و سۆڵەوە شڕبا.

سەردارخان وەدەرکەوت، چوو، دەستی بەگەڕان کرد، تا گەیشتە قەراخی شار ئیدی شوورەی قەڵا لەوێ دەبڕاوە، نۆڕی دەرگەیەکی ئاسن دیارە. دوو زەلام لە بەر دەرگا مردبوون، بەڵام چاویان نەقوچاندبوو، دەتگوت بەقەستی خۆیان مات داوە. یەکیان قژ کەروێشکییەکی سوورکەڵە بوو و وەکو عەرەبی میسری دەچوو. سەردارخان لەگەڵ سەربازاندا تێ پەڕین، لەسەرەوە لە زناری چیاکاندا ئەشکەوتێکی گەورە هەبوو، سەردارخان ڕێوڕاست چوو بۆ ئەشکەوتەکە. تەماشای کرد ڕەژی و وردە ئاسنی لێ کەوتووە. کەمێ چووە پێشتر نۆڕی جوڕنێکی ئاسن تواندنەوەی لێیە و قاڵبێکی تۆپ داڕشتنی بەتەنیشتەوە داندراوە. هەورازتر هەڵکشا تەماشای کرد دەزگایەکی گەورەی لێیە و گەلێ تفاق و ئامێری بەدەوروبەردا هەڵپەساردراون پیاوێکیش سەری لەسەر دەزگاکە داناوە و مردووە. سەربازێک بەنووکە شیر تێوەی ژەن کابرا بەپشتدا کەوت. سینگی بەدەرەوە بوو، خاچێکی لە ستۆدا بوو. سەردارخان گوتی: «ئەوە فەلەیە».

ئەوێ ڕۆژێ سەردارخان شاری قەڵا زۆر گەڕا، ئیدی ماندوو بووبوو و تینوێتی زۆری بۆ هێنابوو، بەکووچەیەکدا بەرەوخوار بووە، بچتە گەلی ئاو بخواتەوە. هەرکە لە کووچە وەدەرکەوت نۆڕی لە پێش دەرگایماڵێکی – زۆر گەورە نەبوو – کیژێک بە کەزی خۆی بەدار گوێزەکەوە هەڵواسیبوو و خنکابوو. سەردارخان کە لێی ورد بووە چ ببینێ، لە عەمری خۆیدا تریفەی وا جوان و بەدەوی لە هیچ کوێ نەدیتبوو، بەجارێ واقی وڕما و حەپەسا. هەرچی لەگەڵدا بوون ئاخیان بۆ هەڵکێشا، دەتگوت بەقەستی چاوی قوچاندبوو تا برۆی ڕەش و ڕوخساری بەفرینی چاتر بەدیار کەوێ. جووتێ خرخاڵی زێوی ڕووتی لە قاچدا بوون، هەر یەکە پێنج شەش قاش و نقێمی جوانی تێ چەقێندرابوون تۆقێکی زێڕی بەسەر هەنییەوە بوو. قۆتکێکی ڕەشی درێژ بەلاجانگی ڕاستیدا شۆڕ بووبووە، سەری قۆتکەکە کەمێ لە ژێر چەنەیەوە تێپەڕ بووبوو. کڵاوەکەی هەموو لیرەبەند بوو، مێخەکێکی زێڕی بەکەپووەوە بوو، قاشێکی ئاقیقی سووری بەسەرەوە بوو. کەمێک دەمی

کـرابووەوە دەتگوت خــەریکە پێ بکەنێ. جلەکـانـی نوێ و گـرانبــایـی بوون، دەتگوت خــۆی بۆ شــایی و داوەت ڕازانـدووەتەوە، قــومــاشـی بـەری لە خــاس ئەتڵەس و خامەک و قەنەوز بوو و گۆپەک نەخشێنرابوو، کورتەکێکی قەدیفەی هیندستانی لەبەردابوو. دوازدە کەزیی درێژ بەسەر پشتیدا شۆڕ بووبوونەوە و کوژەکەیەک و نوشتـەیەکیان بۆ چاوەزار پێوە کرابوون. تۆڕ و گەردەنەیەکی کارەبای شەهلا و مەرجانی سووری لە ملدا بوو. خاڵێک بە بن غەبغەبیەوە بوو.

سەردارخان کەمێکی دیکەی لێ نێزیک بووەوە، گوتی:

«خــوایە، ڕەزام بەڕەزات، ئەم حــۆرییــەت چۆن لە نێــو ئەم چیــا و چۆڵ و بیبانیانە خوڵقاندووە.»

قەدەرێک بوو سەردارخان و ئێشکچییەکانی لە کچە ڕامابوون، کەمێک دەمی کردبووەوە، دەتگوت وەک بییەوێ شتێک بڵێ.

ســەربازێک ویســتـی ئەنگوســتـیلەیەکی پەنجــەی دەســتـی چەپی دەرێنێ، سەردارخان تێی ڕاخوڕی، گوتی:

«خـوا هەڵناگـرێ، هیـچی لێ مەکـەوە، ئەمـە شـتـێکی پیرۆزە، هـەر دەڵێی زیندووە و بەقەستی چاوی قوچاندووە.

خۆزی ساغ دەبووی، ئەوجا بتزانیبا چۆن دەبوویە گوڵی کۆشک و تەلارم».

ڕۆژ ئیدی ڕاشکابوو، سەردارخان گازی قاسیدی کرد، مژدە بۆ شا عەباس ببا، بۆی نووسی: «شـاهەنشـا، وەکـو مـانگ و ڕۆژ هەمیـشـە تیشکت بەسەر سـەرمـانەوە بێ و تیرێژت بەهەمـوو دنیـادا بڵاو بێتـەوە، ئەمرۆ فـەرمـانم بەجێ هێنای، قەڵای دمدمم بەسەر کورداندا وێران و نوغرۆ کرد. سەردارخان».

***



## پاشەکی

کە ساڵ وەرگەڕاوە، بەهار دیسان هاتەوە قەڵا، بەڵام لە کووچە و کۆڵانان نە قاوەخانە و چێشتخانە مابوون، نە سازبەند و ئاهەنگ و بەزم، نە ئەمسەر و ئەوسەری خورشیدی بازاڕباشی و بڕوبیانوو بەم و بەو گرتن مابوو. دەتگوت کوردان نەک هەر لەم چیایانە، لە هەموو دنیا ئاسەواریان نەماوە و لە ڕەگ و ڕیشە دەرهاتوون، بەڵام ڕاستییەکەی وانە بوو، کورد لەسەر چیای بڵند و گەردن کەشان، لە هەرێم و ناوچە دوورەکانی قەڵا زۆر مابوون. کە بەهار خۆش بوو پەزیان بەرەو دۆڵگان ڕادا و بووەوە بە زاوزێ.

پیر و ڕدێن سپی چیرۆکی خانۆی لەپ زێڕینیان دەگێڕاوە. خۆشخوان و بەیتبێژ بەیتیان هەڵدەبەست. ئەو شەڕە هەروا بەفیڕۆ نەچوو، پاش ماوەیەک دیسان کوردان بۆ ئازادی خۆیان دەستیان بەشەڕ کردەوە و سەرکردەی شەڕی ئەم جارە تالۆریک ناوێ بوو و هەربۆیەش کورد بەو شەڕە دەڵێن «شەڕی تالۆریک».

# فەرهەنگۆک

ئـ

ئاخوند: مەلای شیعە.

ئاران: قشلاخ.

ئارمانج: ئامانج.

ئاز: سەخت.

ئاشپەزخانە: متبەق.

ئامێر: ئەدات.

ئۆغرم: تەنگانە و ناخۆشی.

ئەرخاین: دڵنیا، بێ باک.

ئەستیور: وەجاخ کوێر.

ئێرەیی: بەخیلی.

ئیکلام: تەمەنا.

ب

بارانی کـــڵاو بەســـەر: بارانی دەنک گەورە و قایم.

باڵیۆز: سەفیر.

باندوور: نیلە.

بڕۆ: تالانکاری.

بلووک: بەش.

بەترەف: فرەزۆر.

بەلەنگاز: هەژار.

بەڵەد: دەلیل، شارەزا.

بەوش: ئامێری تەونکاری.

بیانی: بێگانە.

بێ خەوش: بێ عەیب.

بێگار: سوخرە.

پ

پاپاخەکەی: کڵاوەکەی.

پاکاری: نۆکەری، خزمەتکاری.

پرزۆڵە: پارچەی بچکۆڵە.

پسپۆڕ: شارەزا.

پستە: چەرەز.

پشتوو: دەمانچە.

پنچک: پارچە.

پەنی: پەنهان، پەیام، پەنامەکی.

پەیک: قاسید.

پێڕۆ: نیزام.

پێڕۆکە: تازە وەسەر پێ کەوتوو.

پێشخان: نۆکەری خان.

پێکوڵـە: دڕکێکە بنی ئەسـتـوورە و زۆر
سـەری هـەیە.
پێورمیزین: ئەستێرە کشان.

ت

تاتک: پیتک.
تاشت: نانی بەیانی.
تانگ: تەنیشت.
ترووک: زۆر سلۆک، تۆڕ.
تۆمەری: بە سەرجەم، بە قەڵەم.
تەرەوڵ: زیندەوەر.
تەوس: گاڵتە.
تەوەزەل: بێکار.
تەیار: ئامادە.

ج

جگ: میچ.
جۆڕک: کیسە.

چ

چازان: دانا.
چلوو: چلە.
چوارنکال: چوارچمک، چوار دەور.
چووک: بچووک.
چەتوون: سەخت، دژوار.

ح

حەژمەت: تاو.

خ

خاپوور: وێران.
خلندۆر: جۆرە دۆخەوایەکە.
خورجینە: خورج.
خۆزی: خۆزگە، خۆزیا، بریا.
خەرج: ضریبە.

د

داخاوت: قسەی دەکرد.
داغمە: دروشم.
دانێغلا: مات بوو.
دوێر: ژووری دانیشتن.
دووئاژۆ: پاشەنگ.
دەهۆ: فێڵ.
دەبۆتخانە: دەبۆخانە، عەماری چەک،
دەبۆ.
دەرۆزەکەر: سواڵکەر.
دەستوو: دەسک.
دەسمز: ئوجرەت.
دەفر: ئامان، حاجەت.
دەوار: وڵاخ.
دەیاژوا: لێی دەخوڕی.

ڕ

ڕادەمووسم: ماچ دەکەم.
ڕکێف: ئاوزەنگی، زەنگۆ.
ڕەدوو: بەدووکەوتنی ژن.

ڕەژی: خەڵووز.
ڕەوکـــــــەوان: ئـەوەی ڕەوە ئـەسـپ دەلەوەڕێنێ.
ڕیحال: زین.
ڕێ دەنیشت: لێ دەنیشت.

## ز

زبارە: دەسەوا.
زورار: قەدباریک.
زۆرهان: لێزان و زەبربەدەست.
زەردەپەڕ: خۆر لە زەردە.

## ژ

ژاوە: جمە.
ژیلەمۆ: ژێڵەمڕ.

## س

ساپ: کا.
ستێرک: شوقەلەت.
سڤدەر: عەتەبە، ئاستانە.
سمکۆڵ: پێکۆڵی ئەسپ.
سۆنگە: هۆ، سەبارەت.
سوورفل: سوورە.
سەرانگوێلک: زبڵدان، گووفەک.
سەربهوورد: سەرگوزەشتە.
سەڵەف: سەرڕەو،
سێرەک: تەنک، شاش.

## ش

شاڕێ: شەقام.
شـتـاقـیـان: کـەسـیـان، هیـچـیـان، چتاکیان.
شۆم: زەوی شۆکردن – کێڵان.
شوو: شووڕ، شووڵک، شوول.
شەوێن: شەوەکەژ.

## غ

غەوارە: نەناس و نامۆ.

## ف

فراژوو: فراژی، هەڵدان.
فزە: نقە.
فەتارەت: خەسارەت.
فەندباز: فێڵباز.
فیڕۆ: خەسار.

## ق

قاڵیچە: مافووری چووک.
قشلاخ: خانوو و بەرەی زستان.
قلیانی: گۆشتی سوورەوە کراو.
قولله: برج.
قۆشەن: لەشکر.
قەرایی: قەدەر.
قەرەواش: خزمەتچی.

## ک

کادە: جۆرە نانێکە.

کرێت: درزێو، نەنگ.

کونجرک: جۆرە دڕکێکە.

کۆسە میسری: شیرێکی کۆنە و لە میسر دروست دەکرا، ڕەنگە هەر شیری میسریش بێ.

کۆڵۆس: کڵاو.

کەتە: قۆچاغ، بەخۆوە.

کەرمۆز: مێشەکەرانە.

کەژو: کژک، گوریسی شۆرتکی.

کێشکچی: ئێشکچی، پاسەوان.

## گ

گاز: بانگ.

گازن: شکایەت.

گازر: ڕەنگرێژ، خمگەر.

گاڕام: دارێ کە گا و گۆتاڵی پێ لێ دەخوڕن.

گاڕس: جۆرە دانەوێڵەیەکە.

گاشە بەرد: گا بەرد.

گاوگەردوون: حەیوان سەربڕین.

گوژم: بڵندایی.

گۆڤەند: شایی.

گووفەک: زبڵدان.

گەرمژ: گەرمیان، گەرمەسێر.

گەڕناس: ئازا و دلێر.

گەو گەو: گەگە، قەف قەف.

## ل

لاقرتی: قسە و قسەڵۆک.

لاکان: ئامێری بەسەر بەفردا خلیسکان.

لاوۆ: کوڕۆ، ئەی لاو.

لوا: بەرگن.

لۆرکە: خواردنێکە.

لۆزەنگەر: زرتە زەلام.

لە چەمبەر خستن: چواردەور گرتن.

لەز: خێرایی.

لێڕەوار: جەنگەڵستان.

## م

ماهی: شفرە فیل، عاج.

متەق: ورتە.

مەڵاس: مات.

مەمانان: ئێمە مانان.

میچێن: جگێن.

مێمڵ: ملۆزم.

## ن

نژیارکردن: بیرەوەری.

نۆغرۆ: وێران.

نەجاخ: چەکێکە وەکو تەورزێن.

نەزرگە: مەرقەدی پیاوچاکان.

نەواڵ: دۆڵ و دەرە.

نەیار: دوژمن.

و

وربە: قاپووت.

وڵسات: بەرزەولاخ.

وەشێرم: بشارمەوە.

وەدوتان بێنین: بەقسەتان بهێنین.

وەلەرزین: ڕاکشان.

وێستا: ئێستا.

وێی نەدەدان: پێی نەدەدان.

هـ

هامێز: باوەش، هەمبێز.

هاوێر: مەڕ ڕاگرتن بۆ دۆشین.

هۆز: عەشیرەت.

هەراو: بەرین.

هەرەوەز: دەسەوا.

هەڵدێر: چیای تووش.

هەندەران: دەرەوە.

هەنیە: نێوچاوان.

هەویا: هیوا، تەما.

هەوێردە: باڵندەیەکە، ناوی کەڕەواڵەیە.

هێسا: حەساوە.

هێوران: دامەزران، قۆناخ گرتن.

ی

یەغباڵ: تالع.

## سەرەتای نووسەر بۆ چاپی ڕووسی

کورد یەکێکە لە گەلە هەرە کۆنەکانی ڕۆژهەڵاتی نزیک. فەیلەسووفە یۆنانییە کۆنەکان سترابۆن و پەتلیمۆس کە باسی ناوچەی (کەردۆئین) «گەردۆئین»یان کردووە، باسی کوردیان کردووە. گزینەفۆنیش لە «ئەنا بازیس»دا ڕازی گەلی جەنگاوەری کاردۆخەکان دەگێڕێتەوە کە ئەوە بوو سوپای دە هەزار کەسیی یۆنانییەکانیان تا دەریای ڕەش ڕاونا.

لە کتێبی ئیتنەگرافی – مێژوویی «کوردی ئەودیوی قەفقاز»دا[1] وتراوە:

«مێژووی گەلی کورد، لە بنچینەدا مێژووی خەباتی چەندین سەدەیەتی لە دژی چەوسێنەرەوە خۆماڵی و بێگانەکانی، کەچی لەگەڵ هەموو ئەوەشدا، گەلی کورد مەردانە بەتاقیکردنەوەی ئەم هەموو جەنگە ستەمکارییانەدا تێ پەڕیوە و ئازایانە ئەدەب و زمانی خۆی پاراستووە».

چارەنووسی تراجیدیای کوردستان لە دوا دوایی سەدەی شازدەیەم و سەرەتای سەدەی حەڤدەیەمدا لە چارەنووسی وڵاتە بچووکەکانی تری ئەو سەردەمە دەچوو. لەشکری دەوڵەتە دراوسێ بەهێزەکان، بێ پشوو، بەنیازی داگیرکردنی خاکی کوردستان و کۆیلاندنی گەلەکەی هێرشیان دەبردە سەری.

بەڵام بەزاندنی کورد کارێکی ئاسان نەبوو. لەشکری دوژمن لەو شەڕە خوێناوییانەدا زیانێکی زۆریان لێ دەکەوت و زۆر جار نەیان دەویست لەوە زیاتر شەڕبکەن. گەلی کوردی ئازادیخواز و شەڕوان، سوور، بەرگریی لە سەربەخۆیی خۆی دەکرد.

ناوەڕۆکی ئەم ڕۆمانە یەکێکە لە تابلۆکانی ئەم خەباتە. بریتییە لەو بەرگرییە

---

١ تێ. فێ. ئەریستەڤا. کوردی ئەودیوی قەفقاز. مۆسکۆ. بڵاوکراوەی پەرتگەی نائووک، ١٩٦٦.

قارەمانانەیە لە کوردە – قەڵای دمدم کرا. میرێک، بەگێک، ئاغایەک سەرکردەی ئەم خەباتە ناکا. کوردێکی سادەی (خانۆ) ناو پێشەوای ئەم خەباتە بوو بەهۆی بەخشندەیی و دەس و دەهەندەیەوە گەل ناوی (لەپ زێڕین)ی لێ نابوو.

لەم خەباتەدا ئازەربایجانی و ئەرمەنەکانیش بەگەرم یارمەتیی کوردیان دا.

لەبارەی ئەم خەباتە قارەمانانەوە گۆرانی و ڕاز و ئەفسانە و حەکایەتێکی زۆر هەیە، کوردی وا نییە بەم داستانە مێژووییەی گەلەکەی خۆی نەزانێ.

من لەم کتێبەدا هەوڵم داوە تەنیا بەشێکی کەمی خەباتی چەندان سەدە بەردوامی گەلی کورد لە پێناوی خاکی نیشتمانی خۆیدا، لە پێناوی سەربەخۆییدا، لە پێناوی ڕزگاربووندا لە ستەمی بێگانە، ڕوون کەمەوە.

## له بارەی نووسەر و کتێبەکەیەوە

عەرەبی شامۆ پیرترین نووسەرێکی کوردی سۆڤیەتە، دانەری ژمارەیەکی زۆر داستان و چیرۆکە لەبارەی ژیانی کوردەکانەوە.

لەم کتێبە نوێیەیدا، عەرەبی شامۆ یەکێک لە قارەمانانەترین و لە هەمان کاتیشدا تراجیدیاییترین لاپەڕەکانی مێژووی گەلی کورد – دەژیێنێتەوە.

ئەم کتێبە باسی بەرگریکەرە پڕ شکۆکانی قەڵای ئەفسانەیی دمدم، باسی پێشەوای بەوێڵی کوردەکان (خانی لەپ زێڕین) دەگێڕێتەوە.

ئەم کتێبە بەر لە هەرچی بۆیە پەسەندە چونکە ڕووی گەلی کورد، هەستی کورد بەشانازییە نەتەوەییەکانی، داوونەریتی، ئەفسانەکانی، بیروباوەڕی، تێکڕای خاسیەتە خوو پێوە گرتووەکانی بەئاشکرا تیا تۆمار کراوە و بەتینێکی تایبەتییەوە خراونەتە ڕوو لە کاتێکی تراجیدیایی مێژوودا، کاتێ کە لە سەرەتای سەدەی هەڤدەهەمدا لەشکری عەباسی شای ئێرانیان برد بۆ گەمارۆدانی قەڵای دمدم.

سەرەتای چاپی ڕووسیی داستانی دمدم
محەمەدی مەلا کەریم
کردوویە بە کوردی

***

نیگارەکانی ئەم کتێبە لە چاپە ڕووسییەکەی وەرگیراوە

نیگارکێش: ڤێ. ئی. سووریکەڤ